


ئەحمەد منیاوی

# کوشتنی سیاسییەکان به سێکس

چیرۆکی ئەو سەرکردانەی
دوای حەزە سێکسییەکانیان کەوتوون




لە بڵاوکراوەکانی
دەزگای ئایدیا

2024

# کوشتنی سیاسییەکان بە سێکس

## چیرۆکی ئەو سەرکردانەی دوای حەزە سێکسییەکانیان کەوتوون

**دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە**

**خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا**
**لێپرسراوی دەزگا: ئەنوەر حسێن**




 www·ideafoundation·co

 2018idea@gmail·com

 Facebook page: idea·foundation
Facebook account: idea foun

 Instagram: idea__foundation

 Telegram: idea_foundation

 07709556990

سلێمانی - گردی سەرچنار نزیک کۆمەڵگەی بەهاران



زنجیرە (462)

دەزگای ئایدیا بۆ فکرو لێکۆڵینەوە

خاوەنی ئیمتیاز: دەزگای ئایدیا
لێپرسراوی دەزگا: ئەنوەر حسێن




**کوشتنی سیاسییەکان بە سێکس**

نووسەر: ئەحمەد منیاوی
وەرگێڕ: هەڵگورد جەلال
پێداچوونەوە: ئاواز ساڵح
دیزاین: ئومێد محەمەد
تیراژ: 500 دانە
نرخ: 9000 دینار
چاپ: ئایدیا
چاپی یەکەم: 2024

سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە:
الرغبة المدمرة - لعبة القتل السياسي بالجنس. مؤلف : كاتب: احمد المنياوي. دار الكتاب العربي سوريا

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( 2147 )ی ساڵی 2020ی پێدراوە

## پێڕست

## پێشەکی وەرگێڕی کوردی

ئەم کتێبە، کاتێک دەست بەخوێندنەوەی دەکەی، ناتوانیت تا کۆتایی دەستبەرداری بی، ڕاستە هەمووی لە یەک بازنەدایە و پێشتریش چیرۆکی لەو جۆرەمان بیستوە، بەڵام هیچ یەکێک لە چیرۆکەکانی پێشووتر، بەمجۆرە نەچۆتە ناو وردەکاریی پێوەندییە سێکسییەکانی کەسایەتییە دیار و سەرکردە و سەرۆکەکانی جیهانەوە.

ئەم کتێبە ئەگەرچی لە هەندێک جێگەدا تێکەڵاوییەکی تێدایە، بەڵام بە گشتی، سەلیقەی تێدا بە کار هێنراوە بۆ شیکردنەوە و گێڕانەوەی پێوەندییە سۆزداری و سێکسییەکان، گێچەڵ و دەستدرێژییە سێکسییەکان، سیخوڕیکردن لە ڕێگەی پێوەندییە سێکسییەکانەوە، پەیداکردنی سامانێکی زۆرتر و پێگەیەکی بەرزتر لە ڕێگەی بازرگانیکردن و کاری لەشفرۆشییەوە، لە سەر ئاستی سەرۆک و سەرکردە جیهانییەکان.

ئەم کتێبە، ئاماژەیە بۆ بوونی گورگێکی برسی سێکس، لای زۆرینەی پیاوان، هەروەک دەرخەری ئەو ڕاستییەشە کە بەشێکیش لە ژنان جگە لە بازرگانیکردن بە جەستەیانەوە، سێکس بۆ گەیشتن بە حەز و چێژە نەبڕاوەکانیان بە کار دەهێنن.

## پێشەکی نووسەر

سەرکردە و فەرمانڕەوا و دەسەڵاتداران، هاوشێوەی هەر مرۆڤ و کەسێکی ئاسایین، ئەویش وەک مرۆڤێک کۆمەڵێک حەز و ئارەزووی هەیە و پێویستە تێریان بکات، لەم حاڵەتەشدا هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەو کەسەی لە سەرەوەی هەڕەمی دەسەڵات دانیشتوە، لەگەڵ کەسێکی ئاسایی سەر شەقام دا، خوداوەند چۆن ئارەزوو و حەزی تێدا دروستکردوین، بە هەمان شێوەش هۆکارەکانی تێرکردنی ئەو ئارەزووانەشی بۆ دروست و فەراهەم کردووین بە بێ ئەوەی زوڵم و ناهەقی بەرانبەر بە خۆمان و کەسانی تری چوار دەورمان بکەین، ئەو ڕێگەیەش هاوسەرگیرییە، کە دەتوانێت لە هەموو بارودۆخێک دا و لە کیانێکی پارێزراو و دڵنیا و شەرعیدا حەز و ئارەزووە سێکسییەکانی مرۆڤ پڕ بکاتەوە و ڕێگربێت لەوەی مرۆڤ بە هۆی شوێنکەوتنی حەزە سێکسییەکانەوە توشی داڕمان و کەوتن و کێشەی گەورە ببێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەندێک کەس هەن کە پابەندنابن بە تێرکردنی حەز و ئارەزووە سێکسییەکانیان لە چوارچێوەی خێزاندا، بەڵکوو توشی لادانی سێکسی دەبن و لە دەرەوەی خێزان و بە شێوەیەکی ناشەرعی بە دوای تێرکردنی حەز و ئارەزووە سێکسییەکانیان دا وێڵ و سەرگەردان دەبن.

ئەم کتێبە، چیرۆکی بە ناوبانگترین و ناودارترین ئەو فەرمانڕەوا و سەرکردانەی لە خۆ گرتوە، کە بە توندترین شێوە خۆیان کێشاوە بە دیوارێکی هەڵەدا و دابەزیوونەتە قووڵترین ئاستی خیانەتی هاوسەرگیرییەوە، ئەگەر نەڵێین هەموویان، ئەوا دەکرێت بگوترێت زۆرینەشیان بە هۆی شوێنکەوتنی حەزە

سێکسییەکانیانەوە لە ناوچون و ژێراوژێربوون و هیچبیان بۆ نەماوەتەوە جگە لە ئابڕووچوون و سڕینەوەی هەموو ئەو دەستکەوت و مێژووەی لە ڕابـردوو دا خاوەنی بـوون و بە دەستیان هێنابوو، بە ناچاریش دەبێت بەرگەی ئەو شورەیی و ناوزڕاندنەش بگرن، کە بۆ هەمیشە دەبێتە ناسنامە و ناوبانگییان.

هەروەها لە بەشێکی تری ئەم کتێبەدا باس لە چۆنییەتی گۆڕینی داواکارییەکانی جەستە کراوە، کە چۆن بە شێوەیەکی دڕندانە سیاسەتمەدار و سەرکردەکان دەگۆڕێت بۆ دڕندەیەکی پەلامـاردەر و چاوبرسی جەستەی ژنانی لەشفرۆش، کە بە شوێن بە دەستهێنانی زۆرترین ناوبانگ و پارە و سامانەوەن لە لایەن سەرکردە و کەسانی فەرمانڕەواوە یان ئەو کەسە خراپانەی کاریان بازرگانییکردنە بە ژنانی لەشفرۆش و دەیانبەنە ماڵی فەرمانڕەوا و بەرپرسان و بە خراپی سـوود لە دەسـەڵات و سامانەکانیان وەردەگرن.

ئـەم کتێبە، چەند چیرۆکێکی تـری نامۆی لە خۆ گرتوە، دەربارەی ئەو کەسایەتی و سەرکردانەی لە ئێستا و ڕابردوودا بوونیان هەبوە و ئێمە بینیومانن، باس لە چیرۆکی ئەو ژنانەش دەکات کە لە سەر ئاستی جیهان و ناوچەکە و وڵاتی خۆیان ناوبانگ و هەژمـوونی گەورەیان هەبوە، بەڵام پێوەندی سێکسییان لەگەڵ کچان و هاوڕەگەزەکانی خۆیاندا هەبوە و ئەو چیرۆک و پێوەندییە نهێنییانەیان ئاشکرابوە و توشی ئابڕوچوونی گەورەبوونەتەوە.

بەشێکی تری چیرۆکەکانی نێو ئەم کتێبە، تایبەتە بەو کەسانە لە سەرەوەی هەرەمی دەسەڵات دان و وەک گورگێکی برسی مامەڵە و تەماشای ئەو مێینانە دەکـەن، کە لە هەمان شوێندا

کاردەکەن و پێگە و دەسەڵاتەکەیان بە کار دەهێنن بۆ تێرکردنی حەزە سێکسییەکانیان، ئیتر بە بێ گوێدانە ئەوەی ئەو مێینانەی ئەمان چاوی تەماعیان تێبڕیوون لە ژیانی هاوسەرێتی دان، یان کچن یان بابەتی ئەو جۆرە کارانەن یاخود نا.

ئەم کتێبە یارمەتیدەرمان دەبێت بۆ زانین و ئاشنابوونمان بە چۆنیەتی ئاشکراکردنی ئەو چیرۆکە نهێنییانە، ئاشنامان دەکات بە چیرۆکی نهێنی عیشق و خۆشەویستە نهێنییەکان کە دواتر دەگۆڕدرێن بۆ ڕەمزێکی گەورەی گەندەڵیی لە وڵاتەکانیان دا، ئەوەی پێی قەبوول بوو ئەوا قەبووڵی دەکات، ئەوەشی بە نهێنی و بە تاریکی هەر بەردەوام بوو لە سەر کارەکەی ئەوە شتێکی ترە، بەڵام بۆ هەمیشە ئەو کەسانە بە ناوزڕاوی و بێ ئابڕوویی دەمێننەوە و باسیان دەکرێت.

**ئەحمەد منیاوی**

بە شێوەیەکی کتوپڕ و بە بێ هیچ هۆشدارییەکی پێشوەختە، «لیمۆر لیفنت» ئەندامی کنێستی ئیسرائیل و وەزیری پێشووتری پەروەردەی ئەو وڵاتە، لە (1ی دیسەمبەری ساڵی 2007)دا ئاشکرایکرد « تسیبی لیڤنی»، کە ئەو کاتە وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل بوو، بەردەوامە لە پشتیوانیکردنی (ئیهۆد ئۆڵمەرت)، هەروەها چێژێکی گەورەش وەردەگرێت لەو گێچڵە سێکسییەی لە لایەن (کۆندۆلیزا ڕایس)ی هاوڕەگەزییەوە بەرانبەری دەکرێت، کە ئەو کات ئەویش وەزیری دەرەوەی (USA) بوو.

هێشتا « لیمۆر لیفنت « قسەکانی تەواو نەکردبوو، کە زۆرێک لە میدیا و ڕۆژنامەکانی ئیسرائیل و جیهانیش، دۆسیەیەکی بە بۆمب چێنراویان بە ناوی (ناسازییە سێکسییەکانی لیڤنی و ڕایس) ئامادەکرد و دەیانویست بگەنە وردەکاریی ئەوەی چ جۆرە پێوەندییەکی ناسازیی سێکسی لە نێوان «لیڤنی و ڕایس»دا هەیە.

لە وەش نامۆتر لێدوانەکەی « لیمۆر لیفنت» بوو لە بەردەم کنێستی ئیسرائیل و «بنیامین ناتانیاهۆ»ی سەرۆکی پارتی لیکۆد دا، کە گوتی «لیڤنی پێوەندییەکی سێکسی ناسازی هەیە لەگەڵ کۆندۆلیزا ڕایسی وەزیری دەرەوەی USA»دا، بەم قسەیەش هەموو پەرلەمانتارەکانی سەر بە پارتی لیکۆد توشی سەرسوڕمان و شەرمەزارییەکی زۆر بوون، بەڵام کاتێک «لیمۆر لیفنت» هەستی کرد ئەو قسانەی کاریگەری نەرێنی گەورەیان دەبێت، داوای لە میدیاکان کرد لێدوانەکەی بڵاونەکەنەوە، تازە کار لە کار ترازابوو، قسەکەی ببوە مانشێتی سەرەکی و لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامە و میدیا ئیسرائیلی و جیهانییەکان.

لە سەرەتادا، بەمجۆرە دۆسیەی ئابڕوچوونەکەی (تسیبی لیڤنی) ئاشکراکرا و بڵاو بۆوە، ئاشکرابوون و بڵاوکردنەوەی

ئەو دۆسییە هەستیارە، لە کاتێکدا بوو پێوەندییەکانی (ئیسرائیل و فەلەستین) لە دۆخێکی زۆر خراپ دا بوو، بە تایبەتی ڕووداوە خوێناوییەکانی کەرتی غـەززە لە ساڵی (2008)دا، میدیا و ڕۆژنامە عەرەبییەکان بە هۆی سیاسەت و هەڵوێستەکانییەوە ڕقێکی زۆریان لە «تسیبی لیڤنی» بوو، بەو هۆیەشەوە چەندین ناو و ناتۆرەیان بۆ دروستکردبوو، لەوانە (سیخوڕی مۆساد، بکوژ، میراتگری گوڵدا مایەر، جادووگەرە خراپەکە، سەری مار، دایکێکی قێزەون، بەخێوکار و شیردەری شەیتان، خوێنمژ» و چەندین ناو و ناتۆرەی تر، کە بە هۆی هەڵوێستەکانییەوە دژی عەرەب و فەلەستین ئاڕاستەی دەکرا.

سەرەڕای ناسکی ڕوخساری ئەو زمانزانییەی کە «تسیبی لیڤنی» وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل بە کاری دەهێنا بەوەی وەک سیاسی و دیپلۆماتکارێکی مۆدێرن و هاوچەرخ دەربکەوێت، بەڵام هەر زوو مێژووە خوێناییەکەی، ڕوخسارە قێزەونەکەی ئاشکرا کرد، کە لە پشت هەندێک لەو لێدوانانەوە حەشاردرابوو، کە ئیسرائیلییەکان شـارەزایی و توانایەکی باشیان هەیە لە بە کار هێنانی دا بۆ گەیشتن بە مـەرام و ئامانج و خواستە نەسازەکانیان، ئەوەی لە هەمووی قێزەونتربوو ئەو لێدوانەی «لیڤنی» بـوو لـە سـەر بۆردوومـانکردنی سـێ قوتابخانەی سـەرەتایی سەر بە ڕێکخراوی ئۆنۆروا، کە بوە هۆی کوژران و برینداربوونی دەیـان ژن و منداڵ، (لیڤنی) بە دەروونێکی ئارام و خوێن ساردییەوە گوتی «ئەوەی تا ئێستا ڕوی داوە و ڕوو دەدات، لە دڵۆپی ئاوی ناو دەریایەک زیاتر نییە، کە ئیسرائیل دژ بە تیرۆریستانی فەلەستین ئامادەی کردوە و بە کاری دەهێنێت»، مەبەستی (لیڤنی) لەو گروپ و چەکدارانەبوو

که له ناوچه جیا جیاکانی ناو شارەکان خۆیان حەشار دەدا و ژن و منداڵیان گل دەدایە و وەک قەڵغانی مرۆیی و بۆ پاراستنی خۆیان بە کاریان دەهێنان، ئەو لێدوانەی (تسیبی لیڤنی) وەڵامێک بوو بۆ لێدوانێکی (جۆن جینچ) بەڕێوەبەری کار و چالاکییەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هاوکاریکردن و کاری ئاوارە فەلەستینییەکان ناسراو بە ئۆنرۆوا، کە ڕووداوە خوێناوییەکانی غەززەی بە «شێتییەکی بێ وێنە لە مێژوو»دا وەسفکردبوو.

هەندێک لە سەرچاوە و ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانی و هەواڵگرییەکان باس لەوە دەکەن کاتێک سیڤی و وێستگە دیارەکانی ژیانی (تسیبی لیڤنی)، سەرۆکی نوێی پارتی کادیما و کاندیدی بەهێزی پۆستی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل دەخوێنێتەوە، بۆت دەردەکەوێت کە بریکارێکی سەرەکی و سەرکەوتووی مۆساد بوە، دەستی سورە بە خوێنی چەندین کردەوەی کوشتن و تیرۆرکردن و لە ناوبردنی نەیارانی تەلئەبیب.

لەو چوارچێوەیەدا ڕۆژنامەی (سەندەی تایمز)ی بەریتانی ڕاپۆرتێکی لە سەر ژیان و کارەکانی (لیڤنی) بڵاوکردەوە و ئاماژەی بەوە کردوە «لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، تسیبی لیڤنی یەکێک بوو لە بریکارەکانی مۆساد لە پاریس، لەو کاتەش دا مۆساد سەرپەرشتی دۆسیەی تیرۆرکردن و کوشتنی ژمارەیەک لە لێپرسراوانی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستینی لە پایتەختی وڵاتانی ئەورووپا دەکرد».

ڕۆژنامەکە، لە زاری چەند هاوڕێ و هاوکارێکی پێشووی (لیڤنی)ییەوە باسی لەوە کردوە، کە «لیڤنی بەشێک بوو لە پرۆسەیەکی هەواڵگری ئیسرائیل، کاتێک تیمێکی هەواڵگری

ئیسرائیل له (21ی ئۆگەستی ساڵی 1983)دا له ئەسینای پایتەختی یۆنان، به مەبەستی کوشتن و تیرۆرکردن، تەقەیان له (مەئمون بریتش) کرد، که یەکێک بوو له لێپرسراوە باڵاو سەرەکییەکانی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستین».

سەندەی تایمز، لەو ڕاپۆرتەی دا ئاماژەی به وەشکردوە « لیڤنی به شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەشدار نەبوو لەو کردەوەی تیرۆرکردنەدا، کاتێک دوو گەنج به ماتۆڕسکیلێکەوە چوونە بەردەم ئۆتۆمبیلەکەی «مەئمون بریتش» و دەستریژی گوولله‌یان کردەسەر، هەر چەندە تا ئێستاش له لایەن مۆسادەوە ڕۆڵی (لیڤنی) لەو کردەوەیەدا به نهێنی هێڵدراوەتەوە و باس نەکراوە، بەڵام به پێی ڕاپۆرتی ڕۆژنامەکە لەو کاتەدا (تسیبی لیڤنی) یەکێک بوو له ئەندامانی شانه هەواڵگرییەکانی مۆساد له پاریسی پایتەختی فەرەنسا، که ئەرکیان ڕاوەدوونـان و دەستگیرکرن و کوشتن و له ناوبردنی لێپرسراو و سەرکردەکانی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستین بوو له پایتەختی وڵاتانی ئەورووپا.

ڕۆژنامەی (سەندەی تایمز)ی بەریتانی له بەشێکی تری ئەو ڕاپۆرتەدا باسی لەوە کردوە، له دوای ئەو کردەوانەی مۆساد له ئەورووپا، (لیڤنی) دەستی له کارکێشاوەتەوە و گەڕاوەتەوە ئیسرائیل و دەستی کردۆتەوە به خوێندن له کۆلێژی یاسا، بەڵام به پێی چەند زانیارییەکیش دوای ئەوەی (لیڤنی) دەبێتە ئەفسەری سوپای ئیسرائیل، دەستبەرداری پلەکەی دەبێت و دەبێتە بریکار له مۆساد و تا ئەم چەند ساڵەی دواییش هەر بەردەوام بوو له سەر ئەرکەکەی.

ئەوەی له سەر (تسیبی لیڤنی) زانراوە ئەوەیە خوێندکارێکی به وەفای (ئارێل شارۆن)ی دامەزرێنەری پارتی لیکۆدە، به پێی

ڕاپۆرتێکی لیژنەی لێکۆڵینەوەی ئیسرائیل، کۆمەڵکوژییەکەی «سەبراو شاتیلا» خرایە ئەستۆی «شارۆن»، کە بە هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە فەلەستینییە دوورخراوەکان کوژران و بریندار بوون و کەمئەندام بوون.

ڕۆژنامەی سەندەی تایمز، زانیاری زیاتری لە بارەی ژیان و کەسایتی «لیڤنی»یەوە ئاشکرا کردوە و باسی لەوە کردوە، لە خێزانەکەیەوە جۆرێک لە ئارەزووی توندوتیژی و توندڕەوی بۆ ماوەتەوە، باوکی یەکێک بوە لە توندڕەوەکان، لە کاتی ئینتیدابی بەریتانیا لە فەلەستین، هێرشیکردۆتە سەر بنکەیەکی سەربازی و بە هۆیەوە بە (15) ساڵ زیندانیکردن سزادراوە، بەڵام توانی لە زیندان هەڵبێت و دۆسیەکەشی شاردرایەوە.

دایکیشی ناوی (سارە) بوو، سەرکردەی یەکێک لە گروپەکانی (ئەراگۆن)ی توندڕەو بوو کە لە سییەکانی سەدەی ڕابردوودا لە لایەن (مەناحیم بیگن)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی ئیسرائیلەوە سەرۆکایەتی دەکرا، (سارە) لە چاوپێکەوتنێکیدا پێش مردنی لە تەمەنی (85) ساڵی دا، باسی لەوە کردوە کە هەڵیکوتاوەتە سەر شەمەندۆفێرێک و (35) هەزار جونەیهی ئیستەرلینی تێدا دزیوە، گوتوشیەتی جارێکی تر هێرشیکردۆتە سەر شەمەندۆفێرێکی تر کە لە قودسەوە دەچوو بۆ ئیسرائیل و تێکیشکاندوە.

(تسیبی لیڤنی) بۆ یەکەم جار لە ساڵی (1999) دا بە ئەندامی کنێستی ئیسرائیلی هەڵبژێردرا، لەو خولەدا بوە ئەندامی لیژنەی (دەستوور و یاسا و دادوەریی)، لیژنەی (ڕابوونی ژنان)، هاوکات (سەرۆکی لیژنەیەکی لاوەکی و تایبەت بوو بە ئامادەکردنی پرۆژە یاسایەک بە ڕێگرتن لە سپیکردنەوەی پارەدا).

لە ساڵی (2001) دا و لە کابینەی بیست و نۆیەمی حکوومەتی

ئیسرائیل دا کرایە وەزیـری هاریکاری هەرێمی و دواتریش وەزیری کشتوکاڵ، لە کابینەی سێیەمینی حکوومەتی ئیسرائیل دا لە چەند قۆناغێکی جیادا وەزارەتەکانی داد، ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێکردن، دەرەوەی پێ سپێردراوە.

(لیڤنی) تا کۆتاییەکانی ساڵی (2005) ئەندام بوو لە پارتی لیکود، بەڵام دواتر و لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی تری سیاسی دا پێکەوە پارتی (کادیما)یان دامەزراند.

بە ئاشکرا هەست بەوە دەکرا لیڤنی دەیەوێت سەرۆکایەتی (پارتی کادیما) بگرێتە دەست، کە لە لایەن (ئاریێل شارۆن)ەوە دامەزرێنرا، بە تایبەت لە دوای لێکۆڵینەوەکانی دادگا لەگەڵ (ئیهۆد ئۆڵمەرت)ی سەرۆکی ئەو کاتەی پارتی لیکود، لە سەر ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە گەندەڵی و وەرگرتنی گەندەڵییەوە هەبوو، بە پێی ڕاپۆرتێکی (سەندەی تایمز)ی بەریتانی (لیڤنی)، ئـەو دۆخـەی بـە هـەلزانـی و بێ دەنگـی شکاند و داوایـکرد هەڵبژاردنی پێشوەختە ئەنجام بدرێت، بە پێی هەندێک ڕاپرسییش لە ناوخۆی (پارتی کادیما) دا پشتیوانییەکی زۆر لە (لیڤنی) دەکراو لایەنگرێکی باشی بۆخۆی دەستەبەرکرد.

(لیڤنی) بە وەفاترین لایەنگر و پشتیوانی (ئاریێل شارۆن) بوو، کە بە پیاوکوژەکەی سەبراو شاتێلا ناسراوە، کاتێکیش لە ساڵی (2005) دا (شارۆن) بڕیاری دا لە پارتی (لیکود) جیا ببێتەوە، کە لە ساڵی (1999)ەوە سەرۆکایەتی دەکرد، (لیڤنی) دوودڵ نەبوو لەوەی شوێنی بکەوێت و پێکەوە (کادیما)یان دامەزراند، ئەگەرچی جێهێشتنی (لیکود) بۆ ژنێکی وەک (لیڤنی) ئاسان نەبوو، چونکە هەر لە سەرەتاوە بە پرەنسیپ و ئایدیاکانی ئەو پارتە گۆشکراو باوەڕی نەگۆڕی هەبوو بە دروشمەکەی، کە بریتی بوو لە (ئیسرائیلی مەزن).

باوکی لیڤنی، ئەندامی نوێنەران و هاوڕێی (مەناحم بیگن)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری ئیسرائیل بوو، (بیگن) سەرۆکایەتی گروپی (ئەراگۆن)ی دەکرد، کە گروپێکی نهێنی توندڕەوی ئیسرائیلی بوو، کاری ئەو گروپە دژایەتیکردنی بەریتانییەکان و فەلەستینییەکانی دەکرد پێش دامەزراندن و دروستکردنی ئیسرائیل لە ساڵی (1948) دا.

(لیڤنی) دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازیی وڵاتەکەی و بە دەستهێنانی پلەی ئەفسەری لە سوپای ئیسرائیل، کۆلێژی یاسای تەواو کرد و لە نێوان ساڵەکانی (1980 بۆ 1984) لە (بەڕێوەبەرایەتی کاروباری یاسایی مۆساد) کاری دەکرد، لە ساڵی (1999) دا و لە سەر لیستی پارتی لیکۆد، بە ئەندامی کنێستی ئیسرائیل هەڵبژێردراوە، ساڵی (2001)یش بۆ یەکەم جار پۆستی وەزاری لە حکوومەتی ئیسرائیل وەرگرت و بوو بە وەزیری هاریکاری هەرێمیی.

لە ساڵی (2003)دا بوە وەزیری (کۆچبەران) لە حکوومەتی ئیسرائیل و ڕاسپێردرا بە پێشوازیکردن لە کۆچبەرە نوێیەکان، لە ساڵی (2004)دا، سەرەڕای ئەم وەزارەتە و ئەو کارەی هەیبوو، ڕاسپێردرا بە بەڕێوەبردنی وەزارەتی داد، (لیڤنی) پشتیوانییەکی توندی لە پرۆژەکەی (ئارێل شارۆن) بۆ کشانەوە لە غەززە کرد، کە بە شێوەیەکی ڕواڵەتی کۆتایی هاتبوو، دارشتنەوەشی لە لایەن حکوومەتی ئیسرائیلەوە ئاسانکاریی زۆری تێداکرا، ئەوەش بە مەبەستی بە دەستێهانی ڕەزامەندی ئەو وەزیرانەی تری حکوومەتی ئیسرائیل کە سەر بە پارتی (لیکۆد) بوون.

(ئارێل شارۆن) داوای لە (لیڤنی) کرد، کە ئیسرائیل و فەلەستین جیا ببنەوە، بەڵام بەو مەرجانەی کە ئیسرائیل

دیارییان دەکات، بەوەش دەستبەرداری خەونی (ئیسرائیلی گەورە) بوو، بەڵام سوربوو لە سەر پاراستنی (قودس) و ناوچە ئۆردووگانشینەکان لە کەرتی ڕۆژئاوا.

زۆرێک لەوانەی ئاگاداری دۆخی ئیسرائیلن، دەزانن (لیڤنی) هەوڵێکی زۆریدا بۆ بە دەستهێنان و وەرگرتنی پۆستی سەرۆک وەزیران و سەرۆکایەتی حکوومەتی ئیسرائیل، لەو پێناوەشدا و بە پێی هەندێک لەو بەڵگانەی لەبەر دەستن، داهێنانی دەکرد و هونەریی خۆی بە کار دەهێنا لە چۆنیەتی مامەڵەکردنێکی دڕندانە بەرانبەر بە فەلەستینییەکان، چونکە دەیزانی ئەمە سەنگێکی باش دەبێت بۆ سەر کێشانەکەی وەک کاندیدێکی بەهێز بۆ پۆستی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل.

سروشتە مێینەیی و ژنێتییەکەی (لیڤنی)، ڕێگرنەبوون لەوەی دەست بپارێزێت لە کوشتنی فەلەستینییەکان و قسەکردن بە تۆنی پیاوکوژەکان و بە کار هێنانی چەندین هۆکاری تری کوشتنی فەلەستینییەکان و بە ئامانجگرتنی کەسانی سڤیل و شێواندنی جەستەی ژنان و منداڵان و لە ناوبردنی قوتابخانە و مزگەوت، کە بە قێزەونترین تاوانی سەدەی بیستویەک ناوبرا، هەروەها زۆرینەی پێوەرەکانی ڕۆژئاوا و ئەمریکای پێشێلکرد، کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد ئیسرائیل دەوڵەتێکی مەدەنییە و باخچەیەکی دیموکراسییە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دۆسییەی ئابڕووچوونەکەی لیڤنی، ئەوا دەبینین ئەو بابەتە دۆسیەیەکی زۆر گەرم بوو لە (USA)، بایەخدان و گرینگیدانی ڕۆژنامە و میدیاکانی ئەمریکا بە پێوەندییەکانی (لیڤنی و ڕایس) وەک بەنزینکردن بوە بە ئاگرێکی بڵێسەداردا، ئەمەش دوای ئەوەی (لیمۆر لیڤانت) وەزیری

پێشووتری پەروەردەی ئیسرائیل و ئەندامی ئەو خولەی کنێستی ئیسرائیل، لە کۆبوونەوەیەکی باڵای حزبەکەیدا و بە بەشداری نوێنەرانی ئاژانسی نۆڤستی، بۆمبێکی تەقاندەوە و باسی لە (ناسازا)ی (ڕایس) دەکرد بەوەی دەبێت لە نێوان بەردەوام بوونی لە سەر پیادەکردنی ئەو حەزەی و خۆپاڵاوتن بۆ پۆستی سەرۆکی(USA) ( دا یەکێکییان هەڵبژێرێت.

بەشێک لە میدیا و ڕۆژنامەکانی (USA)، ئاماژەیان بەوەکرد، ئەگەرچی (ئۆلمەرت)ی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل داوای لە (تیسبی لیڤنی) وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل کرد دەستلەکاربکێشێتەوە و پۆستەکەی بە جێ بهێڵێت، بەڵام ئەو سووربوو لە سەر مانەوەی و کارکردن لەگەڵ (ئۆلمەرت)دا، ئەوەش لە پێناوی ئەوەی بە هۆی کارەکەیەوە، دەرفەتی بینین و بەرکەوتنی لەگەڵ (کۆندۆلیزا ڕایس)ی هاوتا ئەمریکییەکەیدا زیاتر و بەردەوام بێت.

قسەو لێدوانەکانی (لیمۆر لیڤانت) هاوکات بوو لەگەڵ ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەکانی ئەمریکادا، کە گوتیان« ڕایس نەسازێکی ڕانەگەیەندراو و نهێنییە» هەروەها» شوقەیەکی بۆ هاوڕێ کچەکەی کڕیوە تا لەوێ مومارەسەی پێوەندییە سێکسییەکەیان بکەن و پێشتریش بە هیچ شێوەیەک پێوەندی هاوشێوەی لەگەڵ پیاوان دا نەبوە».

ئەوەی سەیربوو کاتێک «کۆندۆلیزا ڕایس» بە«Tribadism- سێکسی مێینە و مێینە» وەسفکرد، لە ماوەی یەک هەفتەدا زیاتر لە (146) هەزار جار لە گۆگڵدا سێرچکرا لە سەر ناو و زانیاری و وێنەی (لیڤنی) وەزیری دەرەوەی ئیسرائیل، کە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو.

ئەوەی زیاتر وای لە میدیا و ڕۆژنامەکانی ئەمریکا کرد، کە بایەخی زیاتر بە «نەساز»ی و ژیانە سێکسییە پڕە لە نهێنییەکەی (کۆندۆلیزا ڕایس) بدەن، وتارێکی ڕۆژنامەی (ناسیۆناڵ ئۆنکیرەر) بوو کە نووسەرەکەی باسی لەوە کردبوو، کە (ڕایس) مومارەسەی سێکسی لەگەڵ مێینەدا دەکرد، ئەو کاتەی لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا لە زانکۆی ستانفۆرد کاری دەکرد.

لە لایەکی تریشەوە (جیلین کیسلەر) کە یەکێک بوو لە گەورە نووسەرەکانی ڕۆژنامەی (واشنتۆن پۆست) ئەوەی ئاشکرا کرد، کە «ڕایس هاوبەشێکی ژیانی هەبوو پێکەوە لە یەک خانوودا لە کالیفۆرنیا دەژیان، ئەویش (ڕەندی بین) بوو کە ژنە وێنەگرێکی دۆکیۆمێنتاری بوو».

(کیسلەر) لە کتێبەکەشیدا بە ناونیشانی (کۆندۆلیزا ڕایس ژنی نهێنییەکان و داهێنانە بۆ ماوەییەکانی بوش)، باسی لەوە کردبوو کە ڕایس بەهێزترین ژنە لە سەر ئاستی جیهان، ئەوەش بە هۆی ئەو پۆستە باڵاو هەستیارەوەبوو، کە لە (USA) پێی درابوو بەڕێوەی ببات، نووسەری کتێبەکە جەختیشی کردەوە کە (ڕایس) بۆ ئەوەی ڕای گشتی بگۆڕێت و چاوی میدیاکان لە سەر بابەتی (نەسازی سێکسی)ییەکەی لابەرێت، لێرەو لەوێ باسی لەوە دەکرد زۆر سەرقاڵی کارەکەیەتی و لە پێناوی ژیانە گشتییەکەی و ئەرکەکەیدا، قوربانییەکی بێ سنووری بە ژیانی تایبەتی خۆی داوە، دەشڵێت «ڕایس تا ئێستا سینگڵە و هەرچەندە تەمەنی (54) ساڵە، بەڵام هیچ مومارەسەیەکی سێکسی لەگەڵ هیچ پیاوێکدا نەبوە، بەڵام لەگەڵ ژنێکی تردا بە ناوی (ڕەندی) لە کالیفۆرنیا بۆ چەند ساڵێک پێکەوە لە یەک خانوودا دەژیان،

به بێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ لە سەر ڕادەی نزیکی و پێوەندییەکەیان زانرابێت، جگە لەوەی بە هەردووکیان یەک ئەژماری بانکییان هەبوو».

ئەگەرچی هەر لە سەرەتاوە (ڕایس) ڕەتی کردەوە هیچ لێدوانێک بدات لە سەر زانیارییەکانی نێو ئەو کتێبە، بەڵام (ڕەندی) بە میدیاکانی ڕاگەیاند، پێکەوە لە یەک خانوودا دەژیان، لەبەر ئەوەی پێویستی بە کۆمەڵێک چارەسەر و دەرمانی گرانبەها هەبوو، بە ناچاری نیوەی خانوەکەی دابوە (ڕایس) لە بەرانبەر بڕێک پارەدا.

سەبارەت بە هۆکاری هاوسەرگیری نەکردنیشی، (ڕایس) ڕایگەیاندوە «تا ئێستا ئەو پیاوەی نەدۆزیوەتەوە کە حەز دەکات هاوسەرگیری لەگەڵ دا بکات»، لە میانەی چاوپێکەوتنێکیشی لەگەڵ کەناڵی (سی بی ئێس)ی ئەمریکی، (ڕایس) ئەوەی درکاندبوو کە خەڵکێکی زۆر پرسیاری ئەوەی لێ دەکەن بە هۆی زۆریی و هەستیاری کارەکەیەوە تا ئێستا هاوسەرگیری نەکردوە یان پیاوێکی گونجاوی نەدۆزیوەتەوە؟ وەڵامەکەی ئەویش ئەوەبوو «لە ڕاستیدا من بیرۆکەی هاوسەرگیرییم ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکوو من دەمەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکدا بکەم کە خاوەنی کەسایەتییەکی جیاواز و نایاب بێت، بە سادەیی دەیڵێم تا ئێستا ئەو کەسەم نەدۆزیوەتەوە، کە حەزدەکەم هاوسەرگیری لەگەڵ بکەم».

ئەم لێدوان و قسانەی (کۆندۆلیزا ڕایس) لە دوا ڕۆژەکانی بەڕێوەبردنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، چەند ڕۆژێکی زۆر کەم پێش ئەو وادەیە بوو، کە دەبوایە ئۆفیسەکەی و کارەکەی ڕادەستی (هیلاری کلینتۆن) بکات، کە لە سەردەمی

(باراک ئۆباما)ی سەرۆکی (USA) دا وەک وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەستنیشان کرابوو، یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا، ئەو لێدوانانەی (ڕایس)یان بە جۆرێک لە مارکیتین وەسفدەکرد، لە کاتێکدا ئامادەکاریی دەکرد بۆ ئەوەی پۆستەکەی ڕادەستی (هیلاری) بکات.

(کۆندۆلیزا) ساڵی (1954) لە بێرمینگهام لە ویلایەتی ئەلباما لە دایک و باوکێکی پێسترەشی مەسیحی ڕۆشنبیر لە دایک بوە، ناوەکەشی مانایەکی موزیکی هەیە و گوزارشتە لە ژەنینێکی جوان و ئەدایەکی زۆر باش.

(جۆن ڕایس)ی باوکی وەک ڕاوێژکار و ڕێنماییکار لە خوێندنگەیەکی ناوەندی تایبەت بە پێسترەشەکان کاری دەکرد تا گەیشتە پۆستی (بریکاری زانکۆی دینیڤەر)، (ئەنجلینا)ی دایکیشی بە هەمان شێوەی باوکی مامۆستا بوو.

خانەوادەی (ڕایس) یەکێک بوو لە دەستەبژێرە پێسترەشەکان، کە بایەخێکی زۆریان بە فێرکردن دەدا، وەک هۆکار و میکانیزمێکی باش بۆ بزووتنەوە و جووڵە کۆمەڵایەتییەکان.

دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، ساڵی (1974) (کۆندۆلیزا ڕایس) توانی بە پلەی نایاب لە زانکۆی دینیڤەر بڕوانامەی زانستی سیاسی بە دەست بهێنێت، ساڵی (1975) لە زانکۆی نۆتردام بڕوانامەی ماجستێری بە دەستهێنا، ساڵی (1981)یش لە کۆلێژی لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکان لە زانکۆی دینڤەر بڕوانامەی دکتورای بە دەستهێنا.

لە ساڵی (1981)ەوە وەک مامۆستای زانستە سیاسییەکان لە کۆلێژی ستانفۆرد وانەی گوتۆتەوە، ساڵی (1984)

بەرزترین مەدالیای ڕێزلێنانی لە بواری وانەگوتنەوەی گشتییدا بە دەستهێناوە، لەو ماوەیەدا کە لە زانکۆی ستانفۆرد مامۆستا بوو، هاوکات ئەندامیش بوە لە سەنتەری ئاسایشی نێودەوڵەتی و چاودێریکردنی چەک، لە پەیمانگەی لێکۆڵینەوە نێودەوڵەتییەکانیش زۆر لە بۆشەوە نزیک بوو، وەک هاوڕێی شەرەفیش لە پەیمانگای هۆفەر وەرگیرا.

چەند کتێبێکی لە بواری سیاسەتدا نووسی و بڵاویکردەوە، لە گرینگترینیان (ئەڵمانیای یەکگرتوو و ئەورووپای گۆڕاو) کە لە ساڵی (1995) دا بە هاوبەشی لەگەڵ (فیلیپ زیلیکۆ) دا بڵاویان کردەوە، لە ساڵی (1986)یشدا بە هاوبەشی لەگەڵ (ئەلێکساندەر دالین) دا کتێبی (سەردەمی گۆرباتچۆف) یان نووسی و بڵاویان کردەوە، لە ساڵی (1984)یشدا کتێبی (وەفادارییەکی ناڕوون، یەکێتیی سۆڤیەت و سوپای چیکۆسلۆڤاکیا)ی نووسی و بە تیراژێکی زۆر بڵاوی کردەوە، هەروەها چەندین وتاریشی دەربارەی سیاسەتی دەرەوە و سیاسەتی بەرگری یەکێتیی سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەلاتی بڵاو کردۆتەوە.

لە ساڵی (-1985 1986)ەوە بۆتە ئەندام لە پەیمانگای هۆفەر، لە ساڵی (1987) دا بەشداربوو لە زەمالەیەکی ئەنجوومەنی پێوەندییەکانی دەرەوەدا، کە مافی ئەوەی پێ دەدا لەگەڵ سەرۆک ئەرکانی هاوبەش و لە بواری پلاندانانی ستراتیژی ئەتۆمی دا کاربکات.

لە نێوان ساڵانی (1985 بۆ 1991) دا، کە قۆناغی یەکگرتنەوەی هەردوو ئەڵمانیا و دوا ڕۆژەکانی یەکێتیی سۆڤیەت بوو، (ڕایس) وەک بەڕێوەبەر لە ئیدارەی (جۆرج بوشی باوک)

کاری دەکرد، دواتریش بوە (گەورە بەڕێوەبەری کاروباری ڕوسیا و ئەورووپای ڕۆژهەلات لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی USA)، دوای ئەوەش کرایە (یاریدەدەری تایبەتی سەرۆکی ئەمریکا بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا).

لە سالی (2000) دا و لە کاتی سەرۆکایەتی (جۆرج بوشی کوڕ) دا، کرایە (ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆکی ئەمریکا)، لە خولی دوەمی سەرۆکایەتی (جۆرج بوشی کوڕ)دا، کرایە وەزیری دەرەوەی (USA).

ئەوەشی لە سەر «کۆندۆلیزا ڕایس» زانراوە و زۆر باسی لێوەدەکرێت، ئەوەیە کاتێک ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆکی ئەمریکا بوە، قەناعەتی بە (جۆرج بوشی کوڕ) کردوە کە ئەو کاتە سەرۆکی ئەمریکا بوە متمانەی بە تیۆری جەنگی پێشوەخت یان هەنگاونان بەرەو دوژمنی گریمانەکراو هەبێت، تەنانەت ئەگەر زانیارییەکانیش ناڕاست بن یان ڕوونتر بلێین» جەنگ بە پێی پێوەری ئەگەر و گومان»، هەر لە سەر ئەم بنەمایەش (جۆرج بوشی کوڕ)ی سەرۆکی (USA) هەردوو جەنگی عیراق و ئەفغانستانی بەرپا کرد.

سالی (2006) دا کاتێک سوپای ئیسرائیل هێرشی کردە سەر لوبنان، (کۆندۆلیزا ڕایس) ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توندی شەقامی عەرەبی بۆوە، لە سەر ئەو لێدوانەی کە گوتبووی «ئێستا کاتی لە دایک بوونی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی نوێیە»، ئەوەش وەک ستایش و پیرۆزباییەک بۆ ئەو هێرشەی سوپای ئیسرائیل لێک درایەوە.

(ڤلادیمێر پوتین)ی سەرۆکی ڕووسیا، کە خاوەنی ڕوخسارێکی وردە و بەوە ناسراوە زۆر جدی و توند و یەکلاکەرەوەیە، هەموانی توشی شۆک کرد کاتێک لەگەڵ (ئیهود ئۆلمەرت)ی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل دا قسەی دەکرد و بە بێ ئاگا لەوەی دووگمەی مایکرۆفۆنەکەی بەردەمیان کراوەتەوە، سەبارەت بە (موشیە کاتساف)ی سەرۆکی ئیسرائیل گوتی «پیاوێکە لە بەچکەی ئەسپ دەچێت و دەتوانێت دەستدرێژیی بکاتە سەر (10) ژن، بۆیە هەموومان ئیرەیی پێ دەبەین».

ئیتر ڕاستی بێت یاخود سووکایەتی پێکردن، (پوتین) ئیرەیی بە تاوانە سێکسییەکانی کاتساف دەبرد لەگەڵ کچە جوە جوان و ناسک و سەرنج ڕاکێش و سکرتێرەکانی دا.

بەمجۆرە (زمانی پوتین) هەڵەیەکی گەورەی کرد کاتێک باسی لە (موشییە کاتساف)ی سەرۆکی ئیسرائیل دەکرد، کە بە هۆی ئابڕووچوونە سێکسییەکانیەوە ناو و ناوبانگی زڕابوو، هەر لە سەر هەمان بابەت و بە هۆی بڕیاری دادگاوە لە سەر ئەوەی «زیادەڕۆیی لە سێکسدا کردوە»، کاتساف ناچاربوو لە (28ی یۆنیۆی ساڵی 2007) دا دەستلەکاربکێشێتەوە و داواکارییەکەشی ڕادەستی «دالیا یەتماسیک»ی سەرۆکی پەرلەمانی وڵاتەکەی کرد، لە کاتێکدا بەپێی دەستووری ئەو وڵاتە و ماوەی یاسایی دەسەڵاتەکەی، دەیتوانی تا (13ی یۆلیۆی 2007) لە پۆستەکەیدا بمێنێتەوە، دواتریش (شیمۆن پێرێز)ی تەمەن (82) ساڵ بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێررا.

(موشیە کاتساف)ی تەمەن (61) ساڵ، توانی چەند ڕێگەیەک بگرێتە بەر و خۆی لە چوونە زیندان بپارێزێت، لەوانەش جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دادگا بە لە ئەستۆگرتنی چەند تاوانێکی

سێکسی و گێچەڵ و ئەنجامدانی چەند کارێکی نەشیاو، لە بەرانبەر لابردنی تۆمەتی (دەستدرێژی سێکسی) لە سەری، چوونکە بە هۆی ئەو تۆمەتەوە بڕیاری زیندانیکردن و جێبەجێکردنی سزاکەی بە سەردا سەپێندرابوو.

ئەم کەتنە، (کاتساف)ی ڕووبەڕووی سزای زیندانیکردن و جێبەجێنەکردنی سزاکە دەکردەوە، بەڵام ئەم بڕیارەی دادگا، بوە هۆی توڕەکردن و ڕەتکردنەوە و ئیدانەکردنی، لە لایەن میدیا و ڕۆژنامە و ڕێکخراوەکانی ژنانەوە لە ئیسرائیل.

فەرمانبەرێکی مێینەی ئەو وەزارەتەی لە لایەن خودی سەرۆکەوە بەڕێوەدەبرا، باسی لەوە کردوە چەند جارێک لە لایەن «موشیە کاتساف»ەوە گێچەڵی سێکسی پێکراوە، ئەو فەرمانبەرە کە لە لایەن لێکۆڵەرەوەکانەوە ناسنامەکەی ئاشکرا نەکرا، دانی بەوەشداناوە، پێش (10) ساڵ لە لایەن کاتسافەوە چەند جارێک گێچەڵی سێکسی پێ کراوە، بۆیە ناچاربوە واز لە کارەکەی بهێنێت و دەستلەکاربکێشێتەوە، چوونکە ئامادەنەبوە بچێتە ژێر داواکارییەکەیەوە و بە مەرجەکانی ڕازی بێت.

(کاتساف) لە کۆماری ئیسلامی ئێران لە دایک بوە و لە دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەتی ئیسرائیل لە ساڵی (1948)دا ڕووی کردۆتە فەلەستین، لە ژیانیدا چەند بەرپرسیارێتییەکی پێ سپێردراوە لە نێویشیاندا بەرپرسیارێتی لە بواری گەشتیاری و گواستنەوەی گشتیدا.

بۆ یەکەم جار بوو لە مێژووی دەوڵەتی ئیسرائیل دا، لە لایەن ڕاوێژکاریی یاسایی حکوومەتی ئیسرائیلەوە، تۆمەتی خراپ بە کار هێنانی دەسەلات و دروستکردنی ڕێگری بۆ لێکۆڵینەوەکانی دادگا و دەستدرێژی سێکسی و گێچەڵی سێکسی ئاڕاستەی

(موشیە کاتساف)ی سەرۆکی ئیسرائیل بکرێت، چوونکە (کاتساف) دەستدرێژی سێکسی کردبوە سەر چوار لەو ژنانەی لە ئۆفیسەکەی دا کاریان لەگەڵ کردوە.

بەڵام ئەوە یەکەم جار نییە، کە لێپرسراوان و سەرکردە باڵاکانی حکوومەت و حیزبەکانی ئیسرائیل لە دۆسیەی دەستدرێژی و گێچەڵی سێکسییەوە بگلێن.

(بوعز تەتەنبائوم) لە کتێبەکەیدا (بەڵگەی سەرۆک وەزیرانەکان)، نهێنی و وردەکاری ژیانی تایبەتی ژمارەیەک لە سەرۆک وەزیرەکانی ئیسرائیل ئاشکرا دەکات، جگە لە باسکردنی پێوەندییە تایبەتییەکان و هەڵس و کەوت و تایبەتمەندی و کارەکانیان، کە هەر یەکەیان لەوەی تریان جیاوازتر بوو، (بوعز تەتەنبائوم) لە نزیکەوە لەگەڵ زۆربەی سەرۆک وەزیرەکانی ئیسرائیل دا کاری کردوە، لە سالانی (1984 بۆ 1985) دا بەڕێوەبەری نووسینگەی تایبەتی (شیمۆن پێرێز)ی سەرۆک وەزیرانی حکوومەتی نیشتمانی ئیسرائیل بوە، لە کابینەی یەکەمی (ئیسحاق ڕابین) دا ڕاوێژکاری (حاییم بارلیف)ی وەزیری بازرگانی و پیشەسازی ئیسرائیل بوە،

(بوعز) لە کتێبەکەیدا پشتی بەستوە بەو پێوەندییە دۆستانە و نزیکەی لەگەڵ زۆرێک لە سەرۆک وەزیرانەکانی ئیسرائیل دا هەیبوە، هەروەها بەشێک لەو بەڵگە و دۆکیۆمێنتانەشی کە دەستی کەوتبوون، (بوعز) ئاماژەی کردوە بە ڕۆڵی ژنان لە ژیانی تایبەتی (بنیامین نەتانیاهو) دا و دەڵێت (هەر لە منداڵییەوە تا ئەمڕۆ، ژنان هەمیشە زاڵ بوون بە سەر ژیان و کەسایەتی ناتانیاهۆدا، کە بە دایکی دەستی پێکرد، بە جۆرێک ڕوومەتەکانی ناتانیاهو ڕاهاتبوون بە زللەکانی دایکی، کاتێک باوکی بێزاردەکرد کە سەرقاڵی خوێندنەوە و چاودێریکردنی

توێژینەوە و بە دواداچوونەکانی خۆی دەبوو لە ژوورەکەیدا، (ناتانیاهو) بە درێژایی تەمەنی لە ژێر کۆنترۆڵ و هەژموونی ژنان دا بوە، هەمیشەش ژنان ئەویان هەڵبژاردوە نەک ئەم، بەڵام ئەو هەمیشە ملکەچی جێبەجێکردنی خواست و ویست و ئیرادەیان بوە، (ناتانیاهو) بەوەش ناسراوە کە (سارە)ی هاوسەری زۆر بە سەریدا زاڵە بە شێوەیەکی تەواوەتی و وەک منداڵێکی بچووک ژیان و بیرکردنەوە و هەڵس و کەوتەکانی کۆنترۆڵ کردوە.

(بوعز) لە کتێبەکەیدا (کۆڵدامایەر)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری ئیسرائیلی بە مونافیق و ناڕاستگۆ و ماستاوچێتی و خۆبردنە پێش وەسفکردوە و دەڵێت تەنها «چانس و بەخت یاوەری بوو بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل، ئەگەر نا هیچ توانایەکی بۆ ئەو کارە نەبوو».

لە دوای مردنی (لیڤی ئەشکۆل)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی ئیسرائیل، هەریەک لە (موشیە دیان) و (یجال ئالۆن) دیارترین کاندیدەکان بوون بۆ جێگرتنەوەی، بەڵام (بەنحاس سافیر) ڕازی نەبوو هیچ یەک لەو دوو کەسە ببنە سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل، بۆیە پێشنیاری کرد (گۆڵدا مایەر)ی تەمەن (71) ساڵ ئەو پۆستە وەربگرێت، بەو بیانوەی کە ژنێکی بە تەمەن و نەخۆشە و بۆ ماوەیەکی زۆر لە پۆستەکەیدا نامێنێتەوە، بەڵام پێشبینییەکەی ڕاست نەکەوتەوە و (مایەر) بۆ ماوەی پێنج ساڵ فەرمانڕەوایەتی ئیسرائیلی کرد.

(بوعز) لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا باسی لەوە کردوە کە (گۆڵدا مایەر) لە سەردەمی گەنجێتی و لاویدا، ژمارەیەکی زۆر پێوەندی ڕۆمانسی هەبوە، بەڵام گوتویەتی کە هەموویان هاوڕێنی، هەروەها دەشڵێت (مایەر) پێوەندی ڕۆمانسی و

سێکسی لەگەڵ (سێیەم سەرۆکی ئیسرائیل)دا هەبوە لە کاتێکدا، کە هاوسەرگیریشی کردوە، هەروەها پێوەندیشی هەبوە لەگەڵ (دیڤید ڕیمیز)دا، کە یەکەم وەزیری گواستنەوەی ئیسرائیل بوە و ژنیشی هەبوە، هەروەک لە پێوەندیشدا بوە لەگەڵ (لۆبۆیار)ی ملیۆنێری ئەمریکی.

(بوعز)، باس لەوەش دەکات، زۆر جار (گۆڵدا مایەر) بە کەمژیری وەسفدەکرا، بەوەی نەیدەزانی چ ڕەفتار و هەڵس و کەوتێک شیاوە و چی شیاو نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یەکێک بوو لەو سێ سەرۆک وەزیرانەی ئیسرائیل کە خاوەنی کەسایەتییەکی کاریزمی بوون، دوانەکەی تریش (بن گۆریۆن) و (بیگین) بوون، بە جۆرێک وتار و لێدوانە سیاسییەکانیان گوێی گوێگرەکانی ڕادەکێشا بۆ خۆی، کە زۆرینەی وتارەکانیش هێرشبەرانە و توندوتیژ بوون، (بن گۆریۆن)یش بەمجۆرە وەسفیکردوە «تەنها پیاو بوە لە حکوومەت دا، ئەنجوومەنی وەزیرانی بچووککراوەی ناسراو بە (چێشتخانە)، لە سەر بنەمای ڕق و خۆشەویستی پێک هێنابوو، نەک لە سەر بنەما و پێوەری بابەتی و گرینگیی و توانا و تایبەتمەندی کەسەکان».

هەموو وەزیرەکان دەچوونە ماڵەکەی، ئەو خۆی وەک خزمەتکار خزمەتی دەکردن و چاو قاوە و شۆربای مریشکی بۆ ئامادە دەکردن، (بوعز) پێی وایە کە « تەنها مێینە و ژن بوو لە ناو کۆمەڵێک پیاودا، ئەوەش وایلێکرد کەسایەتییەکەی شەڕانگێزی و دڵڕەقی تێدا دروستبێت و هاوتابوو لەگەڵ زۆرێک لە پیاوە بەهێزەکان، هیچ کاتێکیش ڕێگەی بە بوون و دەربڕینی بۆچوون و بیرکردنەوەی جیاواز و نەیار لە بۆچوون و بیرکردنەوەی خۆی نەدەدا».

سەبارەت بەو زانیاریانەشی لەو کتێبەدا باسکراوون بەوەی کە زۆرینەی سەرۆک وەزیرانەکانی ئیسرائیل، پێوەندی ڕۆمانسی و خۆشەویستییان هەبوە، (بوعز) دەڵێت «بەڵێ ئەوە ڕاستییە و کارێکی ئاسایی و سروشتییە، چوونکە هەر یەکێک لەوان پێویستیان بەپشوودان و ژیانێکی تایبەت هەیە بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئەو فشار و ترسە سیاسییانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، سەبارەت بە (لیفی ئەشکول)ی سـەرۆک وەزیرانی کۆچکردووی ئیسرائیل، دەکرێت بگوترێت باشترین سەرۆک وەزیرانی ئەو وڵاتە بوە تا ئێستا، چەندین دەستکەوتی هەبوو، هەر چەندە خاوەنی کەسایەتی و سروشتێکی جۆرێک لە گاڵتەجاڕی بوو، تەنانەت هەندێک جار گاڵتەشی بە خـودی خۆی دەکرد، چونکە پێی وابوو ئەگەر مرۆڤ توانای گاڵتەجاڕانەی نەبێت ئەوا ناتوانێت بەرپرسیارێتییەکی گەورەی حوکمڕانی بگرێتە دەست و تیاشیدا سەرکەوتوو بێت.

یەکێک لـەو قسانەی (لیفی ئەشکول)، کە زۆر بـڵاو و بە ناوبانگە ئەوەیە گوتویەتی» هەر دراوێک سێ ڕووی هەیە، ڕووی سێیەمیان گاڵتەجاڕییەکەیەتی»، (ئەشکول) بە بەردەوامیی دەچوە بینینی شانۆگەری و شوێنەکانی تری کات بە سەربردن و دوای نمایشەکان لەگەڵ شانۆکار و هونەرمەندەکاندا گفتوگۆی دەکرد پێی دەگوترا (کوڕی نوکتەو قسەی خۆش).

(بـن گۆریـون)یـش دوربـوو لـە گاڵتەجاڕیی، بـەڵام هەمیشە سـەرقاڵ بـوو بە ژنــەوە، (شیمۆن پێرێز)یش هیچ کـات ڕێگەی نەدەدا زیاد لە پێویست هیچ کەسێک لێی نزیک ببێتەوە، (بوعز) لە کتێبەکەیدا دەقێکی شیعری ڕۆمانسی و خۆشەویستی (پێرێز)ی بڵاو کردۆتەوە، بێ ئەوەی هیچ زانیاری و وردەکارییەک لە سەر

ئەو شیعرە بدرکێنێت، جگە لەوەی بەڕێز و ستایشەوە ناوی هێناوە و باسی لەوە کردوە کە بۆ ماوەی (12) ساڵ کاری لەگەڵ کردوە.

هەر سەبارەت بە پێوەندیی ڕۆمانسی و نهێنییەکانی سیاسەتمەداران و لێپرسراوانی ئیسرائیل، (د. ئۆرلی بنیامین) شارەزای کاروباری پێوەندییە گشتییەکان دەڵێت «یەکەم زەرەمەندی ئەو جۆرە پێوەندییانە هاوسەری ئەو سیاسەتمەدار و لێپرسراوانەن، بەوەی دەبێت بەرگەی قسەوقسەلۆک و کاردانەوەی پێگەی هاوسەرەکانیان بگرن».

(ئورلی) داواشی لە هاوسەری ئەو سەرکردانە کردوە، «بە هەموو شێوەیەک پابەندبن بەو ڕێکپۆشی و ئەتەکێت و هەڵس و کەوتەی شایستەی پۆست و پێگە و دەسەلاتی هاوسەرەکانیان بێت و بەشداریش بن لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان و لە چالاکییە گشتییەکانیش دا بە شێوەیەکی زۆر باش دەربکەون».

(جیلا کاتساف)ی هاوسەری (موشیە کاتساف)ی سەرۆکی پێشووتری ئیسرائیل، یەکەم ژن نەبوە کە هاوسەرەکەی تۆمەتی ڕەوشتی خراپێتە پاڵ، بەڵکوو پێش ئەویش هەریەک لە (ڕوت دیان) ی هاوسەری (موشیە دیان)ی وەزیری کۆچکردووی بەرگری ئیسرائیل، (ئیکوکی مۆردەخای) هاوسەری (ئیسحاق مۆردەخای) وەزیری پێشووتری بەرگری ئیسرائیل، (نافا باراک)ی هاوسەری (ئیهود باراک)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری ئیسرائیل، توشی هەمان دۆخ بوون و بەرگەی ئەو تۆمەت و ناوزڕاندنە ئەخلاقییانەیان گرت، کە ڕووبەڕووی هاوسەرەکەنیان دەکرایەوە.

هەمان ئەو تۆمەتانەشی ئاڕاستەی ئەو کەسانەی پێشووتر کرا، ئاڕاستەی (حایم ڕامۆن)ی وەزیری پێشووتریش کرا، کە هاوشێوەی (کاتساف) و لە سەر دۆسیەیەکی هاوشێوە دادگایی کرا.

بەپێی یاسای ئیسرائیل، سەرۆکی ئەو وڵاتە لە سەر تاوانکاریی دادگایی ناکرێت تا لە پۆستەکەیدا بێت، جگەلە بە کار هێنانی یاسای پێشخستن (التقادم) بۆ ڤیتۆکردنی ئەو ڕێگرییە، هەروەها ساڵانی پیادەکردنی دەسەڵات و ویلایەتی سەرۆکایەتی بە ساڵانی (تقادم) هەژمار ناکرێت، بەڵام لە کاتێکدا ئەگەر داوا لە سەرۆک بکرێت بۆ وەرگرتنی گوتە، ئەوا ئەو کارە جێبەجێ دەبێت، بەڵام لە جێگەیەکدا کە بە ڕێککەوتنی سەرۆک و دادگا دیاری دەکرێت.

پێدەچێت ئابڕوچوونی سێکسی، بەشێک بێت لە ژیانی سیاسەتمەداران لە ئیسرائیل، شاردنەوە و بێ دەنگ بوون لە ئابڕووچوونێکی سێکسی سیاسەتمەدارێک تا ئەو کاتەیە، کە ئابڕووچونێکی نوێی ئاشکرادەبێت.

دواین دۆسییەی ئابڕووبەرانەی لەمجۆرەش تایبەتە بە ئەندامێکی کنێستی ئیسرائیلی لە فراکسیۆنی خانەنشینان، سەرەتای ئابڕووچوونەکەش کاتێک بوو کە ڕۆژنامەی (یەدیعۆت ئەحرەنۆت)ی ئیسرائیلی بڵاوی کردەوە کچێکی چالاکوان کە وەک کارمەندێکی کارگێڕی لە ئۆفیسی فراکسیۆنی خانەنشینان کاری دەکرد، هەستی بەوە کردوە لە لایەن یەکێک لە نوێنەرانی ئەو فراکسیۆنەوە گێچەڵی سێکسی پێ دەکرێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەک حەزی بەوە نەدەکرد بچێتە بنکەی پۆلیس و سکاڵا تۆمار بکات، بۆ ئەوەی توشی هەمان ئەو فشار و پەرچەکردارانە نەبێتەوە، کە ڕووبەڕووی سکاڵاکاران لە (موشیە کاتساف)ی سەرۆکی پێشووی ئیسرائیل بۆوە و تا ئێستا وەک دۆسیەیەکی ئابڕووچوونی سێکسی جێی بایەخ پێدانی ڕای گشتییە لە سەرانسەری ئیسرائیل دا و بەپێدانی بەرتیل و بڕێک پارە لەگەڵ دادگا و داواکاری گشتییدا ڕێک کەوتوە و بێ بەری دەکرێت لەو تۆمەتی دەستدرێژی سێکسییەی ئاراستەی کرابوو.

هەر مێینەیەکی سکاڵاکار لە دۆسیەی گێچەڵ و دەستدرێژیی سێکسی، بە هەمان شێوە بیردەکەنەوە و پێیان وایە سکاڵاکردن لای پۆلیس، جگە لە ئابڕوچوون، هیچ شتێکی تریان دەستناکەوێت و هیچ مافێکیشیان بۆ ناگەڕێتەوە.

دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵ و زانیارییەکەی ڕۆژنامەی (یەدیعۆت ئەحرۆنۆت)، ترس و شڵەژان و نائارامییەکی زۆر لە ناو کنێستی ئیسرائیل دا دروستبوو، زۆرینەی ئەندامانی کنێست کەوتنە جووڵە بۆ دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ناوی ئەو هاوکارە گێچەڵبازەیان، بەشێکی زۆری ئەندامانی کنێست داواکارییەکیان ئاڕاستەی جێبەجێکاری کارەکانی سەرۆکی کنێستی ئیسرائیلی (مەجلی وەهبە) کرد، تا ناوی ئەو کەسەیان پێ بڵێت یان ناوەکە ئاشکرا بکات، بەڵام ئەویش هیچی نەدەزانی و جەختی دەکردەوە لە سەر گرینگیی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی ئەو کەسەی ئەو کارەی کردوە، بە تایبەت بۆ دوورخستنەوەی گومان لە سەر ئەو ئەندامانەی تر کەڕێی تێ دەچوو ئەو کارە بکەن، هەروەها بۆ دڵنیاکردنەوە و هێورکردنەوەی ئەو کارمەندە مێینانەشی لە کنێست کار دەکەن و لەوانەیە هەر یەکێک لەوانە قوربانی چیرۆکێکی تری دەستدرێژیی یان گێچەڵی سێکسی کەسە نەناسراوەکە بێت.

هەر لەو میانەیەدا (موشیە شارۆنی) سەرۆکی فراکسیۆنی خانەنشینان لە کنێستی ئیسرائیل، ڕایگەیاند فراکسیۆنەکەیان کۆبوونەوە و دانیشتنێکی بە پەلە و نائاسایی دەکەن بۆ قسەکردن و تاوتوێکردنی ئەو بابەتە و دۆزینەوەی چەند بەڵگەیەک، بەڵام ئەمە نەبوە هۆی ئارامکردنەوە و هێورکردنەوەی دەروون و توڕەیی ئەندامانی کنێست، تا ئەو کاتەی میدیا زانیارییەکی

یەقین و یەکلاکەرەوەی بڵاوکردەوە، ئەوەش لێدوانێکی ڕادیۆیی (یولب بیتسحاق)ی ڕۆژنامەنووس بوو، کە تێیدا ئاشکرای کرد ئەو گێچەڵبازە (یەتسعاق زیف)ی ئەندامی کنێستی ئیسرائیلە لە فراکسیۆنی خانەنشینان.

فراکسیۆنی خانەنشینان، فراکسیۆنێکی نوێی کنێستی ئیسرائیلە، بۆ یەکەم جار توانیان سەرکەوتنێکی پێشبینی نەکراو لە هەڵبژاردن دا بە دەست بهێنن و ببنە خاوەنی حەوت کورسی کنێست، کە یەکێکیان (یەتسعاق زیف) بوو کە لە دایک بووی (11-11-1937)ە، ژنەکەی مردوە و باوکی سێ منداڵە، کەسایەتییەکی ناسراو نەبوو، لەوە دەچوو تۆمەتی گێچەڵکردنەکەی چەند تۆمەتێکی تریشی لە سەر زیندوو بکاتەوە، بە تایبەتی تەمەنەکەی کە زۆر پیرە و بە کەڵکی ئەو پێگە سیاسییە نەدەهات.

یەکێکی تر لەو دۆسییەی گێچەڵی سێکسیانەی تا ئێستا لە ئیسرائیل باس دەکرێت، دۆسییەی ژنێکی تر بوو بە ناوی ( خاتوو هـ)، کە پێشتر ئەفسەر بوو لە سوپای ئیسرائیل، (خاتوو هـ) سکاڵایەکی لە دژی (حایم ڕاموون)ی وەزیری داد و جێگری سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل تۆمار کرد، لە سەر ئەوەی «لە یەکێک لە ژوورەکانی بینای حکوومەتی ئیسرائیل لە تەلئەبیب بە زۆر ماچی کردوە، کاتێک لە کۆبوونەوەدا بوون لە سەر پێشهاتەکانی جەنگی لوبنان»، بەوەش (حایم ڕاموون) ناچاربوو دەستلەکاربکێشێتەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی دادگا ئەو هەڵس و کەوتەی ئیدانە کرد و بە کارێکی شورەیی و تاوانێکی قێزەون وەسفی کرد و ڕێگری کرد لە ئەنجام دان و بەشداربوون لە هەر کاروچالاکی و جموجۆڵ و وەرگرتنی بەرپرسیارێتییەکی سیاسی و ئیداریی، بەڵام سەرەڕای ناڕەزایی و کاردانەوەیەکی زۆری

جەماوەری و سیاسی و ڕێکخراوەیی، لە لایەن (ئیهود ئۆلمەرت) ی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیلەوە، (ڕاموون) گەڕێندرایەوە بۆ ناو حکوومەت و (ڕاموون)یش بێ تاوانی و بێبەری بوونی خۆی لەو تاوانە دووپات دەکردەوە.

پۆلیسی ئیسرائیل لەو بارەیەوە ڕایگەیاند، کە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی تایبەت ناسراو بە (فایتسمن عافر)، لێکۆڵەرێکی تایبەتی بە ناوی (دانا بن شووشان) ڕاسپاردوە، تا بە نهێنی قسە لەگەڵ (خاتوو هـ)دا بکات و ڕایبکێشێت بۆ قسەکردن لە سەر ئەو بابەتە و دەری بخات، کە ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستەی (ڕاموون) ی کردوون ناڕاستن، هەروەها داواش لە لێکۆڵەرەکە کرابوو بە نهێنی ئەو کارە بکات و دەنگەکەشی بە شێوازێکی شاراوە و نهێنی تۆمار بکات، دوای ئەم کارەش پۆلیس دۆسییەی لێکۆڵینەوەی بۆ (نووسینگەی لێکۆڵینەوەی تایبەت) کردەوە، هاوکات سێ ئەندامی ژنی کنێستی ئیسرائیل کەمپینێکیان دژی (ڕاموون) دەست پێکرد و تۆمەتباریان کرد بەوەی پێگە سیاسییەکەی بۆ دەمکوتکردن و ڕاونان و ترساندنی (خاتوو هـ) بە کار هێناوە.

ئەو سێ ژنە ئەندامەی کنێستی ئیسرائیل کەلەفراکسیۆنی جیاوازبوون، ڕاگەیەندراوێکیان بڵاوکردەوەو باسیان لەوەکرد کە (ڕامـــوون) کەسێکی بەهـێزەو هـەموو هـەوڵێکی خۆی خستۆتەگەڕ، بۆ شێواندن و ناشرینکردنی ناوبانگ و کەسایەتی (سـکـاڵاسـەرەکـەرەکـەی)، هــەروەک تەئکیدیشیانکردبۆوە لە سەر ئەوەی «نابێت (ڕامـوون) بەردەوامبێت لە سەر کارەکەی وەک وەزیر و جێگری یەکەمی سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل».

لەبەرانبەریشدا (حایم ڕامـوون) لە ڕاگەیەندراوێک دا ئاشکرای کرد «هاوڕێ و برای هاوسەری پێشووی داوای لە نووسینگەی

لێکۆڵینەوەی تایبەت کردوە ئەو کارە بکەن و بێ ئاگایی خۆی لەو بابەتە دووپات کردەوە»، لە بەشێکی تری ئەو ڕاگەیەندراوەی دا، (ڕاموون) گوتی «(ئافرایم کوندا)ی هاوڕێم باوەڕی تەواوی بەوە هەیە من بێ تاوانم و دڵگران بوە بەوەی ڕووبەڕووی من بۆتەوە، بۆیە چۆتە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی تایبەت و داوای لێ کردوون درۆکەی (خاتوو هـ) ئاشکرابکەن»، لە بەشێکی تری ڕاگەیەندراوەکەیدا، (ڕاموون) داوای لێبووردنیشی لە(خاتوو هـ) کرد بەوەی ئاگای لەوە نەبوە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی تایبەت بەوجۆرە کەوتوونەتە شوێنی و بێزاریان کردوە و فشاریان لە سەر دروستکردوە.

(ڕاموون) گوتیشی کە دەیەوێت سەر لە نوێ ژیانێکی نوێی سیاسی دەست پێ بکاتەوە و قۆناغێکی نوێ بونیاد بنێت، دوای ئەو هەموو کێشە و ئاستەنگانەی لە ڕابردوودا بۆی دروستبوون، هەروەها (ئەفرایم کوندا)ی هاوڕێشی کاریگەری لە سەر هەبوە و توشی ئەو جۆرە نەخۆشییەی کردوە.

لەو چوارچێوەیەدا (یستحاق لیڤنی) ئەندامی کنێستی ئیسرائیل لە فراکسیۆنی (مەفدال) داوای کرد ماددەیەکی یاسایی ئامادە بکرێت و پەسەند بکرێت تا ڕێگربێت لەوەی ئەو کەسانەی تۆمەتی تاوانی سێکسییان ئاڕاستە کراوە نەکرێنە وەزیر، بە بێ گوێدانە بڕیاری دادگا لە سەر تاوانبارییی یان بێ تاوانی کەسی تۆمەتبار لە ئەنجام دانی تاوانەکە، ئەمەش وەک ئاماژەیەک بۆ بڕیاری دادگا لە دژی (ڕاموون) کە گوتبووی ماچکردنی (خاتوو هـ) تاوانێکی گەورە و بە زۆر نییە.

ڕادیۆی دەنگی ئیسرائیل لە سەر زاری (یستحاق لیڤنی)ییەوە ئاشکرای کرد» ئەو پرۆژە یاسایە بۆ ڕێگرتنە لە نارِوونی و

توندوتۆڵ نەبوونی یاسای تایبەت بە دانانی کەسێک لە پۆستی وەزیری دا، کە تاوانێکی سێکسیی ئەنجام داوە».

تا ئێستاش تەنها (10) ئەندامی فراکسیۆنە جیاوازەکانی کنێستی ئیسرائیل، ئیمزایان لە سەر یاداشتی تایبەت بەو پرۆژە یاسایە کردوە، کە دوای دامەزراندنی (ڕاموون) وەک وەزیر لە حکوومەتی ئیسرائیل پێشکەش کراوە.

لە لایەکی ترەوە، ڕێکخراوەکانی ژنان لە ئیسرائیل کە لە چەندین ڕووەوە هاوکاری ئەو کەسانەیان کردوە بوونەتە قوربانیی دەستدرێژییە سێکسییەکان و دەڵێن ڕێژەی سکاڵاکان لە سەر ئەو بابەتە بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردوە، جگە لەوەی بەشێک لە قوربانییەکان ئامادەنین لای پۆلیس سکاڵا تۆماربکەن، ئەمەش بە هۆی بایەخپێدان و گرینگیدانی میدیا و ڕۆژنامەکان بە هەواڵەکانی پەیوەست بە تاوان و ئابڕووچوونی سێکسی، هەروەک دۆسییەی سەرۆکی پێشووی ئیسرائیل، کە بیرەوەرییەکی زۆر ناخۆشی لای قوربانییەکانی تاوانی دەستدرێژی سێکسی بە جێ هێشت، ئەو قوربانییانە پێویستیان بە کەسانێکی باش و شارەزا هەیە تا گوێیان لێ بگرن و کێشەکانیان بۆ چارەسەربکەن و یارمەتیدەریان بن بۆتێپەڕاندنی ئەو دۆخە ناهەموار و نەخوازراوەی توشی بوون، نەک لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و وێنەکانیانەوە، باری دەروونیان گرانتر بکەن.

بەڵام ئەوەی دەرکەوتوە ئەوەیە، کە قوربانیانی گێچەڵکردن و دەستدرێژیی سێکسی بە هیچ شێوەیەک لە بنکەکانی پۆلیس سکاڵا تۆمار ناکەن، چونکە هەموان دەزانن ئەنجامی سکاڵاکان بە چ جۆرێکە و لە زیانی قوربانییەکان و لە بەرژەوەندی تاوانبارانە، لەبەر ئەوە هیچ باوەڕ و متمانەیەکییان بە پۆلیس نییە.

دواجار شازادەی جێنشینی بەریتانیا هاوسەرگیری لەگەڵ (کامیلا بارکەر باوڵز)ی خۆشەویستیدا کرد، کە ناسراوە بە (ئەو ژنەی داستانی دیانای تێکشکاند)، لە کۆتاییدا پەردە لە سەر یەکێک لە نامۆترین و سەیروسەمەرەترین چیرۆکەکانی خۆشەویستی و خیانەت و مەرگ لە سەردەمی نوێدا لابرا، دوای گەشتێک کە (35)ساڵی خایاند، چارەنووس دوو خۆشەویستەکەی کردە هاوسەری یەکتری، ئەوەش لە (اشلاە) ی هاوسەری شازەدەدا، کە سێ جار لە سەر یەک کوژرا، جارێکییان بە خیانەتی شازادەی هاوسەری، دوەمیشیان بە کوشتنی لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا لە تونێلێکی شاری پاریس، جاری سێیەمیش بە هاوسەرگیری هاوسەرە خیانەتکارەکەی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا، ئەو خۆشەویستەی توانی لە دەرگای پشتەوە بچێتە ناو مێژووەوە.

بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاوسەرگیری (شازادە چارلز و کامیلا)، تەنها بە مانشێتێکی ڕۆژنامەی (ئیندی پێندت) بڵاوبۆوە، کاتێک نووسیبووی «هەواڵێکتان پێ ڕادەگەیەنین کە ڕەنگە لە دەستتان بچێت، ئەمریکا ڕووبەڕووی پەلامار و هێرشەکانی (11ی سێپتەمبەر) بۆوە، کۆریای باکوور بوە خاوەنی چەکی ئەتۆمی، چارلزیش هاوسەرگیری کرد».

(شازادە دیانا) پێش ئەوەی بمرێت، هیچ شوێنێکی گونجاوتری ناو کۆشکەکەی لە (WC) بە گونجاوتر نەزانی تا وێنەیەکی (کامیلا بارکەر)ی تێدا هەڵبواسێت، ئەوەی نامۆبوو هەڵویستی (شازادە چارلز) بوو کە هیچ تورە و بێزار نەبوو بەو کارە، بەڵکوو هەستی کرد ئەو شوێنە شیاوە بۆ هەڵواسینی وێنە تایبەتەکان، بە تایبەتی دوای ئەوەی هەموو کەس زانی، کە

شازادە لە ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەیدا لە نێو ئامێز و باوەشی خاوەنی ئەو وێنەیەدایە، هەموو جیهان سات بە سات چاودێریی ئامادەکارییەکانی ئەو هاوسەرگیرییە شاهانەیەی دەکرد، لە کاتێکدا (شازادە چارلز) و (خۆشەویستەکەی) لە سەر یەک جێگەی خەوتن بوون، (ئەندرۆ پارکەر باوەڵز)ی هاوسەری، چاوەڕێی دەکرد تا ئەو کارە کۆتایی بێت و جارێکی تر بێتە دەرەوە و بچێتەوە بۆ ئاهەنگی هاوسەرگیری.

لە ڕاستیدا هەر یەک لە هاوسەر و خۆشەویستەکەی، هیچ نەبوون جگە لە ئامرازێک بۆ وروژاندنی ئیرەیی و غیرەی بەرانبەرەکانیان، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (1970)دا (کامیلا کامبەر)، شازادە (چارلز)ی ناسی، ئەوەش لە میانەی بەشداریکردنی شازادەدا بوو لە یارییەکانی پۆلۆدا، لەو کاتەدا، کە باران دەباریی، هەموو شتێک وەستابوو جگە لە تێڕامان و بیرکردنەوەکانی (کامیلا) کە پێشتر دڵی (بارکەر باوەڵز)ی ئەرستۆکراتی بردبوو، بەڵام لەم دواییانەدا هیچ بایەخێکی بەم نەدەدا و کەمترین کاتیش سەیری ڕوخساری دەکرد، بۆیە (کامیلا) دوای تێڕامان و بیرکردنەوەیەکی زۆر، بڕیاریدا بۆ وروژاندنی ئیرەییەکەی، ڕێگەچارەی (حەوا) بە کار بهێنێت و بچێت بۆلای (شازادە) و قسەی لەگەڵ بکات، ئەویش لەو کاتەدا کە قسەی لەگەڵ یەکێک دەکرد یان تەوقەی لەگەڵ یەکێک بکردایە لە شەرمدا سوورهەڵدەگەڕا، (شازادە) بە دەنگی بەرز قسەی لەگەڵ نەدەکرد، چونکە لە کۆتاییدا ئەو شازادەی جێنشینە و لە داهاتوودا دەبێتە پادشای وڵاتەکەی، (کامیلا) بەوپەڕی ژنێتی و خانمانەوە ڕەفتاری دەکرد و خۆی دەنواند، بەو جۆرەی کە پیاو دەخاتە ناو لەپی دەستییەوە و لە خشتەی دەبات و دەتوانێ

بگات بەوەی دەیەوێت، لای خۆشییەوە (شازادە بچکۆلەکە) بۆیەکەم جار بوو جگە لە داپیرەی و دایکی و خوشکەکەی، قسە و مامەڵە لەگەڵ مێینەیەکی تردا بکات و هەست بکات کۆمەڵێک کەسی تریش جگە لەوان لەم دوونیایەدا بوونیان هەیە، (شازادە) هەستی بە تەنهایی و داب و نەریتە کوشندەکانی نێو ژیانی پادشایەتی دەکرد، تا ئەو کاتەی ئەم (کامیلا)یە هات و هەموو ئەو پیرۆزی و داب و نەریتانەی تێکشکاند، بە جۆرێک هەستی بە ئاسودەیی و خۆشی دەکرد، پێی وابوو (کامیلا) ڕزگارکەرێتی و بە تایبەتی لە ئاسمانەوە بۆی نێردراوە.

ئیتر لەم نێوانەدا هەستی ئیرەیی و غیرە لای (بارکەر پاوەڵز) بە شێوەکی کاریگەر جووڵا و هەموو لایەکی ژیانی گرتەوە و تا (شازادە) بایەخی زیاتری بە (کامیلا) بدایە، (بارکەر) زیاتر هەستی خۆشەویستی بۆ (کامیلا) دەجووڵا و پێی وابوو شایستەی ئەوەیە وەک هاوسەر بیخوازێت و ژیانێکی هاوبەش پێک بهێنن، لەبەر ئەوەی (کامیلا) لە خانەوادە و بنەماڵەیەکی خانەدان نەبوو، ئەمەش وای لە شاژنی بەریتانیا کرد ڕازی نەبێت بە نزیکبوونەوەی زیاتر و هاوسەرگیری نێوان (شازادە و کامیلا)، بۆیە (کامیلا) هیچ ڕێگە چارەیەکی لە بەردەمدا نەمایەوە جگە لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ (بارکەر)ی خۆشەویستی پێشوویدا، لە کاتێکدا هەمیشە خەونی بەوەوە دەبینی شازادە ببێتە هاوسەری داهاتووی، (بارکەر)یش خۆی بە سەرکەوتوو دەزانی و دەیگوت بە سەر شازادەدا سەرکەوتوو بوە و توانیویەتی خۆشەویستەکەی لێ بڕفێنێت و هاوسەرگیریشی لەگەڵدا بکات.

خیانەتەکەی (کامیلا) بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی چەند منداڵێکیان هەبوو، بەوپەڕی بێ شەرمییەوە داوای لە شازادە

کرد ببێته باوکی ڕۆحی منداڵەکانی، ئەمەش بەپێی بەشێک لەو تۆمارە دەنگییانەی (شازادە دیانا) کە لە لایەن تۆڕی تەلەڤزیۆنی (nbc)ئەمریکییەوە بڵاوکرایەوە.

(دیانا) ئاهەنگی لە دایک بوونی خوشکەکەی (کامیلا)ی وەک دواین ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵیدا دیاری کردوە، چوونکە ئاگای لەو پێوەندییە نهێنی و خۆشەویستییە بوو کە لە نێوان (شازادە چارلز)ی هاوسەری و کامیلا) دا هەبوو.

هەر بەپێی ئەو تۆمارە دەنگییە، لەو ئاهەنگەدا کە لە زستانی ساڵی (1989) ڕێکخرابوو، (شازادە دیانا)، (شازادە چارلز) ی هاوسەری و میوانێکی تریشی بینی کە پێکەوە لە تەنیشت (کامیلا)دا وەستاون، (شازادە دیانا)ش چوە لایان و گوتی (دەمەوێت بە تەنیا قسە لەگەڵ کامیلا)دا بکەم، دوای ئەوە وەک مریشکێکی سەربڕاو بە قادرمەکاندا چوە نهۆمی سەرەوەی شوێنی ئاهەنگەکە.

وەک ئەوەی لە تۆمارە دەنگییەکەدا دەردەکەوێت، (شازادە دیانا) زۆر بێ تاقەت و نائارام بوە بەو دیمەنە و بە (کامیلا)ی گوتوە «دەزانم چی لە نێوان تۆ و چارلزدا هەیە، تەنها دەمەوێت بزانیت کە ئاگام لێیە و هیچی تر»، (کامیلا)ش لە وەڵامدا پێی گوتوە «گەیشتیت بە هەموو ئەوەی ئومێدت بۆ دەخواست، هەموو پیاوانی دونیا دەکەونە داوی خۆشەویستیتەوە، دوو منداڵی جوانیشت هەیە، لەوە زیاتر چی ترت دەوێت؟» وەڵامەکەی (شازادە دیانا)ش بریتی بوو لەوەی «هاوسەرەکەمم دەوێت، داوای لێبوردن دەکەم کە من لە بەردەم ڕێگەی ئێوەدا وەستاوم، بێ گومان ئەوەش ئازاری ئێوە دەدات، بەڵام من دەزانم کەچی ڕوودەدات و چی دەگوزەرێت، واهەست نەکەی

من گێلم و بێ ئاگام لەوەی کە هەیە»، ئەم قسانەش بەشێکە لەو تۆمارە دەنگییەی (شازادە دیانا) کە بەپێی هەواڵێکی ئاژانسی ئەسیۆشێتد پرێس، لە هاوینی ساڵی (1997)دا لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا لە شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا گیانی لە دەستدا.

بەپێی بەشێک لە قسەکانی ناو ئەو تۆمارە دەنگییە، کە لە سەر دوو کاسێت بوو، لە لایەن ئاژانسی (nbc)ییەوە بڵاوکرایەوە، (شازادە دیانا) هەستی بە بێ تاقەتی و تێک شکان و نائارامی و نائاسودەیی دەکرد لە هاوسەرگیرییەکەیداو دەریشکەوت کە چەند جارێک هەوڵی خۆکوشتنی داوە.

ئەو زانیارییانەشی لەو دوو کاسێتە دەنگییەدا هاتوون، بنەما و سەرچاوەی سەرەکی کتێبەکەی (ئەندرۆ مۆرتۆن)ە، کە لە ساڵی (1992)دا و بە ناونیشانی (دیانا، چیرۆکە ڕاستەقینەکەی) چاپ و بڵاوی کردەوە.

بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە بوە هۆی وروژاندن و تورەیی خانەوادەی (شازادە دیانا) و هاوڕێکانی و (خانەوادەی شاهانە)ش، دوای ماوەیەکیش لە ساڵی (1996)دا (شازادە چارلز و شازادە دیانا) بە ڕەسمی لە یەکتر جیا بوونەوە، واتا تەنها یەک ساڵ پێش ئەوەی (شازادە دیانا) گیان لە دەست بدات.

لە ساڵی (1994)یشدا (شازادە چارلز) لە بەڵگەنامەیەکدا دانی بەوەدا ناوە «دەستبەرداری پەیماننامەی هاوسەرگیرییەکەی بوە، بەڵام سووربوە لە سەر ئەوەی خیانەتەکەی دوای ئەوە بوە هەر دوو لایان شکستیان هێناوە لە ڕزگارکردن و پاراستنی ژیانی هاوسەرێتییان».

هاوسەرگیری نێوان (چارلز و کامیلا)، وەک ئەوە نەبوو کە دەبوایە ببێت، چونکە لەو کاتەدا هێشتا (کامیلا) هاوسەردار بوو،

کڵێسا و دابونەریتی شاهانەش، ڕێگەی بە (شازادەی جێنشین) نەدەدا هاوسەرگیری لەگەڵ مێینەیەکدا بکات، کە پێشتر هاوسەرگیری کردبێت، لەو کاتەدا نەبێت هاوسەری شازادەی جێنشین لە ژیاندا نەمابێت و مردبێت، ئەو ڕێگرییەش لە بەردەم (شازادەی جێنشین) دا نەبوو، چونکە (شازادە دیانا) پێشتر لە ڕووداوێکی دڵتەزێندا گیانی لە دەستداو لە ژیاندا نەمابوو، پێش ساڵێکیش (کامیلا) بە ڕەسمی لە هاوسەرەکەی جیا ببۆوە، لە ڕاستیدا دۆخەکە بە هەموو شێوەیەک لەبار بوو بۆ (چارلز و کامیلا) تا هاوسەرگیری بکەن و هیچ ڕێگری و ئاستەنگێک لەبەر دەمیاندا بوونی نەبوو، بەڵام هەر هەنگاو و هەڵس و کەوتێکی پەلە لە هەر یەکێکیانەوە، بە قازانجی دۆسییەکەی (شازادە دیانا) دەکەوتەوە، چونکە بە شێوەیەکی گشتی گومان دەکرا کە (خانەوادەی شاهانە) تێوەگلابن لە ڕووداوی کوشتنەکەی (دیانا)دا یان بە جۆرێک لە جۆرەکان پێوەندییان بەو کەیسەوە هەبوو بێت، بەڵام ئەم هاوسەرگیرییە بە چانسی پێگە و ناوبانگی (دیانا) کەوتەوە و بە یەک بەرد و لە یەک کاتدا چەند چۆلەکەیەکی کوشت، یەکەمیان پەردەی لە سەر ئەو ئابڕووچوونە ڕۆمانسی و خۆشەویستییە هەڵماڵی کە ڕووبەڕووی کۆشکی (ویندرسۆن) ببۆوە، دوەمیشیان کۆتایی بەو تۆمەت و بووختانانە هێنا کە بۆ (دیانا) هەڵبەسترابوو بەوەی لە (عیماد فاید) دووگیانە و پێدەچێت برایەکی موسوڵمان بۆ شازادەی جێنشینی داهاتووی بەریتانیا دروست بکات، سێیەمیشیان (شازادەی جێنشین) توانی هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بکات بە بێ ئەوەی مافی وەرگرتنی کورسی پادشایەتی لێ بسەندرێتەوە، چوارەم ئەو پارەیەی لە دوای جیا بوونەوەکە وەک مافی (دیانا) دیاریکراو نزیکەی (22) ملیۆن دۆلار دەبوو و گیرفانی شازادەی

بە تەواوی بەتاڵکرد، بۆ دوو منداڵەکەی (دیانا و چارلز) بەجێما، بە مانییەکی تر گیرفانی باوکیان (شازادە چارلز) هیچی تێدا نەما، (چارلز) بەردەوام بوو لە سەر ئابڕوچوونە سێکسییەکانی، ئەوەش بە تۆمەتی (ناسازی سێکسی)، بە تایبەتی دوای ئەوەی (بە ڕووتی لەگەڵ ئەو پیاوەدا گیران) کە گەورەی خزمەتکارەکانی (کۆشکی ویندرسۆن) بوو، بەڵام (کامیلا) گوێی بەو ئابڕوچوونە نەداو پێی دڵتەنگ و نیگەران نەبوو، بەڵکوو دەیگوت «بۆ هەمیشە وەک خۆشەویستی تۆ دەمێنمەوە و دەستبەرداری تۆنابم و وازت لێ ناهێنم، (ئەلیس کیبل)ی داپیرەی من، خۆشەویستی (لویسی حەوتەم)ی باپیرەی تۆبوو، بەڵام نەیانتوانی هاوسەرگیری بکەن و بە یەک بگەن، بەڵام من بۆ هەمیشە وەک خۆشەویست و هاوسەری تۆ دەمێنمەوە سەرەڕای قسەو قسەڵۆکی خەڵک، بەڵام پۆشاکە ناشرینەکانم کە دۆلابەکانیان پڕکردوە فڕێ دەدەم و تۆش ئەو پۆشاکانەم بۆ بکڕە کە شایستەی (ژنی پادشای داهاتووی بەریتانیا) بێت ».

(ئابڕوچوونەکەی ووتەر گەیت)، کە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا وەک تەقینەوەیەک ڕووبەڕووی بەرژەوەندییەکانی ئیدارەکەی (ڕیچارد نیکسۆن) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA) و دەستووری ئەمریکا بۆوە و سەردەم و قۆناغێکی نوێی ڕۆشنبیری و مێژوویی هێنایە ئاراوە، لەو کاتەوە تا ئێستا وشەی (گەیت) بۆ وەسفکردنی هەر ئابڕوچوونێکی تری هاوشێوە بە کار دێت کە ڕووبەڕووی کەسایەتییە سیاسییە دەگمەنەکان دەبێتەوە و گرینگییان کەمترە لە گرینگییەکانی (ووتەر گەیت).

بۆیە لەو کاتەوە لە لایەن میدیا و ڕۆژنامەکانی ڕۆژئاوا و ئەمریکاوە (ئابڕوچوونەکەی ووتەر گەیت) وەک هێماو

ئاماژەیەک بۆ هەر ئابڕوچوونێک باس دەکرێت و ناودەهێنرێت کە جۆری تاوانەکە پێوەندی بە تۆمارکردنی دەنگییەوە هەبێت لە گفتوگۆ تایبەتەکانی کەسایەتییە دیار و بە ناوبانگەکانی سیاسەت و حکوومەتی وڵاتانی ڕۆژئاواو خانەوادەی شاهانەی بەریتانیا و دواتریش گەورەترین پیاوانی کار و خاوەن سەرمایەکانی جیهان.

(گەیت)، لە ئێستا تەنها ئاماژەیەک نییە بۆ ئابڕوچوونە سیاسییەکان و ئابڕوچوونەکانی تری (USA)، بەڵکوو لە ئێستادا وشەی (گەیت) بۆ هەر جۆرە ئابڕوچوونێک بە کار دەهێنرێت لەو وڵاتانەدا ڕوو دەدەن، کە زمانی قسەکردنیان ئینگلیزییە، بە تایبەتی (ئینگلتەرا) کە ناوبانگێکی زۆری هەیە بەو دەستەواژە و وشانەی پاشگری (گەیت)ی بۆ دانراوە، دیارترینیشیان تایبەتە بە (خانەوادەی شاهانەی بەریتانیا) و بە تایبەتی تریش دوو هاوسەرەکەی پێشوو (شازادە چارلز و شازادە دیانا)، ڕۆژنامەکانی بەریتانیا چەند ئابڕوچوونێکی دیاری ئەو خانەوادە و خێزانەیان بە پاشگری (گەیت)ەوە بڵاوکردەوە، لەوانەش ئابڕوچوونەکانی (دیانا گەیت، کامیلا گەیت، هتد).

هەر چۆنێکبێت پێوەندییەکەی نێوان (شازادە وێلز) و (کامیلا بارکەر پاوەڵز) ئاشکرا کراو بە نهێنی نەهێڵرایەوە، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئەم قۆناغی ئاشکراکردنە، پێوەندییەکەیان بە چەندین قۆناغی پڕ لە ئابڕوچووندا تێ پەڕین و لە لایەن میدیا و ڕۆژنامەکانی بەریتانیاشەوە بە بەردەوامی کاریان لە سەر دەکراو بڵاو دەکرانەوە، بە تایبەتی ئەو ئابڕوچوونەی (کامیلا و چارلز)، کە پێوەندییەکی سێکسی نهێنییان هەبوو لە کاتێکدا هەردووکیان لە ژیانی هاوسەرگیریدا بوون.

سالّی (1970)، کاتێک لە یارییەکی (پۆلۆ)دا (چارلز و کامیلا) یەکتریان بینی، (شازادە چارلز) تەمەنی (22 سال) بوو، (کامیلا) ش ساڵێک لە (چارلز) گەورەتر بوو، دوای ئەو بینینە هەر یەکەیان چوون بە لای ژیانی تایبەتی خۆیانەوە، (شازادە چارلز) کە نەی دەزانی کەی دەبێتە پادشای بەریتانیا، لە (کۆلێژی سەربازی و بە تایبەتی هێزی ئاسمانی) خوێندی، (کامیلا)ش، لە سالّی (1973) هاوسەرگیری لەگەڵ (ئەندرۆ بارکەر پۆلز)دا کرد کە ئەفسەری سوپای بەریتانیا بوو، تەنها بۆ ئەوەی ببێتە هەڵگری نازناوەکەی و ببێتە (کامیلا بارکەر پۆلز) لە جیاتی ئەوەی ببێتە (کامیلا بروس شاند). جیاواز لە مەش، پێوەندی نێوان (چارلز و کامیلا) گۆڕدرا بۆ پێوەندی نێوان دوو خۆشەویست (عاشق و مەعشوقەکەی)، کە هیچ کاتێک ئەو پێوەندییە کۆتایی نەهات، ئەوەی تا ئێستا بەریتانییەکان دەیزانن ئەوەیە کە لە کێڵگەکەی خانەوادەی (کامیلا) و هاوسەرەکەی، (شازادە چارلز) و (لەیدی دیانا) یەکترییان بینی، (چارلز)یش لە سەر داوا و پێشنیاری (کامیلا) داوای هاوسەرگیری لە (دیانا) کرد و لە سالّی (1981) یشدا ئاهەنگێکی هاوسەرگیری ئەفسانەییان ساز کرد.

کاتێک (کامیلا) پێشنیاری بۆ (چارلز) کرد، کە هاوسەرگیری لەگەڵ (دیانا)دا بکات، لەو سۆنگەیەوە بوو کە (دیانا)ی وەک کچێکی بچووک و ساویلکەی کەم ئەزموون دەبینی و پێشی وابوو نابێتە کۆسپ و ڕێگر لە بەردەوام بوونی پێوەندییە ناشەرعییەکەی لەگەڵ خۆشەویستە نهێنییەکەی، کە (پادشای داهاتووی بەریتانیا)یە و ڕۆژێکیش دێت دەبێتە (ژن)ی و هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات، بەڵام ئایا بۆچی هەستی دەکرد کە بە هیچ شێوەیەک نابێتە مەترسیی لە سەر هاوسەرگیرییەکەیان؟

ئەم پێوەندییە سۆزدارییە قەدەغەکراو و ڕێگەپێنەدراوە، یەکێک بوو لە گرینگترین هۆکارەکانی (جیا بوونەوە شاهانە) ییە، کە لە ساڵی (1996)دا، واتا ساڵێک پێش گیان لە دەستدانی (شـازادە دیـانـا) لە ڕووداوێـکـی هاتوچۆدا لە پاریس لەگەڵ (دودی فاید)ی هاوڕێیدا، ساڵی (1992) پێوەندییە سۆزدارییە نهێنییەکەی نێوان (شـازادە چارلز) و (کامیلا بارکەر) ئاشکرا بوو، ئەو کاتە بە ناوی (کامیلا گەیت)ەوە بانگ دەکرا، بە تایبەتی دوای بڵاوبوونەوەی تۆماری دەنگی پێوەندییە تەلەفۆنییە پڕ لە هەست و وروژانە گەرمەکانی نێوانیان.

لە ساڵی (1994) و لە بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی ڕاستەوخۆدا، (شازادە چارلز) ددانی نا بەوەی خیانەتی لە (شازادە دیانا ویڵز)ی هاوسەری کردوە، کە بە (شازادەی دڵی بەریتانییەکان) ناسرابوو، جارێکیش (دیانا) باسی لەوە کردبوو هاوسەرگیرییەکەیان وەک هەر دوو کەسێکی تر لە نێوان (خۆی و چارلز)دا نییە، بەڵکوو هاوسەرگیرییەکی سێ لایەنەیە و پێک هاتوە لە (چارلز، دیانا، کامیلا)، لە ساڵی (1995)دا (کامیلا) لە (بارکەر بۆڵز) جیا بۆوە و ویستی هاوبەشی نازناوەکەی (شازادە چارلز) بکات، کە ساڵێک دواتر لە هاوسەرەکەی جیا بۆوە.

ڕۆژلەدوایڕۆژ، خەڵکی بەریتانیا ڕادەهاتن لە سەر بینینی (چارلز و کامیلا) پێکەوە، سەرەڕای نارەزایەتی و ڕێگرییەکانی (شاژنە ئەلیزابێس)ی دایک، دواتر تا دەهات کێشە و ناکۆکییەکانی ئەو خـانـەوادەی شاهانەیە لە سەر ئەو بابەتە دزەی دەکرد و دەگەیشتە میدیاکانی بەریتانیا، هەر ئەمەش بوو (شاژنە ئەلیزابێس)ی ناچار کرد دان بـەوەدا بنێت کە پێوەندییەکی خۆشەویستی دڵڕەقانە لە نێوان کوڕە عاشقەکەی و هاوڕێ

دێرینەکەیدا هەبوو، ئەوەش یەکەم دانپێدانانی ڕاستەوخۆ بوو بەو پێوەندییەدا لە لایەن (شاژنی بەریتانیا)وە ئەوەش لە میانەی ئاهەنگێکدا بوو کە ساڵی (2000) ڕێکخرابوو هەریەک لە (شاژنە ئەلیزابێس) و (کامیلا)ش تێیدا بەشداربوون.

چەند ساڵێک دواتر، تیشک خرایەوە سەر جۆر و داهاتووی پێوەندییەکەی نێوان (چارلز و کامیلا)، ئەوەش دوای ئەوەی بە مەبەست قڕوقەپ و بێدەنگی لێ دەکرا، ئەو پرسیارانەشی نەک تەنها (خانەوادەی شاهانە)، بەڵکوو هەموو بەریتانییەکانیشی بەخۆیەوە سەرقاڵکردبوو بریتی بوون لە وەی ئایا (شازادەی بەریتانیا) هیچ کاردانەوەیەکی بۆ خواستی دڵی دەبێت و لەگەڵ (کامیلای بێوەژن)دا هاوسەرگیری دەکات؟ تەنانەت ئەگەر هاوسەرگیریشیان کرد ئایا دەبێتە شاژنیان؟ ئایا هەستوسۆزی (شازادە هاری و شازادە ویلیام)ی کوڕەکانی (چارلز و دیانا) چی دەبێت؟ هەڵوێستی کڵێسای بەریتانیا چی دەبێت کە هاوسەرگیریکردنی (شازادە)ی لەگەڵ هەر بێوەژن و مێینەیەکی جیا بۆوەدا قەدەغە کردووە؟.

بەڵام لە کۆتاییدا، کۆشکی (کلیرنس هاوس) کە بارەگای ڕەسمی (شازادە چارلز) بوو ڕایگەیاند «شازادە چارلزی تەمەن (56) ساڵ و کامیلای تەمەن (57) ساڵ لە (8)ی ئەپریلی ساڵی (2007) دا هاوسەرگیری دەکەن»، بەڵام هاوسەری شازادە تەنها نازناوی (شازادەی دۆقەی کۆرۆنۆڵ)ی پێ دەبەخشرێت، نەک (شازادەی دۆقەی یورک) کە بە (دیانا) بەخشرابوو، بە هیچ شێوەیەکیش کامیلا نابێتە (شاژن)، بەپێی ڕاگەیەندراوێکی ڕەسمیش ئەگەر (شازادە چارلز)ی هاوسەری، لە دوای مردنی (شاژنە ئەلیزابێس)ی دایکی بچێتە سەر تەختی پادشایەتی،

ئەوا (کامیلا) نابێتە (شاژن)، بەڵکوو تەنها دەبێتە (شازادەی هاوسەری پادشا).

دیانا سپنسەری (شازادەی دڵەکان) لە (31ی ئابی ساڵی 1997)، لەگەڵ هاوڕێکەیدا (دودی فاید)ی کوڕی (محەمەد فایدی) ملیاردێر، لە شاری پاریس توشی ڕووداوێکی هاتوچۆ بوون و گیانیان لە دەستدا، لەو کاتەوە تا ئێستا چۆنیەتی ڕووداوەکە و هۆکارەکانی و شیکردنەوە جیاوازەکانیشی، بۆتە جێی سەرنج و بایەخی جیهان، چەندە وەک ڕووداوێکی هاتوچۆی ئاسایی باسی دەکرێت، هێندەش زیاتر (تیۆری پیلانگێڕی) لە نزیک ئەو ڕووداوە هەستی پێ دەکرێت، بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەو پێوەندییە خراپە، بێ گومان ئەوەش لە ڕوانگەی بەریتانییەکانەوە.

بە درێژایی ئەو چەند ساڵەی بە سەر گیانلەدەستدانی (شازادە دیانا)دا تێپەڕیوە، چەندین چیرۆک و بە سەرهاتی لە سەر دروستکراوە، جارێک وەک کەسایەتییەکی ئەفسانەیی و جارێکیش بۆ شێواندنی ناو و ناوبانگییەکەی، ئێستاشی لەگەڵدابێت ئەو هەوڵانە و ئەو جۆرە قسە و قسەڵۆکانە بەردەوامییان هەیە، دواترینیان فیلمە تۆمارکراوەکەی (جیمس هیوت)ی ئەفسەری پێشووی سوپای بەریتانیایە، کە بەستراوەتەوە بە چیرۆکێکی خۆشەویستییەوە لەگەڵ (شازادە دیانا) بە ناونیشانی (ددان پێدانانەکانی خراپێک)، کە شانازی بە پێوەندییەکەیەوە دەکات لەگەڵ (شازادە دیانا)دا، کە لە کۆتایی هەشتاکاندا دەستی پێ کردوە.

لەو فیلمەدا (هیویت)ی تەمەن (45) ساڵ، بە شێوەیەکی نەرێنی باسی ڕۆڵەکەی خۆی دەکات وەک کەسێکی بێزرا و لە نێو ڕۆژنامە میللی و ناوخۆییەکانی .بەریتانیادا، سەرکەوتوو نەبوو

له فرۆشتنەوە و بڵاوکردنەوەی لێدوان و قسە تایبەتییەکانی (شـــازادە دیـــانـــا)دا، کە بەهاکەی چەندین ملیۆن دۆلاربـــوو، (هیوت) بە پێکەنین و گاڵتەوە دەیگوت دەبێت لە لایەن (شازادە چارلز)ەوە ستایش و سوپاس بکرێت لەبەر ئەوەی کۆتایی بە هاوسەرگیرییەکەی هێنا لەگەڵ (دیانا)دا، هەروەها توانی هەموو کاتەکانی (دیانا) داگیر بکات و سەرقاڵی بکات، لە کاتێکدا (چارلز) سەرقاڵ بوو بە پێوەندییەکەیەوە لەگەڵ (کامیلا)دا.

هەر یەک لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان و (TV4)ی بەریتانیا، چەند بەشێکیان لەو فیلمە بڵاوکردەوە و دواتریش (TV4) کۆی فیلمەکەی پەخش کرد، کە بوە هۆی بێزارکردن و تووڕەکردنی خانەوادەی شاهانەی بەریتانیا، هەر وەک بوە هۆی بێزارکردن و توڕەکردنی هەر دوو (شازادە هاری و شازادە ولیام)، لە سەر بڵاوکردنەوەی ئەو شتانە لە سەر دایکییان، بەڵام نووسینگەی تایبەتی (شازادە چارلز) لە سەر ئەو بابەتە بێ دەنگی هەڵبژارد و هیچی نەگوت.

بەڵام هەر یەک لە هاوڕێ و خۆشەویست و هەوادارەکانی (شازادە کۆچکردوەکە)، ئیدانەی کار و هەڵوێست و قسەکانی (هیویت)یان کرد و بە (خۆشەویستێکی خائین) وەسفیان کرد، بەوەی لێرەولەوێ هەوڵیداوە سوودی تایبەتی لە پێوەندییەکەی لەگەڵ (شازادە دیانا) وەربگرێت، لە سەرەتادا ویستی ئەو نامانە بفرۆشێت و داوای (10 ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی) لێ کرد، وەک هەوڵێک بۆ خۆ ڕزگارکردن لەو مایەپووچییەی توشی هاتبوو، جارێکی تریش لە پشت بڵاوکردنەوەی دەنگۆیەکەوە بوو بەوەی (باوکی شازادە هاری)یە کە لە ئاستی سێیەم دایە لە ڕیزبەندیی میراتگریی تاجی شاهانەی بەریتانیادا، بەڵام دواتر

هەر خۆی ڕەتی کردەوە، ئەوەش وەک پیشاندانی نییەتباشی و قوربانیدانێک بۆ پێوەندییەک کە بۆ یەکەم جار لە ساڵی (1986) دا و دوای دوو ساڵ لە لە دایک بوونی (شازادە هاری) یەکتریان بینی، ئەو کاتە وەک ڕاهێنەرێکی ئەسپسواریی لای (شازادە دیانا) کاری دەکرد تا کۆتایی هاتنی پێوەندییەکە، پێشتر (هیوت) وەک فەرماندەی تانکی سوپای بەریتانیا لە جەنگی کەنداودا لە ساڵی (1991) لە خزمەتی سەربازییدا بوو.

لە لایەکی ترەوە و دوور لەو دەنگۆ و قسە و قسەلۆکانەی لێرەولەوێ لە پێناو ناشرینکردن و شێواندنی ڕوخساری کەسایەتی و ناوبانگی (دیانا)ی شازادەی دڵەکاندا، ئەو کارە مرۆڤدۆستی و خێرخوازی و هاوکارییانەی کە ببوە پاڵپشت و هاوکاریی هەژاران و نەخش و منداڵان، بوە بەربەست لە بەردەم ئەو دەنگۆیانەدا و هەوادار و لایەنگر و خۆشەویستەکانیشی، تا دەهات زیاتر خۆشیان دەویست و ئاستی جەماوەرییەکەشی زیاتر و پتەوتر دەبوو، هەر وەک لە سەر ئاستی جیهانیش ئەو کەسانەی (شازادە دیانا)یان خۆش دەویست و سەرسامی کار و کەسایەتییەکەی بوون، تا دەهات زیاتر دەبوو، لە کاتی گیانلەدەستدانیشییەوە تا ئێستا، شێواز و شوێنی ڕووداوەکە هێشتا مایەی پرسیار و گومان و بە دواداچوونە، هەندێک بە ڕووداوێکی ئاسایی هاتوچۆی دادەنێن و هەندێکی تریش پێیان وایە پیلان بوە و (خانەوادەی شاهانە)ش دەستیان تێیدا هەبوە.

هەڵبەت خیانەتی هاوسەرەکەی و وەک لە چاوپێکەوتنێکی تەلەڤزیۆنیشدا ددانی پێدادەنێت پێوەندییە سۆزداری و سێکسییەکانی لەگەڵ ژنانی تردا، وایان لە (شازادە دیانا) کردوە بیر لە پێوەندییەکی تری سۆزداری بکاتەوە لە دەرەوەی ژیانی

هاوسەرگیرییەکەی، لە هەریەک لەو پێوەندیانەشدا کە هەیبوە (شازادە دیانا) هەمیشە هەڵوەدای خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە بوە، چونکە پێش پێوەندییەکەی لەگەڵ (عیماد فاید)دا، پێشتر (شازادە دیانا) پێوەندییەکی سۆزداری هەبوو لەگەڵ پزیشکێکی پاکستانی نیشتەجێی لەندەندا بە ناوی (حەسنات خان) و ئومێدی زۆری هەبوو کە هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، بەڵام کێشەی گەورەی بەردەم ئەو هاوسەرگیرییە ئەوەبوو، کە (حەسنات خان) سەر بە بنەماڵەیەکی موسوڵمانی گەورە و دەسەڵاتداری پاکستان بوو، ڕێگەیان نەدەدا کوڕەکەیان هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێکی ناموسوڵماندا بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو ژنەش (شازادە دیانا) بێت، بەو هۆیەوە (شازادە دیانا) توشی جۆرێک لە دڵتەنگی و گۆشەگیری و تێکشکان بوو، چونکە لە دڵەوە و بە ڕاستی ئەو پزیشکە پاکستانییەی خۆش دەویست و دەیویست هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات.

لە هاوینێکی گەرمدا، (دیانا) بۆ ماوەی دوو ڕۆژ سەردانی پاکستانی کرد و چەند کار و پرۆژەیەکی خێرخوازی ئەنجامدا بۆ دروستکردنی (نەخۆشخانەی عومران خان)، لە نیوەڕۆخوانێکدا لەگەڵ (شەست) خاوەنکار و سەرمایەداری پاکستانیدا، بڕی هەزار دۆلاری لە هەریەکەیان وەرگرت بۆ تەواوکردنی نەخۆشخانەکە، بەڵام ئەو سەردان و مانەوە کورتەی لە پاکستان بە هەلزانی و سەردانی ماڵ و خانەوادەی خۆشەویستەکەی کرد، بەڵام بە بێ ئەوەی (حەسنات خان) ئاگاداری ئەو سەردانە بێت و بەوەش زۆر زۆر تووڕەبوو، هەروەها لە لایەن ڕۆژنامە ئینگلیزییەکانیشەوە هەڵمەتێکی گەورەی لە سەر دروستکرا بەوەی ناچاربکرێت تا هاوسەرگیری لەگەڵ (دیانا) بکات، هەر

لەبەر ئەوەش هەموو هەوڵێکیدا بۆ ئەوەی لەو پێوەندییە بچێتە دەرەوە و پاشەکشە بکات.

هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانی (دیانا) دەڵێن، (دیانا) دەیویست دەنگۆ و قسەوقسەڵۆکی پێوەندییەکەی لەگەڵ (عیماد فاید) زیاتر بڵاوبێتەوە و دەنگ بداتەوە، بۆ ئەوەی غیرەو ئیرەیی (حەسنات خـان) بجووڵێنێت و بگەڕێتەوە بـۆلای، چونکە ئـەو ڕێگا و میکانیزمە لە لایەن زۆرینەی ژنانەوە پەیڕەو دەکرێت، ئیتر ئەو ژنە (شازادە) بێت یان هەر ژنێکی ئاسایی و نەخوێندەوار، بەڵام بـارودۆخ و شتەکان بەو سادە و سانایيە نەبوون، لە ڕاستیدا هەندێک تایبەتمەندی و سیفات و هەڵس و کەوت لە (عیماد فاید)دا هەبوون، جێگەی ڕەزامەندی و سەرنج ڕاکێشی و خاڵی هاوبەش بوون بۆ (دیانا)، ئەویش وەک (دیانا) بە شێوەیەکی خێرا لە ڕووی سۆزدارییەوە پەیوەست دەبێت بە کەسی بەرانبەرەوە، وەک ئەویش حەزی لە سینەما و ئەستێرەکانی سینەما بوو، حەزی لە ڕۆیشتن و پیاسەی کەناری دەریا شینەکان بوو، چێژی لە تیشکی خۆر و ماچ گۆڕینەوە و وشەی سۆزداریی دەبینی. جیا لە هەموو ئەمانە (عیماد فاید) خاوەنی تایبەتمەندییەک بوو، کە لە پیاوێکی تردا نەبوو، ئەوەش ئەوە بوو هیچ کارێکی نەبوو تا پێوەی سەرقاڵ بێت، چوونکە باوکی سەرمایەدار و خاوەنکارێکی گەورە بوو، بۆیە پێویستی بە کار نەبوو، بەڵکوو هەموو کاتەکانی تەرخان کردبوو بۆ (دیانا) و هەمیشە لەگەڵیدابوو، تەنانەت ئامادەبوو هەموو کاتەکانی و هەموو سەروەتەکەشی لە پێناوی (دیانا)دا ببەخشێت و بیکاتە قووربانیی.

بـە پێی هـەنـدێـک زانـیـاریـی نـاو کـتـێـبـەکـەی هــەر دوو ڕۆژنامەنووسی ئینگلیزی (تیم کلیتۆن و فیل کریچ) بە ناونیشانی

(دیانای شازادە)، یەکەم پشووی سۆزدارییانەی نێوان (دیانا و عیماد) لە سەرەتاکانی مانگی یۆلیۆی (1997)دا بوو، کاتێک (دیانا) و هەر دوو کوڕەکەی (ویلیام و هاری) بانگهێشت کرد بۆ ڤێلایەکی گەورە لە سەر کەناری (لازۆردی) لە شارێکی بە ناوبانگی وەک (سان ترۆپیز)، لەو کاتەدا (دیانا) بۆ یەکەم جار، ژیانێکی سۆزداریی تەواوی لەگەڵ (خۆشەویستەکەی و منداڵەکانی) بە سەر برد، (عیماد) نەک بێزار نەبوو بە بوونی منداڵەکانی (دیانا)، بەڵکوو زۆریش ئاسودەبوو، کاتی زۆری لەگەڵ بە سەر بردن و یاری زۆریشی لەگەڵ دەکردن و لەگەڵ (هاری) بچووکیشدا پێکەوە مەلەیان دەکرد، ئەو ماوەیە ژیانێکی زۆر خۆش و نموونەیی و پڕ لە سۆز و خۆشەویستی دەژیان، تا ئەو کاتەی ڕۆژنامە فەرەنسییەکان پێیان زانین و بە دزییەوە چەند فۆتۆیەکییان گرتن و بە چەند هەزار دۆلارێک فرۆشتیان و بڵاویان کردنەوە.

دواتر (دیانا) گەڕایەوە بۆ لەندەن و لە ڕۆژی (10)ی یۆلۆیۆدا بە (حەسنات خان)ی خۆشەویستی پێشووی گوت، کە دەیەوێت کۆتایی بەو پێوەندییە بهێنێت لەگەڵیدا، لەو ماوەیەشدا لە لایەن (عیماد فاید)ی تازە خۆشەویستییەوە، ڕۆژانە گوڵ و دیاری گرانبەها دەنێردرا بۆ کۆشکەکەی (دیانا)، ئیتر لێرەوە پێوەندییە سۆزدارییە گەرموگوڕەکەیان دەستی پێکرد کە بە ڕووداوی هاتوچۆکە کۆتاییهات، لە کاتی پێوەندییەکەیاندا (عیماد فاید) تەمەنی (41)ساڵ بوو، زۆرینەی کاتەکانی تەمەنی بە خەرجکردنی پارەکانی باوکی لە پێناوی هاوڕێیەتی و پێوەندی لەگەڵ ژنی جوان و بە ناوبانگ و کڕینی ئۆتۆمبێلی گرانبەها و بەرهەمهێنانی سینەماییدا بە سەر دەبرد، بە هەموو مانا و

پێوەرێک وەک (کەسێکی ملیاردێر) دەژیا، لە لایەن هاوڕێ ئەمریکییەکانیەوە بە کەسێکی باش و دڵباش و سەرنج ڕاکێش وەسف دەکرێت، هەروەها لە کاتی قسەکردنیشدا حەزیان دەکرد گوێی لێ بگرن.

پێش ئەوەی (دیانا) بناسێت، (عیماد فاید) لە شووقە پاریسییە گرانبەهاکەیدا دەژیا، لەگەڵ هاوڕێ کچە ئەمریکییەکەیدا بە ناوی (کیلی فیشەر) کە نمایشکاری جلوبەرگ بوو، پێوەندییەکەشیان تەنها (8 مانگ)ی خایاند.

پێش ئەویش (عیماد) هاوسەرگیری لەگەڵ نمایشکارێکی تری جلوبەرگدا کردبوو بە ناوی (سوزان گریفارد) و ئەویش هەر هەشت مانگ درێژەی کێشا و جیا بوونەوە، دیارە ئەم جیا بوونەوە و پێوەندییە کورتانە، لە نێو دەوڵەمەند و ئەستێرەکاندا شتێکی ئاسایی و باوە، چوونکە زوو توشی بێزاری و مەلەل دەبن و حەزیان لە گۆڕین و تازە کردنەوەیە.

(دودی) لە ساتەوەختی هاوسەرگیریکردندا بوو لەگەڵ (کیلی فیشەر)، کاتێک لەگەڵ (دیانا)دا یەکتریان ناسی، ئەگەر ئەو یەکترناسینەش نەبوایە، ئەوا بەئامادەبوونی خانەوادەکەی لە لۆس ئەنجلس، هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ئەمریکییەدا دەکرد، کە ماوەیەکی زۆر بوو پلانیان بۆ دانابوو، بەڵام لە (26ی یۆلیۆی 1997)دا، (شازادە دیانا) لەگەڵ خۆشەویستە نوێیەکەیدا (عیماد فاید) چوە پاریس بۆ ئەوەی کاتێکی خۆش بە سەر ببات، لەو گەشتەیدا (دیانا و فاید) لە یەکێک لە گرانبەهاترین و مۆدێرنترین هۆتێلەکانی ئەو شارە دابەزین، کە هۆتێل (ڕیتز) بوو لە نزیک گۆڕەپانی (فاندۆم)، خەڵکێکی زۆریش (دیانا و فاید)یان بینی کاتێک دەستلەناودەست بە هێمنی لە سەر کەناری (ڕووباری

سین) پیاسەیان دەکرد، ئەمەش لە کاتێکدابوو کە پێوەندییەکەیان گەیشتبوە قۆناغێکی ئاشکراوە، لە دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار لە (سان تروبیز) یەکترییان بینی.

دوای ماوەیەک، (دیاناو فاید) بە بێ (هاری و ولیام)، ڕوویانکردە شارێکی قەشەنگ و ڕازاوەی سەر کەناری (لازۆردی) بۆ بە سەر بردنی دوەم پشوویان، بەڵام ئەم جارە بە شێوەیەکی ئاشکرا و ڕێگەشیان بە پەیامنێران و فۆتۆگرافەرەکاندا وێنەیان بگرن، بە تایبەتی کاتێک (دیانا و فاید) لە سەر بەلەمێک لە باوەشی یەکتردابوون و یەکیان ماچ دەکرد، ئەوەش بۆ ئەوەبوو تۆڵە لە (حەسنات خان)ی دۆستەکۆنەکەی بکاتەوە و سەر لە نوێ غیرە و ئیرەییەکەی بوروژێنێت، چونکە تا ئەو کاتەش خۆشی دەویست و حەزی دەکرد بگەڕێتەوە بۆلای.

بۆچوونێکی تریش هەبوو پێی وابوو مەبەستی (دیانا) لە گرتن و بڵاوبوونەوەی ئەو وێنانە، بە تایبەتی کە بە (مایۆ)ی مەلەوانییەوە لەگەڵ (عیماد فاید)ی خۆشەویستیدا دەردەکەوتن و زۆرینەی ڕۆژنامەکانی جیهانیش بڵاویان کردەوە، بێزارکردن و تورەکردنی (شـازادە چارلز) بـوو، کە چەندین جـار هەم خیانەتی لێ کردبوو هەمیش بێڕێزی زۆری بەرانبەر کردبوو، بەڵام لەو کاتەدا (چارلز) کەوتبوە داوی خۆشەویستی (کامیلا) وە و بڵاوکردنەوەی ئەو وێنانەش هیچ شتێکی لای (چارلز) نەگۆڕی و هیچ هەستێکی لا دروست نەکرد.

بۆیە دەکرێت لێرەدا بڵێین ئەگەر (عیماد فاید) لە (دیانا) نزیک نەبوایەتەوە، بێ گومان توشی ئەو هەموو دەردەسەری و کێشە زۆرانە نەدەبوو، ئەو کاتە نەیدەزانی نزیکبوونەوە و پێوەندی لەگەڵ کەسێکی بە ناوبانگی وەک (دیانا)، بەو جۆرە

کێشە و سەرئێشەی گەورەی بۆ دروست دەکات، بە ڕادەیەک کە ئەنجامەکەی باجێکی زۆریدا، بەوەی ژیانی لە پێناوی پێوەندییەکدا دانا، کە ئەوپەڕەکەی مانگێک یان دوومانگ یاخود کەمێک زیاتری خایاندبێت.

لێرەدا، پرسیار و گومانی زۆر لە سەر ئەو ڕووداوی هاتوچۆیە هەیە کەبوە هۆی لە ناوچوون و گیانلەدەستدانی دوو کەس، ئایا ئەو ڕووداوە ڕووداوێکی ئاسایی هاتوچۆ بوو، یاخود پیلانگێڕی بوو؟ تا ئێستا هیچ کەسێک نازانێت هۆکاری ڕاستەقینەی ڕووداوەکە چی بوە، (محەمەد فاید)ی خاوەنکاریی میسری و باوکی (عیماد)، باوەڕی بە تەندروستی و ڕاستی هیچ چیرۆکێکی ڕەسمی نەکرد سەبارەت بە هۆکار و چۆنیەتی مردنی (کوڕەکەی و دیانا)، ئەگەرچی بە شێوەیەکی ڕەسمی، لە دوای دوو ساڵ لە ڕووبەڕووبوونەوە، جەنگێکی یاسایی لە بەردەم دادگای فەڕەنسادا دۆڕاند، بەڵام سوورە لە سەر ئەوەی ئەو کارە پیلان و بەرنامە بۆ دارێژراوبوو لە لایەن دەزگای هەواڵگری بەریتانیاوە، ئەمەش بەو مانایەیە کە هەندێک لە کارمەندەکانی هۆتێلە گرانبەهاکەی (ڕیتز) بەجۆرێک لە جۆرەکان پێوەندییان بەو دەزگایەوە هەیە، هەندێک لە شارەزایانی تریش دەڵێن (شازادە دیانا و هاوڕێ میسرییەکەی)، بە بەردەوامیی و بەخێرایی پلانەکانیان دەگۆڕی، بەجۆرێک ئاستەم بوو دەزگای هەواڵگری بەریتانیا لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بتوانێت پیلان بۆ کوشتنیان دابڕێژێت و جێبەجێی بکات، زۆرینەی کات هاوەڵەکانیان ئاگادار دەکردەوە لەوەی کە شەو لە هۆتێل (ڕیتز) دەمێننەوە و دەخەون، یان دەیانگوت دەچن بۆ شوقەکەی (عیماد فاید) لە شەقامی (شانزەلیزێ)، هەندێک کاتیش بڕاردەی سێیەمیان پێ دەگوتن کە لە هەر جێیەکی تر بمانایەتەوە و پشوویان بدایە، بەڵام پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە

ئەو هەموو شوێنگۆڕکێ و دەستکارییکردن و گۆڕانکارییکردنە لە شوێنی مانەوەیاندا لەبەر چی بوە؟ ئایا هەستیان بە هیچ شتێک کردبوو؟ ئایا دەترسان لەوەی تیرۆر بکرێن؟ دوای ئەو هەموو ساڵە لە گیانلەدەستدانیان هێشتا دەیان پرسیاری تری لەم جۆرە بوونیان هەیە و داوای وەڵامدانەوەیان دەکرێت.

بەم جۆرە (دیانا) بوە نێچیری ئەو شۆکەی لە هاوسەرەکەیەوە توشی بوو کە خۆشی دەویست، ڕووبەڕووی بوومەلەرزە و بەرکەوتنێکی قورس بۆوە، کەوای لێ کرد ڕێگەیەکی هەڵە هەڵبژێرێت و بە خیانەت وەڵامی خەیانەتی هاوسەرەکەی بداتەوە، لە ژێر چەتر و سێبەری هەستوسۆزیدا کە پێویستی بە سۆزێکی گەرم هەبوو کە لەگەڵ (چارلز)دا لەدەستی دابوو، کاتێک سەرقاڵ بوو بە پێوەندییەکەیەوە لەگەڵ (کامیلا) دا.

سەرەڕای ئەوەی لە ئێستا و ڕابردوودا گوتراوە و ئەوەشی لە داهاتوودا لە سەری دەگوترێت و دەنووسرێت، بەڵام یەک ڕاستی حاشاهەڵنەگر هەیە، ئەویش ئەوەیە سەرەڕای ئەو هەموو جوانی و سەرنج ڕاکێشی و دەوڵەمەندی و مرۆڤ بوونەی هەی بوو، بەڵام لە ژیانیدا ئەوەی دەستنەکەوت کە شایستەی بوو، لە ژیانیدا باجی ئەو چەند ساتە (خۆشەویستی و عیشق) ەی دا، کە پێی وابوو لە بێ ئاگایی ڕۆژگاردا دزی بوونی، بەو نیگا گەرمانەی دەسووتان و خاڵی نەبوون لە پاکێتی و بێ تاوانی، (دیانا) بۆ یارمەتیدان و سوود گەیاندن بە خەڵک وەک بروسکە وابوو، بەڵام بێ بەش بوونی لە خۆشەویستی ناچاریکرد بە هەموو هێز و تواناو قورساییەوە خۆی فڕێ بداتە هەر پێوەندییەکەوە کە پێیدا تێ دەپەڕی، لە هەر دیدار و ژوانێکیدا هەنگاوی خێراتری دەنا بۆ گەیشتن بەو کەسەی لە پێناوی تۆزێک خۆشەویستیدا، سێکسی لەگەڵ دەکردن، ئەمەش

له پاڕانەوە دەچوو، بۆ ئەوەی بی پارێزێت و هەستوسۆزی پێ بدات و له ژێر سێبەری پیاوەتییەکەیدا بیشارێتەوە.

(ئەندرۆ مۆرتون) له کتێبەکەیدا به ناونیشانی (دیانا به دوای خۆشەویستیدا گەڕا) چەندین نهێنی نوێ له سەر ئەو پیاوانه ئاشکرا دەکات، که (دیانا) خۆشی ویستوون و پێوەندی هەبوە لەگەڵیاندا، جەختیش دەکاتەوە که (دیانا) به دوای خۆشەویستییەکی ڕاستەقینه و ئەبەدی و هەمیشەییدا گەڕاوە.

(ئەندرۆ مۆرتۆن) کتێبی یەکەمیشی به ناوی (دیانا، چیرۆکه ڕاستەقینەکەی) تایبەت بوو به ژیانی تایبەتی (شازاده دیانا)، ئەو کتێبه له ساڵی (1992)دا چاپ و بڵاو کرایەوە و یەکێک بوو له کتێبه پڕ فرۆشەکان له سەر ئاستی جیهان.

(شازاده دیانا) لەگەڵ (کاپتن جیمس هیویت)ی ڕاهێنەری ئەسپ سواریدا، که نامه سۆزدارییەکانی (دیانا)ی له بەرانبەر بڕێک پارەدا فرۆشت به ڕۆژنامەکانی بەریتانیا، جۆرێک له پێوەندی تایبەتی هەبوو له نێوانیاندا.

(ئۆلیڤەر هور)ی تەمەن (48 ساڵ) و شارەزای هونەر، یەکەمینی ئەو پیاوانەیه که (ئەندرۆ مۆرتۆن) له کتێبەکەیدا ناوی هێناوون، به پێی کتێبەکەی (مۆرتۆن) پێوەندییەکەی نێوان (دیاناو هور) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1993)، واتا نزیکەی دووساڵ دوای کۆتاییهاتنی پێوەندییه ئاشکراو به ناوبانگەکەی لەگەڵ (جیمس هیویت)ی ڕاهێنەری ئەسپسواریدا.

(شازاده دیانا) به دڵێکی شکاو و ناوبانگییەکی زڕێندراو و دەروونێکی ماندووەوە لەو پێوەندییه هاتە دەرەوە، وەک ئەستێرەناس و گەردووناسەکەشی باسی کردوە، ئەو پێوەندییە، ئەزموونێکی زۆر ئازاراوی بوو به لای (دیانا)وە.

(هور) دەرچووی کۆلێژی ئایتونی بەریتانیای ناوداربوو، کەسایەتییەکی دیاری هەبوو لە ناوەندە ڕۆشنبیرییە ئینگلیزییەکاندا، بە گوێ هەستیار و چێژبەخشەکەی ناسرابوو، حەزی لە ژیانێکی خۆش گوزەران و ئاسودە دەکرد و هیچ ئارەزووییەکی نەبوو بۆ ئەو جۆرە کاروپیشانەی، پێویستی بە هەوڵ و ماندوبوون و تێکۆشانی زۆر هەبوو، یەکێک بوو لەو کەسانەی ئاگای لە وردەکاریی پێوەندییەکەی (شازادە چارلز) و (کامیلا کامبەرز) بوو، هەر لەوێشەوە ئەم پێوەندییە سۆزدارییەی لەگەڵ (شازادە دیانا) دروستکرد.

کاتێک پێوەندییەکەیان دەستی پێ کرد، کە (شازادە دیانا)، بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری و دەربڕینی هاوخەمی و وەرگرتنی زانیاریی لە سەر پێوەندییەکەی (چارلز و کامیلا) هانای بۆ دەبرد، ئەگەرچی (هور) هاوسەریشی هەبوو، بەڵام سەرکەوتووبوو لە ڕاکێشانی هەستوسۆزی (دیانا) و خۆی وەک بەرپرس لە هەستوسۆز و ئیرادەی (دیانا) پیشان دەدا.

بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێک، (دیانا و هور) لە ماڵی هاوڕێ هاوبەشەکانیاندا یەکترییان دەبینی، یاخود لەو ژوورەی (دیانا) ڕاهێنانە وەرزشییەکانی تێدا دەکرد، چاوی بە (هور) دەکەوت، لەو بارەیەوە (کارولان براون)ی ڕاهێنەری وەرزشی (دیانا) باسی لەوەکردوە، کە (هور) زۆرترین کات چۆتە ژووری ڕاهێنانە وەرزشییەکانی (دیانا) و چەند جارێکیش لە دۆخی سۆزداری و ڕۆمانسیدا بینیونی، (براون) گوتوشیەتی زۆرینەی جارەکان (شازادە دیانا) وریایانەتر مامەڵەی دەکرد و وەڵامی هەستوسۆزەکانی (هور)ی دەدایەوە.

(شازادە دیانا) بە دروستی و ئەمانەت و ڕاستگۆییەوە باسی لە دروستیی پێوەندییەکەی لەگەڵ (هور)دا بۆ (لیدی بوکەر)ی

هاوڕێی درکاندوه، جاری دواتریش (دیانا) باسی لەوەکردوه بە شێوەیەکی زۆر جدی مامەڵە لەگەڵ پێوەندییەکەی خۆی و (هۆر) دەکات، هەروەک لە بەردەم (لیدی بووکەر)دا هیواشی خواستوه کە لەگەڵ (هور)دا هاوسەرگیری بکەن و ڕوو بکەنە (ئیتالیا) و لەوێ بژین، حەزیشی کردوه لەگەڵ (هور)دا خوشک و برایەکی تر بۆ (هاری و ولیام) دروست بکەن.

(هـور) لە ئۆکتۆبەری ساڵی (1993) دا لە هاوسەرەکەی جیابۆوه و لە ماڵی یەکێک لە هاوڕێکانیدا دەژیـا، بـەڵام بە شێوەیەکی زۆر خێرا یاساوڕێساکانی یارییەکە گۆڕانکاری بە سـەرداهـات، کاتێک (هـور) لە ژنەکەی جیابۆوه و ئـازاد بوو، (دیانا) هەستی بە دڵەڕاوکێ و کاریگەرییەکانی دوورکەوتنەوه دەکـرد، ئەو ژیانی سۆزداریی لە سەر بنەمای پێشبینیکردن بۆ داهاتوو دا دەڕشـت، کە زۆرینەی جارەکان بە نائومێدی و دڵشکان کۆتایی دەهات، ئەو بە خەمێکی قووڵەوه بە دوای خۆشەویستی دا دەگەڕا و بە هەموو برینەکانییەوه تامەزرۆی بە دەستهێنانی بـوو، بـەڵام دڵنیابوو لـەوەی هیچ کـات ئەو خۆشەویستییە نادۆزێتەوه و ئەگەر بیشیدۆزێتەوه ئەوا ناتەواو دەبێت و پێوەندییەکی خۆشەویستی کامڵ نابێت.

لە گفتوگۆیەکیشیدا لەگەڵ (جیمیس کولساریست)ی پزیشکی نەشتەرگەر و هاوڕێی دێرینیدا، (شـازادە دیانا) ددانـی نابوو بـەوەی هەست بە ترس و دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکـات کاتێک هەست دەکـات ئـەو پیـاوەی لەگەڵیدا دەچێتە دەرەوه، زۆر پەیوەستە پێیەوه و خۆشی دەوێت، باسی لەوەشکردوه کاتێک لە کەسانی ترەوه دەبیستێت کە فلان پیاو یان فیسار پیاو شێتانە خۆشی دەوێت، یەکسەر هەست دەکات کە دەبێت لێی ڕابکات و

لێی دوور بکەوێتەوە، ئەوەش بە تەواوی لەگەڵ (هور)دا ڕووی دا، کاتێکیش (هور) هەستی بە نائومێدی کرد لەساڵی (1994)دا گەڕایەوە لای هاوسەرەکەی پێشووی، لەو کاتەدا (دیانا) هەستی بە هیچ گەرمووگوڕییەک نەکردوە بەرانبەر (هور) و پێی وابوە کاتەکە گونجاو نەبوە بۆ ئەو پێوەندییە، بەڵام دڵتەنگ و غەمناک بوو.

ئەوەی لەو کاتەدا زیاتر لە هەر شتێکی تر ئازاری (دیانا)ی دەدا، ئەوەبوو کە دەیزانی پێوەندییە نایاسایی و ناشەرعییەکەی (شازادە چارلز)ی هاوسەری لەگەڵ (کامیلا کامبەر)دا زۆر گەرمووگوڕ و بە تین بوو، هەموو ئەوانەی چوار دەوریشی دەیانزانی و ئاگایان لەو دۆخە هەبوو، کاتێکیش (مۆرتۆن) لە کتێبەکەیدا باسی ئەم بابەتەی کردوە، (دیانا) چەند نامەیەکی داوەتێ کە (کامیلا) بۆ (چارلز)ی نووسیوە و ناردوە.

هەر چەندە (دیانا) بەردەوام ڕووبەڕووی هاوسەرەکەی دەبۆوە لە سەر پێوەندییە سۆزدارییەکەی لەگەڵ (کامیلا) و چەند جارێکیش لای (شاژنی بەریتانیا) سکاڵای کرد، بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو، بۆیە (دیانا) بەردەوام بوو لە سەر هەوڵدان بۆ دەستکەوتن و دۆزینەوەی بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگر، کە بیسەلمێنێت (شازادە چارلز)ی هاوسەری لەگەڵ (کامیلا) دا خیانەتی هاوسەری لێ دەکات، هەر چەندە (دیانا) لە ناخەوە ئومێدی دەخواست هیچ کاتێک بەڵگەیەکی لەو جۆرەی دەستنەکەوێت و نەیدۆزێتەوە، بەڵام چەند نامەیەکی سۆزداری و گەرموگوڕی پڕ لە خۆشەویستی (کامیلا)ی کەوتە دەست، کە بۆ (شازادە چارلز)ی ناردبوو، جگە لە چەند کارتێکی بۆنەکانیش، (دیانا) بۆخۆی دووپاتی کردەوە (کامیلا) لەو

نامانەدا دەستەواژەی (خۆشەویستە دەگمەن و بە نرخەکەم)ی بە کار هێناوە و نووسیویشێتی کە (یەکەم ژنە بەو جۆرە مێردەکەی خۆش بوویت).

(مۆرتۆن)ی نووسەری کتێبەکە، زۆر بە تایبەتی پشکنین و شیکردنەوەی بۆ هەموو نامەکانی (کامیلا) کردوە، بۆی دەرکەوت کە (کامیلا) هیچ بۆنە و یادێکی فەرامۆش نەکردوە و تێیدا نامەیەکی بۆ (شازادە چارلز )ناردوە، (کامیلا) هەموو بۆنەکانی دەقۆستەوە بۆ ئەوەی نامەیەکی بۆ بنووسێت و تێبینییەکی لە لا بە جێ بهێلێت، جارێکیان لە نامەیەکی زۆر کورتدا کە لە (WC) نووسیبووی، (کامیلا) ئەو شەوە ڕۆمانسییەی بیر (چارلز) خستبۆوە کە لە ماڵی هاوڕێیەکییاندا لە گوندێکدا بە سەریان بردبوو، نووسیبووشی بە تەنها ئەو خاوەنی کلیلی ڕۆح و دڵییەتی، هەروەک باسی لەوەشکردبوو کە چیتر توانای ئەوەی نەماوە نواندن بکات، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی دەیەوێت لە مێردەکەی جیا ببێتەوە.

لە نامەیەکی دوورودرێژیشدا بۆ (چارلز)، (کامیلا) نووسیبووی زیاتر لە هەر کەسێکی تر خۆشی دەوێت، ئەو کاتانەشی بۆ دیاری کردبوو، کە دەبنە هاوسەر و لەگەڵ منداڵەکانیاندا دەچنە دەرەوە، (کامیلا) ئامۆژگاری (چارلز)یشی کردوە بەوەی دەستبەرداری هەستوسۆز و هەستکردن بە گوناە بهێنێت و کۆتایی بهێنێت بە ڕاگرتنی هەستوسۆزی ئەو بوونەرە بێ نرخە (مەبەستی لە دیانا بوە)، لە کۆتایی نامەکەشیدا نووسیوویتی خۆشەویستە دێرین و دڵسۆزەکەت.

لە سەرەتای هاوینی ساڵی (1995)دا، (دیانا) سەرنج و گرینگییەکی زۆریدا بەو پزیشکی دڵەی کە پاکستانی بوو

(حەسناوات خان)، لە میانەی سەردانێکیدا بۆ لای هاوسەری یەکێک لە هاوڕێکانی کە لەو نەخۆشانەیە لە لایەن ئەو پزیشکە پاکستانییەوە نەشتەرگەری دڵی بۆ کرابوو، چاویان بە یەکتر کەوت.

بەپێی قسەی یەکێک لە هاوڕێکانی، هەر لە یەکەم نیگاوە (دیانا) کەوتۆتە داوی عیشق و خۆشەویستی ئەو پزیشکە پاکستانییەوە و توشی دڵەڕاوکێ و نائارامییەکی زۆر بۆتەوە و کۆنترۆڵی بە سەر ڕەفتار و دەروونی خۆیدا نەماوە.

ئەو کەسانەی کە (حەسناوات خان)یان دەناسی، پێیان وابوو کەسێکی شیاو نییە بۆ پێوەندییەکی سۆزداری و خۆشەویستی لەگەڵ (شازادە دیانا)، لەبەر ئەوەی کەسێکی قەڵەوە و ئالودەی کێشانی جگەرەیە و جگە لەو مووچەیەی وەری دەگرێت خاوەنی هیچی تر نییە، بەڵام (دیانا) هیچ یەک لەو شتانەی بە لاوە گرینگ نەبوو، بەڵکوو تەنها حەزی بە کەسایەتییە شەرمنەکەی و پارێزگارییەکەی و سروشتی کارەکەی نەبوو وەک پزیشک، لە ڕاستیدا (حەسناوات خان) پزیشکێکی نەشتەرگەری شارەزا و بە توانا و بە ئەزموون بوو، بایەخی زۆری دەدا بە نەخۆشەکانی، هەر ئەمەش لە سەرەتادا سەرنجی (شازادە دیانا)ی ڕاکێشا، چەند جارێک هەست بەوەکراوە لە کاتێکدا (دیانا و حەساناوات) کە پێکەوە دەچوونە دەرەوە قژێکی بارۆکەی بە کار دەهێنا، چەند جارێکیش لە چێشتخانەیەکی نزیک ماڵی خۆیان بینرابوون کە ماسییان دەخوارد، ئەمەش جگە لەوەی سەرنجێکی زۆری چوە سەر ئەو تەفسیری قورئانانەی لە کتێبخانە بچووکەکەی ماڵەکەیدا هەبوو، لەو بەشەی کە ناونرابوو بەشی مەعریفە.

هەندێک لە کەسە نزیکەکانی تەئکیدیانکردۆتەوە (دیانا) بە جدی بیری لە وەدەکردەوە هاوسەرگیری لەگەڵ (حەسناوات خان) بکات، هیچ سڵیشی نەکردەوە لەوەی بە هەر دوو کوڕەکەی (هاری و ویلیام)ی بناسێنێت، لە ناخیشیدا ئەو حەزوئارەزووەی شاردبۆوە، کە دەیویست ببێتە (خانمی حەسناوات خان) و منداڵێکی ئەسمەر بهێننە دونیاوە و پلانیشی دانابوو ناوی بنێت (ئەلجیرا)، بەڵام لەم جارەشیدا وەک هەر جارێکی تر، (دیانا) توشی فشار و بێ تاقەتی و نائارامییەکی زۆر دەبۆوە، چونکە (حەسناوات خان) زۆر سەرقاڵ بوو، زۆر جار نەی دەتوانی وەڵامی پێوەندییە تەلەفونییەکانی بداتەوە لەبەر ئەوەی لە ژووری نەشتەرگەری بوو، (دیانا)ش بەمە زۆر نیگەران دەبوو، بە هۆی گریانی زۆریشییەوە توشی سستی و لەرزین دەبوو.

لە نۆڤەمبەری ساڵی (1998)دا، ڕۆژنامەکان کەوتنە نووسین و بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە سەر پێوەندییەکەی نێوان (شازادە و پزیشکە پاکستانییەکە)، (شازادە دیانا) هەوڵی زۆریدا ئەو پێوەندییە بشارێتەوە و وای پیشان دەدا، کە بوونی پێوەندییەکی ڕۆمانسی لە نێوانیاندا مایەی پێکەنینە، ئەمەش (حەسناوات خان)ی زۆر توڕە و نیگەران کرد.

لە هەمان ساڵدا بە شێوەیەکی ڕەسمی هەواڵی جیا بوونەوەی (شازادە چارلز و شازادە دیانا) ڕاگەیەندرا، بەمەش ڕێگەکە لە بەردەمیاندا بە تەواوی کرایەوە و چۆڵ بوو، بۆ ئەوەی پێوەندییەکەیان ئاشکرابکەن، بەڵام وایان نەکرد، چونکە خۆشیان جیا بوونەوە و پێوەندییەکەیان کۆتایی هات.

دواین پیاو، کە (شازادە دیانا) خۆشی ویست و پێوەندی

هەبوو لەگەڵی دا (عیماد فاید)ی ناسراو بە (دودی)بـوو، کە کوڕی (محەمەد فاید) ملیاردێری میسری و خاوەنی مارکێتی بە ناوبانگی (هارودز)ی لەندەنی بوو.

(بینی سەورنتۆن)ی ئەستێرەناس و گەردوونناسی تایبەتی (شـازادە دیانا) لە بارەی پێوەندییەکەیانەوە و دوای بینینی وێنەیەکییان گوتی ئاشکرایە کە ئەوەی لە نێوانیاندایە بە تەنها خۆشەویستی نییە، بەڵکوو جۆرێکە لە خـەم، گوتیشی هەر مێینەیەک ئەو وێنەیەیان ببینێت هەمان هەست و بیرکردنەوەی دەبێت.

لە ڕاستیدا (عیماد فاید) یاخود (دودی)، بە کەسێکی بەڕێز و خاوەن ڕەوشتی بەرز و بەخشندە وەسفدەکراو ناسرابوو، (دودی) هەروەک باوکی لە چوارچێوەیەکی دیاریکراو و تەنراو بە ڕێکار و ڕێوشوێنی ئەمنی توند دا دەژیـا، بە هاوڕێیەتی پاسەوانێکی زۆر سـەردانـی ئەملاو لای دەکـرد، هەندێک لە هونەرمەندانی وەک (برۆک شیڵدز) و (میمی ڕۆجەرز) دەیانگوت کەسێکی زۆر هەستیار و بـە سـۆزە و هەمیشە ڕەچـاوی هەستوسۆزی کەسانی تر دەکات.

وەک دەشزانین و لە سەرەتاشدا چەند جارێک باسمان کرد (عیماد فاید) وەک بەرهەمهێنەری فیلمی هۆلیود لە ئەمریکا کاری دەکرد، فیلمی (ئۆتۆمبێلی ئاگر) کە (فاید) سەرپەرشتی بەرهەمهێنانی کردبوو لە فێستیڤاڵی ئۆسکاری ساڵی (1986)دا خەڵاتی تایبەتی بە دەست هێنا.

دوای گیانلەدەستدانی (دیـانـا)، (فـرانـک جیلی) قەشەی ئەبرەشییەکان کە (دیـانـا)ش سـەر بـەو پـەیڕەوە بـوو، باسی لـەوەکـردوە (دیانا) دانیناوە بـەوەی (دودی) خۆش ویستوە،

هەروەک پرسیاری ئەوەشی کردوە ئایا دەتوانێت لە کڵێسایەکی مەسیحی ئینگلیزیدا هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکی موسوڵمان دا بکات، پێوەشی دیاربوو، چەندە خۆشی دەوێت و چەندەش ئاسوودەیە لەگەڵیدا، ئەو قەشەیە جەختیشیکردەوە ئەگەر ئێستا لە ژیاندا بوونایە بێ گومان هاوسەرگیریان لەگەڵ یەکتردا کردبوو.

(ڕۆزا مۆنکتۆن) کە یەکێک بوو لە هاورێ نزیکەکانی (شازادە دیانا) و دوو هەفتە پێش ڕووداوی گیانلەدەستدانەکە، بە گەشتێکی کورت چووبوونە یۆنان، باس لەوە دەکات کە (شازادە دیانا) بە ڕاستی (عیماد فاید)ی خۆش دەویست، ئەوەشی زیاد لە هەر شتێکی تر سەرنجی ڕاکێشابوو گرینگی پێدان و سوربوونی بوو لە سەر دڵخۆشکردن و ئاسوودەکردنی (دیانا).

ئەوەی گرینگە ئەوەیە، دوای زنجیرەیەک لە ئابڕووچوون و خیانەت، لە کۆتاییدا پەردە لە سەر هاوسەرگیری یەکێک لە دیارترین و بە ناوبانگترین و بێ ئابڕووترین چیرۆکەکانی خۆشەویستی جیهان لابرا، کە لە نێوان (شازادە چارلز)ی شازادەی جێنشینی بەریتانیا و (کامیلا بارکەر)ی خۆشەویستە ئەڵماسییەکەیدا هەبوو، ئەو چیرۆکی خۆشەویستییە ئێستا تەمەنی نزیکەی (سێ دەیە)یە و ئەگەر هەر لە سەرەتاوە بە هاوسەرگیری کۆتایی بهاتایە، ئێستا گەنجێکی بەهێز و بە توانا لە بەردەمماندا دەوەستا و ئامادەبوو بۆ هاوسەرگیریکردن، بەڵام لە کۆتاییدا ئیتر ئەوە چارەنووسە و دەبێت قەبووڵ بکرێت.

له ساڵی (1929)دا (ئیڤا براون) کچێکی زۆر جوان بوو، تەمەنی لە (17) ساڵ تێ نەپەڕیبوو، کەسێکی دڵباش و ساویلکە بوو، بەڵام خواست و ئومێدی زۆری هەبوو، لە خێزانێکی کاسۆلیکی باڤاری خانەدان گەورە بووبوو، کچێکی زۆر هۆشیار و بە ئاگا بوو، خوێنگەرمی و سەرنج ڕاکێشییەکەی پیاوی بۆلای خۆی ڕادەکێشا، (ئیڤا) سەرەتا لە دووکانێکی وێنەگرتن لە ناوچەی بوهیمی لە میونشن کاری دەکرد، تا ئەو کاتەی لە یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (1929)دا (ئەدۆلف هیتلەر) چوە ژیانییەوە، دواتر (ئیڤا) ئەوەی بە سەریدا هات و لە ژیانیدا ڕووی دا بەم جۆرە بۆ (ئیلزا)ی خوشکی باس کردوە» بە سەر پەیژەکەدا سەرکەوتم بۆ ئەوەی دەستم بگاتە ئەو دۆسیێیانەی لە بەشی سەرەوەی کۆگاکە هەڵچنرابوون و فڕێ درابوون، لەو کاتەدا خاوەن کارەکەم هاتە نێو دووکانەکە، پیاوێکیشی لەگەڵدابوو کە سمێڵی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و مایەی پێکەنین بوو، پاڵتۆیەکی ئینگلیزی لەبەر دابوو کە ڕەنگەکەی دیارنەمابوو، کڵاوێکی خوریشی بە دەستەوە گرتبوو، دەمویست بە دزییەوە بەرەوڕوویان بڕۆم و سەیریان بکەم، بەڵام هەستم کرد ئەو پیاوەی، کە کەسایەتییەکی نامۆ و سمێڵێکی پێکەنیناوی هەبوو سەیری قاچی دەکردم کە هێشتا لە سەر پەیژەکەبوو»، بەم جۆرە و بەو دیدارە خێرایە، (ئیڤاو هیتلەر) چارەنووسییان دەستی پێکرد و پێکەوە لکان.

خوێندکارەکەی پێشووی خوێندنگە، پارێزراو لە ڕووی هەڵسوکەوت، چێژبینین و چێژوەرگرتن لەو بابەتانەی پێشتر گرینگی پێ دەدان، بە بینینی ئەو میوانە نامۆیە توشی شڵەژانێکی زۆر بوو، چونکە لەو کاتەدا بە دەستی خۆی تەنوورەکەی کورت کردبۆوە، تەنانەت دڵنیاش نەبوو لەوەی ئایا جلی ژێرەوەی لە

بەرکردوە یان نا، ئەو کەسە نامۆیە بەوپەڕی وردییەوە چاودێری ئەو کچە جوانەی سەر پەیژەکەی دەکرد، لەو کاتەدا، (هیتلەر) خۆی بەو کچە ناساندو گوتی (بەڕێز گورگ)م، بە هاوکاری (هینریش هوفمان)ی خاوەن کارەکەی (ئیڤا)، کە هاوڕێ و وێنەگری تایبەتی (هیتلەر) بوو، ئەو پیاوە نامۆیەی کە دواتر ئیڤا نەفرەتی لێ دەکرد، کاریگەرییەکی گەورە و خێرای لە سەر بە جێ هێشت، هەر لەو دیدارەدا (ئیڤا) بڕیاریدا هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، بەڵام (هیتلەر)سوربوو لە سەر ئەوەی بە ڕەبەنی بمێنێتەوە و هیچ منداڵێکی نەبێت، ئیتر لەو کاتەوە (ئیڤا و هیتلەر) بە هیچ شێوەیەک دەستبەرداری یەکتری نەبوون.

(ئیڤا)، یەکەم خۆشەویستی (هیتلەر) نەبوو، ئەم حاڵەتە تا ئێستا گومانی لە سەرەو یەکلانەبۆتەوە، ئەم گومانەش دەگەڕێتەوە بۆ پێوەندییەکانی (هیتلەر) بە (جیلی ڕاوباڵ)ی کچی پوورەکەی خۆیەوە، بە تایبەتی کاتێک پووری دەچوە دەرەوە (هیتلەر و جیلی) پێکەوە دەخەوتن، ئەو پێوەندییە تەنها پێوەندییەکی زینای کەسە نزیکەکان نەبوو، بەڵکوو کاتێک (جیلی) هەوڵیدا لە دەست (هیتلەر) هەڵبێت و پێوەندییەکی ڕۆمانسیی تر لەگەڵ کەسانی تردا دروست بکات، (هیتلەر) هەوڵێکی زۆریدا بیترسێنێت و توشی ترسی بکات لە بەرانبەر، چیرۆکێکی پڕیاخی بوون بوو هاوشێوەی فیلمی (جوان و دڕندە – حسناءالوحش).

ساڵی (1931)، کاتێک (جیلی) هەستیکرد کە (هیتلەر) هاوسەرگیری لەگەڵ ناکات و ڕێگەشی پێ نادات لەگەڵ هیچ کەسێکی تر هاوسەرگیری بکات، فیشەکێکی نا بە سەر دڵی خۆیەوە و خۆی کوشت، خەمی (هیتلەر) بۆ چارەنووس و هۆکاری گیانلەدەستدانەکەی (جیلی) زۆر گەورەبوو، ئەگەر

ژوورەکەی بکرایەتە مەزارێکی داخراو، ئەوا (هیتلەر) تا کۆتایی ژیانی سەردانی دەکرد.

بەم جۆرە دەرفەت بۆ (ئیڤا براون) ڕەخسا تا سوود لە گرفت و کێشە ڕۆمانسییەکەی ئەو سەرکردەیە وەربگرێت، هەر بۆیە چەند هەفتەیەک دوای یەکەم بینینیان، بوون بە دوو خۆشەویست، تا ئەو کاتە (ئیڤا) توانی بە سەر هەموو ڕکابەرەکانیدا سەرکەوتووبێت، بەڵام (یونیتی نیتگۆرد)ی شایستە بە لە خۆبایی بوونەکەی هیتلەر، شتی نوێی هێنایە ئارا، (هیتلەر)، سوودی لە (یونیتی) وەرگرت بۆ ئەوەی کاریگەری لە سەر میوانەکانی دروست بکات، پێش ئەوەی بڕیاری کۆتایی لە سەر جەنگ بدات، (یونیتی)، کەسێکی قورس نەبوو، هەروەها ئینگلیزییەکەشی باش نەبوو، جگە لەوەش توانا و شایستەی ئەوەی نەبوو ببێتە ڕکابەرێکی سەرەکی و جددی بۆ (ئیڤا).

هەروەها بە شێوەیەکی خێرا (ماگدا گویەلز) ڕۆڵی خۆشەویستی (هیتلەر)ی دەبینی، بە تایبەت ئەو کاتانەی پێویستی بە چێژوەرگرتن هەبوو، (ئیڤا براون)یش دورخرابۆوە بۆ بەشی خوارەوە کە تایبەت بوو بە بۆنە ڕەسمییەکان، سەرەڕای خەم و نیگەرانییەکانی، بەڵام ڕێگەی پێ نەدەدرا بەشداری هیچ بۆنەیەکی ڕەسمی بکات و ئامادەبێت لە ڕێورەسمی پێشوازیکردن لە میوانەکان، وەک (دۆق و وێندسۆرەکان)، بەڵام لە (بێرگهۆف) کە خانوە دیهاتییەکەی (هیتلەر)ی لێبوو، شوێنێکی جیا کراوەی نازییانە بوو بۆ تێکشکاندنی ئیرادە و ورەی (ئیڤا)، لە پشتیشییەوە نووسرابوو، (ئیڤا، مانگایەکی گێل).

سەرەڕای ئەو هەموو دەنگۆ و پڕوپاگەندانەی بۆی دەکرا و کۆتاییان نەدەهات، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نەبوو لە سەر ئەوەی

(هیتلەر)، نەسازێکی سێکسی بووبێت، کەسێکی شەرمن بوو، بە گشتی تاتەمەنی گەیشتە (30) ساڵ قۆناغی ڕەبەنی تێ نەپەڕاند، سەرەڕای ئەو پێوەندییەی کە لەگەڵ پورزاکەیدا هەیبوو، بەڵام لە ڕووی جەستەییەوە هیچ زیانێکی نەبوو، بەڵام پێوەندییەکی دوو لایەنە بوو، لە سەر بنەمای ڕەزامەندی و ئارەزووی هەر دوو لا.

ئەوەی گرینگە کە لێرەدا باسی بکرێت، هەموو ئەو مێینانەی پێوەندی ڕۆمانسییان لەگەڵ (هیتلەر) هەبوە یان ڕۆڵی گرینگییان هەبوە لە ژیانیدا، لە کۆتاییدا (خۆیان کوشتوە)، لە هەوڵی شکستخواردووی خۆکوشتنی یەکەم هاوڕێیدا (میمی ڕایتەر) دەست پێ دەکات، دواتر بۆ (جیلی) و پاشان بۆ (یونیتی) کە دوای ڕاگەیاندنی جەنگی بەریتانیا لە دژی ئەڵمانیا فیشەکێکی نا بە خۆیەوە و خۆی کوشت، لە کۆتاییدا (ئیڤا) هەستی بە دڵنیایی و بڕوا بە خۆبوون دەکرد، کاتێک کە پاسەوان و پیاوەکانی (هیتلەر)، (ماگدا گویلز)ی ڕکابەریان دەرکرد، ماوەیەکی کەم پێش ئەوەی (هیتلەر و ئیڤا) پێکەوە خۆیان بکوژن.

ئەوەی تا ئێستا زۆر باس نەکراوە ئەوەیە کە (ئیڤا) دوو جار هەوڵی داوە خۆی بکوژێت، جاری یەکەم لە تشرینی دوەمی ساڵی (1932)دا (ئیڤا) فیشەکێکی نا بە قوڕگییەوە، بەڵام بە هەڵە بەر دەماری ژێر ملی کەوت. ساڵی (1935) و بۆ جاری دوەم (ئیڤا) هەوڵیدایەوە لە ڕێگەی خواردنی حەبی خەوەوە خۆی بکوژێت، بێ گومان لە هەر دوو جارەکەشدا (کەمتەرخەمییەکانی هیتلەر) هۆکاری سەرەکی بوون، چونکە (هیتلەر) پێی وابوو دوای چەند جارێک یەکتر بینین، ئیتر ڕۆڵ و خەونی هاوسەرگیری و منداڵ بوونی (ئیڤا) کۆتایی پێ دێت، لە سێ بۆ چوار مانگ دا، (هیتلەر)

یەک جار (ئیڤا)ی دەبینی، هەر کاتێکیش دووربوونایە لە یەکتری، بە هیچ شێوەیەک (هیتلەر) نامەی بۆ (ئیڤا) نەدەنووسی و بە تەلەفۆنیش قسەی لەگەڵ نەدەکرد، چەند ساتێکی زۆر کەم پێش دوەم هەوڵی خۆکوشتنی، (ئیڤا) نووسیبووی «خۆزگە چاوم بە چاوەکانی نەدەکەوتن»، لەگەڵ ئەمەشدا و سەرەڕای ئەو خەمە زۆرەی هەی بوو، بەڵام وەفادارییی (ئیڤا) بۆ (هیتلەر)، وەفایەکی ڕاستەقینەی ژیانیی بوو، لە کۆتایی دا و دوای ئەوەی هاوسەرگیرییان کرد، (ئیڤا) پێی وابوو ئیتر لە ژیانیدا هیچ کەموکوڕییەکی نییە، ئەگەرچی ئەو هاوسەرگیرییە تەنها (36) سەعاتی کۆتایی ژیانیان بەردەوامیی هەبوو، کاتێک بە (خانم هیتلەر) بانگ دەکرا، بەڵام (هیتلەر) هەر بە (خاتوو براون) بانگی دەکرد.

(ئەنگێلا لامبەرت) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (ژیانی ونبووی ئیڤا براون) هەوڵی زۆریداوە بۆ دروستکردنەوەی لایەنە ونبوەکەی ژیانی (ئیڤا براون)، زیاد لە هەر تێبینی و سەرنجێکی تری مێژوویی.

بەڵام، پێوەندییەکەی نێوان (هیتلەر و ئیڤا براون)، لە کتێبەکەدا بە تایبەتی مایەوە، تەنانەت بە لای خێزان و هاوڕێ و خزمەتکارەکانیشییەوە، هەر وەک (لامبەرت) باسی کردوە» شتی زۆر لە بارەی دوا ڕۆژەکانی ژیانی (ئیڤا) لە حەشارگەی بەرلین دەزانم، هەندێک شتی زۆریش لە سەر ژیانی ڕابردووی دەزانم، ئەو قۆناغەی کۆتایی ژیانی (ئیڤا) وەک نمایشێکی سینەما بۆ هەموان ئاشکرا و دیاربوو، بۆ دروستکردنی کەسایەتییەکی سێ ڕەهەندیی (ئیڤا)، (لامبەرت) پەنای بردۆتە بەر هەموو ڕێگەکانی وروژاندنی پرسیار:

یەکەمییان، (لامبەرت) زنجیرەیەکی بنەچەیی هاوتەریب بە کەسە نزیکە ئەڵمانییەکانی، بە تایبەتی لە ڕێگەی دایکییەوە، کە هەڵگری زنجیرەیەکی بنەچەییە و هاوشێوەی ئەوەی (ئیڤا)یە، ئەم لایەنە کەمتر ئازار بەخشە، بەڵام لایەنی تاریک و شاراوەی زۆرە، هەروەها (لامبەرت) دەیەوێت بزانێت (هیتلەر) لە ساتەوەختی پێش خۆکوشتنیاندا، (هیتلەر) چی بە (ئیڤا) گوتوە، ئەمەش بە شێوەیەکی ئەرێنی وروژێنرا، لە کۆتاییدا (لامبەرت) هەوڵیدا ژیانی (ئیڤا) بخاتە ناو چوارچێوەیەکی دراماتیکی کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە، بێ گومان ئەمە کارێکی باش بوو، بەڵام گرفتی ئەوەی هەبوو، زۆر ڕووکەشیانە بوو، نەچووبوە ناو قووڵایی بابەتەکەوە.

(لامبەرت) ددانی ناوە بەوەدا، کە تا ئەو کاتەی زنجیرە بنەچەییەکەی ئامادە کردوە، شتێکی ئەوتۆی لە سەر ئەو قۆناغەی ژیانی (ئیڤا) نەدەزانی، بۆ نموونە (لامبەرت) تا ڕادەیەکی زۆر زیادەڕۆیی کردوە لە ستایشکردن و باس کردنی هیتلەر و سەرکەوتنەکانی، کاتێک لە ساڵی (1929)دا چاوی بە (ئیڤا) کەوتوە، چونکە قەبارەیەکی گەورەی بە پارتە نازییەکەی هیتلەر بەخشیوە، بەوەی لەو کاتەدا ژمارەی ئەندامەکانی حزبەکەی هیتلەر (زیاتر لە یەک ملیۆن ئەندامی هەیە)، لە کاتێکدا ژمارەی ڕاستەقینەی ئەندامانی پارتەکەی هیتلەر (یەک لە سەر پێنج)ی ئەو ژمارەیە بوو، یاخود گوتویەتی لە ساڵی (1927) چەندین ملیۆن نووسخە لە کتێبەکەی (هیتلەر)، (خەباتی من) فرۆشراوە، ڕاستییەکەشی ئەوەیە تا ساڵی (1929) ژمارەی کتێبە فرۆشراوەکانی (خەباتی من) (40) هەزار دانەی تێ نەپەڕاند، هەروەها (لامبەرت) لە بابەتێکی تریشدا توشی لادان و

هەڵەی زانیاری بوە، بەوەی دەیەوێت بیسەلمێنێت کە (ئیڤا) دژی (نەریتی سامییەکان) نەبوە و هیچ زانیارییەکیشی لە سەر ئەو ڕووداوانە نەبوو کە بە سەر جوەکان دا هات.

بەلام تا ئێستا دەرنەکەوتوە سەرنج و تێبینییەکانی (دایڤید ئیرفینگ)ی مێژوونووس، کە (لامبەرت) لە کتێبەکەیدا چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردوە، ڕۆڵیان هەبوو بێت و هانیاندابێت ئاڕاستەی کتێبەکەی بگۆڕێت بۆ بەرگریکردن و لێبووردن.

لە ڕاستیدا، (ئیڤا براون) کچێکی جوانی کاسۆلیکی بوو، هیچ کاتێک پێوەندی نەکرد بە پارتی نازی ئەڵمانییەوە، ئەم ڕاستییە نە بێ تاوانی دەکات و نەتوشی ئازاری ویژدانی دەکات، بەڵکوو تاکە شتێک کە مانای بە ژیانی (ئیڤا) دەبەخشی (هیتلەر) بوو، ئەو باشترین کەسیش بوو کە دەیزانی چ شتێک مانای ڕاستەقینە بە ژیانی (هیتلەر) دەبەخشێت، بەو جۆرە (ئیڤا براون) توانی تا ساتەوەختی مردنیان (هیتلەر) بکاتە موڵکی تایبەتی خۆی، ئەو موڵکدارییەش تاکە شت بوو، کە (ئیڤا) هەم پێویستی پێی بوو، هەم پێشی ڕازی بوو.

(ئیڤا ئانا پاولا براون) لە شاری میونشنی ئەڵمانیا لە دایک بوە، لە یەکێک (الادیرە) لە خوێندنگە ئاینییەکان خوێندوویەتی، بەپێی یەکێک لە گێڕانەوە و بۆچوونەکان، ساڵی (1929)، (ئیڤا براون) یاریدەدەری یەکێک لە فەرمانبەرەکانی هیتلەر بوو، نامەیەکی ڕۆمانسی خستوتە گیرفانەکانی (هیتلەر)ەوە، ئەو نامەیە بە جۆرێک کاریگەریی لە سەر (هیتلەر) دروستکرد، کە (ئیڤا)ی بانگهێشتکرد بۆ یەکێک لە سەیرانگە شاخاوییەکانی و دواتر بوونە خۆشەویستی یەکتر.

وەک باس دەکرێت و دەگێڕدرێتەوە، (ئیڤا) لە لای هاوڕێکانی

گاڵتەی بە سمێڵی هیتلەر کردوە، مێژوونووسانیش دەڵێن (ئیڤا) ژنێک بوە، کە ژیرییەکەی زۆر سنوردار بوە، بەڵام وەفاداربوە بۆ (هیتلەر)ی خۆشەویستی.

لە دوای ئەوەی (جیلی ڕووباڵ) خۆی کوشت، (هیتلەر) گرینگیی و بایەخێکی زۆریدا بە (ئیڤا)، (هیتلەر و جیلی) زۆر لە یەکتر نزیک بوون، دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە پێوەندییەکی دۆستانە و سۆزدارییانەیان هەبوو، جیاواز لە هەر پێوەندییەکی تری ئاسایی لە نێوان کەسە نزیکەکاندا.

کاتێک (ئیڤا) هەوڵیدا خۆی بکوژێت و فیشەکێکی نا بە ملییەوە، دوای چاکبوونەوەی، (هیتلەر) خانوویەکی تایبەتی لە (میونشن) بۆ کڕی و ئۆتۆمبیلێکی مارسیدیسیشی بە دیاری پێ بەخشی و شۆفێرێکی تایبەتیشی بۆ دامەزراند.

لە ساڵی (1936)دا، (ئیڤا براون) چوە ناو خانوەکەی (فوهرەر) و بە شێوەیەکی ڕەسمی وەک میواندۆست، تێیدا نیشتەجێ بوو، بە شێوەیەکی گشتی ئەو کەسانەی ڕەخنەیان لە سیاسەتی گشتی حکوومەتەکەی هیتلەر دەگرت و شکست و کەموکورتییەکانی دەوڵەتی ئەڵمانیایان لە سەردەمی جەنگی دوەمی جیهانیدا ئاشکرا دەکرد و بڵاویان دەکردەوە، لە ماڵەکەی هیتلەردا پێشوازییان لێ نەدەکرا و (ئیڤا) سوور بوو لە سەر ئەوەی جارێکی تر لە ماڵەکەی هیتلەردا نەیانبینێتەوە، هەروەها سەرەڕای نزیکییەکەی لە (هیتلەر)ەوە، بەڵام هیچ کاتێک دەستێوەردانی لە کاروباری گشتی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی حکوومەت و سیاسەتدا نەکردوە، هەوڵیشی نەدەدا بەوەی کاریگەری لە سەر خۆشەویستەکەی دروست بکات دەستکاری و سیاسەت و شێوازی فەرمانڕەواییەکەی بکات.

کاتێکیش سوپای سوور تینی بۆ بەرلینی پایتەختی ئەڵمانیا هێنا، (ئیڤا) و (هیتلەر)ی خۆشەویستی، ڕەتیان کردەوە بارەگای سەرکرایەتی ئەڵمانیا جێ بهێڵن، لە ڕۆژی (29)ی نیسانی ساڵی (1945)دا، (فۆهرەر و ئیڤا براون) بە شێوەیەکی ڕەسمی هاوسەرگیرییان کرد، لەو ڕۆژدا کە لە ڕێگەی خواردنەوەی ژەهرەوە خۆیان کوشت .

کۆتاییەکی کارەساتاوی بە گەیشتنی هەواڵێکی کارەسات ئامێز بە (ئەدۆلف هیتلەر) دەستی پێ کرد کاتێک لە ژێرزەمینەکەیدا بوو، وەک خۆپارێزییەک لە دەست ڕووسەکان کە گەیشتبوونە دەروازەکانی شاری بەرلین، هەواڵە ناخۆشەکەش ئەوە بوو (مۆسۆلۆنی)ی دیکتاتۆر و فەرمانڕەوای ئیتالیا، کە یەکێک بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی (هیتلەر) و بە زەبری ئاگرو ئاسن و توندووتیژی ئیتالیای بەڕێوەدەبرد، لەگەڵ ژنەکەیدا دەستگیر کراون و بە دەستڕێژی گوولله کوژراون، بە بارهەڵگرێکیشدا تەرمەکەی نێردراوە بۆ شاری میلانۆ و بە قاچ بە یەکێک لە ستوونەکانی کارەبای شارەکەدا هەڵیانواسیوە، دواتریش فڕێدراوەتە یەکێک لە ئاوەڕۆکانی شارەکەوە، بۆ ئەوەی هەموو کەس ببینێت، پاش ماوەیەک لە گۆڕستانی تایبەت بە کەسە خراپ و سواڵکەرەکان بە خاک سپێردرا.

دوای گەیشتنی ئەو هەواڵە، (هیتلەر) هەستیکرد ئەمجارە ڕزگاربوون و دەربازبوونی نییە و بە هەر جۆرێک بوە هەر دەکوژرێت، بۆیە فەرمانیدا بە کوشتنی هەموو سەگەکانی تایبەت بە پاسەوانیی خۆی و ژەهر خوارکردن، هەروەک دوو دەنک حەبی ژەهراویشی دا بە هەر دوو سکرتێرە تایبەتەکەی خۆی، سەرپشکی کردن لە وەی بە کاری دەهێنن یان نا، کاتێک بەرەبەرە

ڕووسەکان دەچنە سەریان، فەرمانیشیدا هەموو نووسراو و دۆسییە تایبەت و نهێنییەکانیشی بسووترێنرێت و لە ناوببرێت.

ئەو شەوە شوومە، (هیتلەر) نەیتوانی بخەوێت، بە تایبەتی دوای ئـەوەی زانـی هێزەکانی ڕووسیا چوونەتە نـاو شاری بەرلینی پایتەختەوە و هەموو ناوچەکانی شارەکەیان داگیر کـردوە، پێشنیوەڕۆی ڕۆژی دواتـر و دوای ئـەوەی نانی نیوەڕۆی خوارد، (هیتلەر) و (ئیڤا براون)ی خۆشەویستی، کە چەند ساڵێکی زۆر پێکەوەبوون بە بێ ئەوەی هاوسەرگیری بکەن و لە دواڕۆژەکانی ژیانیاندا بوون بە هاوسەری یەکتری، چوونە ژوورە تایبەتەکەی خۆیان، لەوکاتەدا جگە لە (د.گویلز) ی ڕاوێـژکـاری تایبەتی (هیتلەر)، کە دوای بیستنی هەواڵی خۆکوشتنی هیتلەر، ژنەکەی و منداڵەکانی و دواتریش خۆی کوشت، (بـۆرمـان)ی یـاریـدەدەری (گویلز) و چەند کەسێکی تریش لە بەردەم دەرگای ژوورەکەدا وەستابوون و چاوەڕێی ڕووداوێکیان دەکرد.

چەند ساتێکی کەم تێ پەڕی دوایماڵئاواییەکەی (هیتلەر)، ئـەوانـەی نزیکی ژوورەکـە گوێیان لە دەنگی تەقاندنی یەک فیشەک بوو، دەنگەکە دووبارە نەبۆوە و بێ دەنگییەکی سەیر ئەو ناوەی گرتەوە، هەموان بڕیاریاندا بچنە ژوورەکەی (هیتلەر) ەوە، چەند جارێک بەت وندی لە دەرگایاندا، بەڵام کەس وەڵامی نەدانەوە و ئەوانیش بە ناچاریی دەرگاکەیان شکاند و چوونە ژوورەوە و بینییان (هیتلەر) لە سـەر کورسییەک کەوتوە و خوێنێکی زۆر لە دەمییەوە دێتە دەرەوە و گیانی سپاردوە، (ئیڤا) ی خۆشـەویستیشی لە ڕێگەی دەنکێک حەبی ژەهراوییەوە خۆی کوشتوە.

کات نزیکەی (3.30)ی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی دووشەممە (30ی نیسانی ساڵی 1945) بوو، ئەو ساڵە تەمەنی (هیتلەر) (56) ساڵ بوو، کە (12) ساڵ و (3) مانگییان وەک فەرمانڕەوای ئەڵمانیا و ڕاوێژکاری دەوڵەتی ئەڵمانیا بوو، ئەو سەردەمە ئەڵمانیا، بەهێزترین دەوڵەتی جیهان بوو، بەڵام دوای یەک هەفتە لە خۆکوشتن و نەمانی (هیتلەر)، ئەو دەوڵەتە بەهێزە دارما، هاوڕێ و هاوکارەکانیشی بە ناوی ساختەوە، ڕوویان لە ولاتانی جیهان کرد و خۆیان شاردەوە، لە ترسی ڕاوەدوونان و دەستگیرکردن.

(هاینز لینگ)ی خزمەتکاری تایبەتی (هیتلەر)، کە یەکێک بوو لە فەرماندەکانی پاسەوانی نازی، تەرمی (هیتلەر و ئیڤا) ی لە بەتانییەکی ڕەنگ بۆری سەربازییدا گواستەوە، بە هۆی کاریگەریی ئەو فیشەکەشەوە کە نابووی بەخۆیەوە، ڕوخساری (هیتلەر) بەت ەواوی شێوابوو.

تەرمی (هیتلەر و ئیڤا) گواسترانەوە بۆ باخچەیەک و لە ناو یەکێک لەو چاڵە گەورانەی بە هۆی مووشەکەوە هەڵکەنرابوو بە خاک سپێردران، دواتر ئەو کەسانەی لەوێ بوون ڕۆنیان کرد بە سەر گۆڕەکەدا و ئاگریان تێ بەردا، لە کۆتایدا بە هەمان شێوەی هیتلەر، دەستی سلاوی نازیانەیان بەرز کردەوە و پێکەوە گوتیان (های هیتلەر).

کتێبێکی تایبەت بە (ئیڤا براون)ی خۆشەویستی هیتلەر بلاو کراوەتەوە، کە تەنها چەند سەعاتێک پێش گیان لە دەستدانیان بوونە هاوسەری یەکتر، بەڵام تا ئێستا نازانرێت ئەو قسانەی کە لە سەر هاوسەرەکەی هیتلەر کراون، دواین قسەن یاخود قسەی تریشیان بە دوادا دێت، هەزاران کتێب دەربارەی هیتلەر، باوک و

دایک و خوشک و تەنانەت کچە پوورەکەشی، کە خۆی کوشت نووسراون و بڵاو کراونەتەوە، بەڵام لە هیچیاندا، مێژوونووسان ئاماژەیان بە کەموکورتییەکی جەستەیی و دەروونی و هەڵس و کەوت و مامەڵەکردنی نەکردوە، ناشزانین وێنەی ئەو لای ئەڵمانییەکان چۆنە، کە هیچ سنوورێک نییە بۆ ڕقلێبوونەوە و سوکایەتیکردن لای ئەڵمانییەکان و سەرکردە و مێژووەکەیان.

لەم کتێبەدا یارییەکی مێژوویی بە ناوبانگ هەیە، ئایا چی ڕووی دەدا ئەگەر لەو کاتەدا کە هیتلەر چوە ناو فرۆشگەکەوە، (ئیڤا براون) تەنوورەکەی کورت نەکردایەتەوە؟ چی دەبوو ئەگەر نەچوایەتە سەر پەیژە تەختەکە و (هیتلەر) قاچەکانی نەبینیایە؟ ئەی چی دەبوو کاتێک (هیتلەر) قاچەکانی (ئیڤا)ی بینی، یەکێک لەو وێنەگرانە دابنیشتایە کە هانی دەدا بەرەو زیاتر لە سەرسامبوون؟ بەڵام پرسیارە گرینگەکە ئەوەیە بۆچی (ئیڤا) ئەو ڕۆژە تەنوورەکەی بەو جۆرە کورت کردبۆوە؟ هۆکارەکەش زۆر سادەیە، تەنوورەکەی ئاڵا لە بزمارێکی سەر پەیژە تەختەکەوە و دڕاو کەمێک ئیسفنجی لێ هاتە دەرەوە، بۆ شاردنەوەی ئەو عەیبە، (ئیڤا براون) بە مقەست کەمێک لە تەنوورەکەی بڕی و کورتی کردەوە، بەوەش قاچە ناسک و زەردباوەکەی بە تەواوی بە دەرکەوتن.

سەرەڕای ئەو جیاوازییەی لە نێوان ڕاستییەکی زانستی و گێڕانەوەی ڕووداوە مێژووییەکاندا دروست دەبێت، بەڵام زۆرینەی شارەزایان و پسپۆڕانی لێکۆڵینەوە مێژووییەکان، پەنایان بردۆتە بەر پرۆگرامی لێکۆڵینەوەی زانستی بۆ گەیشتن بە تێگەیشتن لە زۆربەی ڕاستییە مێژووییەکان، لە چوارچێوەی ئەو دۆخ و ماوەیەی تێیدا ڕوویانداوە، هەروەها لێکۆڵەرە

زانستییەکان سەرکەوتووبوون لەگرتنەبەری ڕێبازی ڕاستی زانستی بۆ تیشکخستنە سەر ئەو ناوچە و بابەت و قۆناغانەی لە سەردەمە مێژووییە جیاوازەکاندا بە نارۆشنی و نادیاری ماونەتەوە.

بۆ نموونە سەرەڕای تێ پەڕبوونی زیاتر لە نیو سەدە بە سەر کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانیدا، بەڵام تا ئێستا (ئیڤا براون)ی خۆشەویستی (هیتلەر)ی سەرکردەی نازییەکان، کە ئەو شەوەی خۆیان کوشت هاوسەرگیرییان کرد، بابەتی سەرەکی نووسین و لێکۆڵینەوەیە لای مێژوونووسان و لێکۆڵەرانی زانستی، بۆچوونێک هەیە کە بەپێچەوانەی کتێب و نووسینە مێژووییەکانەوە دەڵێت ڕەنگە خۆشەویستەکەی هیتلەر لە ژیاندا بێت، یان لانی کەم ئەو شەوە خۆی نەکوشتوە.

(د.رایدەر سوجیناس) پزیشکی پسپۆڕی ددان و مامۆستا لە زانکۆی کالیفۆرنیا، کە یەکێک بوو لەو تیمە پزیشکییەی پکشنیان بۆ تەرمی (هیتلەر و ئیڤا براون) کرد، لە دوای ئەوەی لە لایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە دۆزرانەوە، چونکە پێش هێزی هاوپەیمانان چوونە ناو بەرلینەوە، زۆر بە ئاسانی و لە ڕێگەی (کاکیلە و شەویلگە)کانییەوە کە لەگەڵ جەستەکەیدا نەسووتابوو توانی (هیتلەر) بناسێتەوە، بەڵام ئەوەی پێوەندی بە جەستەی (ئیڤا براون)ەوە هەبوو، بابەتەکە جۆرێک لە گومانی پێوەدیاربوو.

وەک دەزانرا، (ئیڤا براون)، تاقمێکی ددانی بە کار دەهێنا کە لە لایەن پزیشکێکی ئەڵمانییەوە بۆی دروستکرا بوو، بەڵام ئەو تاقمە لەگەڵ تەرمەکەی (ئیڤا) دا نەدۆزرایەوە، (د. ڕایدەر سوجیناس) توانی ئەو پزیشکە ئەڵمانییە بدۆزێتەوە کە ئەو تاقمەی بۆ (ئیڤا) دروستکردبوو، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە گوتی

«تاقمەکەی بۆ دروستکردوە، بەڵام پێی نەداوە»، ئەو تاقمە پلاستیکییەی بە کاری هێناوە، بە دڵنیاییەوە لەگەڵ تەرمەکەیدا سووتاوە.

(د. ڕایدەر سوجیناس) گەیشتە ئەو باوەڕەی کە (سۆڤیەتییەکان) لە کاتی پشکنینی دوەمدا بۆ جەستەکەیان، تاقمی ددانەکەی (ئیڤا)یان لە تەنیشتییەوە داناوە، بەڵام ئایا چۆن توانییان ئەو تاقمە بدۆزنەوە و دەستییان بکەوێت، لە کاتێکدا ئەو پزیشکە گوتبووی هێشتا تاقمەکە لای خۆیەتی و تەسلیمی نەکردوە.

(د. ڕایدەر سۆجیناس) هەموو ئەو زانیاری و بەڵگانەی خستەبەردەم ئەندامانی کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی تایبەت بە پزیشکی دادوەریی، کە لە نەرویج ڕێکخرابوو، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە بابەتێکی نادیار و ناڕوون و گەیشتن بە بەڵگەیەکی زانستی بۆ سەلماندن یان ڕەتکردنەوەی ڕاستییە مێژووییەکان.

لە چەند ساڵی ڕابردوودا کتێبێکی تریش لە ئەڵمانیا چاپ و بڵاو کرایەوە، باسی لە چەند لایەنێکی تری شاراوە و نادیاری (هیتلەر)ی سەرکردەی نازییەکان کردوە، ئەو سەرکردەیەی جیهانی شێواند و گەڕان و پشکنینی زۆری هەبوو.

ئەم کتێبە، بۆ یەکەم جار باسی لەوەکردوە وێنەگرە تایبەتەکەی (هیتلەر) کە ناوی (هینریک هۆفمان) بوو، نزیکەی یەک ملیۆن و پێنج سەد هەزار وێنەی (هیتلەر)ی گرتوە، هەروەها شاهیدحاڵی زۆرینەی نهێنییە ڕۆمانسی و کۆمەڵایەتییەکانیشی بوە، لە نێویشیاندا خۆکوشتنی سێ خۆشەویستەکەی، ئەم زانیارییانە بۆ یەکەم جارە بڵاو دەکرێنەوە، چونکە لە یادەوەری (هوفمان)ی وێنەگردا زیندانی کرابوون و شاردرابوونەوە.

ئەو وێنەگرە چەند لایەنێکی زۆر شاراوە و نهێنی و تایبەتی ژیانی (هیتلەر)ی دۆکیۆمێنت کردوە، وەک وێنەگرەکە دەڵێت ئەو تەنها دیمەنە ڕاستەقینەکانی گواستۆتەوە وەک خۆی، بە بێ ئەوەی دەستکاری هیچی کردبێت، ئەو نەیویستوە ژیانی تایبەتی سەرکردەکەی بکاتە بابەتی ڕای گشتی، بەڵام بە بێ ویستی ئەو، ئەو کارە ڕووی دا.

(هوفمان) بە شێوەیەکی زۆر تایبەت لە هیتلەرەوە نزیک بوو، بە ڕادەیـەک دەستی لەگەڵ هیتلەر و ئیڤا و هوفمان) تێکەڵاوبووبوو، تا ئەو شەوەی لە شوێنی خۆ حەشاردانەکەی ژێر زەمینەکەدا خۆکوشتنەکەشیانی بینی، کتێبی (وێنەکانی هیتلەر) بازدان و هەنگاوێکی گەورەبوو لە ژیانی تایبەتی هیتلەر، بە جۆرێک پێش ئەو هیچ کەسێکی تر توانای ئەنجام دانی ئەو کارەی نەبوە و بۆی نەکراوە، بۆیە ئەگەر (وێنەگرە تایبەتەکەی هیتلەر) نەبوایە و باسی نەکردایە، بەشێکی زۆری ژیانی تایبەتی هیتلەر بە شاراوەیی و نهێنی دەمایەوە.

ئەو کتێبە، پشتی بەستوە بەو دیدار و چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ (هینریک هوفمان)ی وێنەگری تایبەتی هیتلەردا ئەنجام درا، پێش ئـەوەی ساڵی (1957) کۆچی دوایـی بکات، ئەو ڕۆژنامەنووسـەی چاوپێکەوتنەکانی ئەنجام دابوو، (11) ساڵ پێش بڵاو کردنەوەی کتێبەکە کۆچی دواییکرد، بەڵام لە لایەن دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەکەوە، دەستنووس و ڕەشنووسی چاوپێکەوتنەکان دۆزرایـەوە و بڕیاریدا لە دووتوێی کتێبێکدا چاپ و بڵاویان بکاتەوە.

(هینریک هـوفمـان) لـە زوومـی کامـێراکەیـەوە، سەیری (جەمهەرە) گەشاوەکەی (ئۆدۆبونوبلاتز) بکات لە میونشن، بۆ

ئەوەی جوانترین دیمەن تۆمار بکات و بڵاویَ بکاتەوە.

کات ساڵی (1954)ە، ئەڵمانیای داگیرکەر تازە بڕیاری ئەوەی داوە بچێتە جەنگەوە، (هینریک هوفمان)ی وێنەگر، گەیشت بە ئاواتەکەی، کامیراکەی دەرهێنا و لە ڕێگەی چرکاندنێکەوە ئەو وێنەیەی گرت و دەستیکەوت کە خواستی بوو، ئەو دیمەنە یەکێکە لەو دیمەنانەی ئاسایی نین و زۆر بە دەگمەن لە ژیانی وێنەگرێکدا دروست دەبێت.

لە دیارترینی ئەو ڕوخسارانەی لە گەشتە (25) ساڵییەکەی لە کامێراکەیدا تۆمارییکردن، ئەو ڕوخسارە بوو سەرکردایەتی وڵاتەکەی کرد و هەنگاوینا بەرەو جەنگ، ئەو ڕوخسارەش، ڕوخساری (ئەدۆڵف هیتلەر) بوو، سەرەتا کارەکە بە ڕێکەوت دەستی پێ کرد، بەڵام دواتر بە ڕێککەوتنێکی هاوبەش کۆتایی هات لەگەڵ (فوهرەر)، کە یەکێکە لە دیارترین ڕوخسارەکان لە مێژوودا.

ئەم دوو کەسە جارێکی تر و دوای بیست ساڵ یەکترییان بینییەوە، سەرەتا و پێش بیست ساڵ و بۆ یەکەم جار (هینریک هوفمان) هەوڵیدا وێنەی نازییەکان بگرێت و داوای (20 هەزار) جونەیهی ئیستەرلینی کرد، بەڵام (هیتلەر) ڕێگەیدا کە پاسەوانەکانی بکەونە لێدان و ئازاردانی (هوفمان)، وێنەگرەکە باسی لەوەشکردوە دواتر (هیتلەر) هەستی کرد وێنەگرتن ئەو شتەیە پێویستی پێیەتی و بۆ ئێستای گرینگە، بۆیە ڕازیبوو کە وێنەیەکی بگیرێت و بڵاو بکرێتەوە.

دوای ئەو ڕێککەوتنەی لە نێوانیاندا کرا، (هوفمان)ی وێنەگر، لە نزیکەوە چەند وێنەیەکی (هیتلەر)ی گرت و لە ڕۆژنامەکاندا بڵاویکردنەوە، بە تایبەتی لە سەروەختێکدا کە ئەستێرەی

نازییەکان ڕووی لە هەڵکشان بوو، بە تایبەتی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداریتی هیتلەردا کە ماوەی (12) ساڵی خایاندو لە ساڵی (1923)دا دەستی پێکردبوو.

ئەم هاوڕێیەتی و هاوبەشی و ڕێککەوتنە سەریکێشا بۆ سەروەت و سامانێکی خەیاڵی، بە تایبەتی کاتێک ڕێککەوتنی تایبەت بە ئیمتیازاتی مافی بڵاوکردنەوەی وێنەکان کە لە کارتی جگەرەوە دەستی پێ دەکرد بۆ کارتی پۆستە و هەموویانی کردە پولی پۆستە و وەک وێنە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاویکردنەوە، لە ڕێگەی زوومی کامیراکەیەوە، (هوفمان) توانی (هیتلەر) بکاتە ئەو سۆپەرمانە ئارییەی خەونی پێوەدەبینرا.

(هوفمان) بەشێک بوو لە وردەکارییەکانی ژیانی هیتلەر، کەمی لە بارەوە دەزانرا، بەڵام هیچ کاتێک خۆی وەک کەسێکی سیاسی پیشان نەدەدا، هەروەک دەڵێت «کۆمەڵێک شتی زۆرم تۆمارکردوە کە لە بەردەم مندا ڕوویان دەدا، بەڵام هیچ کاتێک فەرمانێکم لە بارەیانەوە دەرنەکرد»، (هوفمان) دیدگایەکی زۆر هاوسەنگانەی هەبوو، لەو بازنە و پانتاییە بچوک و داخراوە نزیک لە (هیتلەر)دا، لە ڕێگەی کتێبەکەشییەوە کە لە ئەڵمانیا بڵاو کرایەوە، توانی ئەو دەمامکەی سەر ڕوخساری (هیتلەر) لا بدات.

ئەو کتێبە پشتی بەست بەو وێنانەی (هیتلەر) کە لە چاوپێکەوتنەکانیدا لەگەڵ ڕۆژنامەنووس (جووی هیدیکەر) پێش مردنی لە ساڵی (1957) بڵاو کرابوونەوە، واتا کاتێک لە تەمەنی حەفتاودوو ساڵی دا بوو، هەر چەندە (هیدیکەر) کۆچی دواییکرد، بەڵام دەزگای بڵاو کردنەوەکە، توانی هەموو دەستنووسەکانی ئەو چاوپێکەوتنانە بدۆزێتەوە و لە فەوتان بیانپارێزێت و کۆیان بکاتەوە و لە کتێبێکدا بیخاتە بەردەست خوێنەران.

یەکێک لە دیارترین ئەو شتانەی لەو کتێبەدا باسیان لێوەکراوە و جێگەی سەرنجن، ئەوەیە چوار مێینە لە ژیانی خۆشەویستی هیتلەردا هەبوون و هەمووشیان تا ڕادەی خۆکوشتن ڕۆیشتوون، بەڵام (هوفمان) دەڵێت گەورەترین خۆشەویستی ژیانی (هیتلەر)، (جیلی) کچە پووری بوو، ئەو پێوەندییە بوو کە لە سەرەتاوە ئاشنای بوو.

(هیتلەر)، ڕێزێکی تایبەتی لێ دەگرت، (جیلی) دەیزانی کاریگەری و سیحرێکی زۆری لە سەر (هیتلەر) دروستکرد بوو، دەیتوانی ڕایبکێشێت بەرەو پێشانگە و مارکێتەکانی تایبەت بە پۆشاک و کڵاو و جوانکارییەکان، لە کاتێکدا (هیتلەر) ڕقی زۆری لەو شوێنانە بوو.

تا ڕادەیەکی زۆر ئیرەیی و غیرەی لێ دەکرد، ئەمەش لە ساڵی (1927) دا بە تەواوی دەرکەوت، کاتێک (موریس)ی شۆفێرە تایبەتییەکەی لە میونشن بینی، کە (هیتلەر) بە شێوەیەکی خێرا دەڕۆیشت، لە (17)ی سێپتەمبەریش دا (هەستی شەشەم)، خزمەتێکی بەرچاوی بە (هیتلەر) کرد، کاتێک بڕیارێکی دروست و ڕێگەیەکی دروستی هەڵبژارد لە سەرەتای جەنگدا، ئەو ڕۆژەش کە خۆی کوشت، پێشتر پێی گوتم هەستێکی سەیرم هەیە و دوودڵم، دڵنیام ئەمڕۆ شتێکی زۆر ناخۆش ڕوو دەدات.

لە (نۆرمبێرگ)یشەوە پێوەندییەکی تەلەفۆنی لە (ڕۆدۆلف هیس)ی جێگرییەوە پێگەیشت و پێی گوت «جیلی فیشەکی ناوە بە خۆیەوە و خۆی کوشت»، لەو کاتەدا لە دەرەوەی شوێنی تەلەفۆنکردنەکەبوو، گوێم لێ بوو پێی گوت «هیس پێم بڵێ ئایا تا ئێستا لە ژیاندا ماوە یان گیانی لە دەست داوە؟»، دواتر هاواری کرد و گوتی «هیس، بەرپرسیارێتی قسەکانت دەخەمە

سەرشانت وەک سەربازێک، هیس درۆم لەگەڵ مەکە، هیس، هیس... هیس...»، هیتلەر، لە ژووری تەلەفونکردنەکە هاتە دەرەوە و زۆر شێوابوو، قژی هاتبوە سەر ڕوخساری و دەموچاوی بە تەواوی شێوابوو، چاوەکانی گریان لێ دەباریی...

ئەوە یەکەم جار بوو (هیتلەر) بەو شێوەیە ببینم و هەرگیز جارێکی تر بەو شێوەیە نەمدییەوە، ئەو کاتە نەبێت کە ساڵی (1945) لە ژێرزەمینەکەدا، بە هەمان شێوە بوو.

هۆکارێکی ئاشکرا لە پشت خۆکوشتنی (جیلی)ییەوە بوونی نەبوو، بەڵام دیاربوو کۆمەڵێک کێشەی ڕۆمانسی و خۆشەویستی هەبوو، دەستێوەردانەکانی (هیتلەر) لە ژیانی تایبەتیدا نیگەران و بێزاریی دەکرد، هەر لەبەر ئەوەش، ڕووداوی مردنەکەی کاریگەرییەکی نەرێنی زۆری لە سەر (هیتلەر) بە جێ هێشت، بۆیە شۆفێرە تایبەتەکەی دەمانچەکەی لێ شاردەوە، لە ترسی ئەوەی لە ڕووی دەروونییەوە تێک بشکێت و خۆی بکوژێت.

ماوەیەکی زۆر کەم دوای خۆکوشتنەکەی (جیلی)، (ئیڤا براون)ی تەمەن (19 ساڵ)، توانی دەرفەتی کارکردن وەک یاریدەدەرێک لە ستدیۆکەی (هۆفمان) لە میونشن بە دەست بهێنێت، سەرنجی (هیتلەر)ی بۆخۆی ڕاکێشا، هەر چەندە (هیتلەر) ی هاوڕێی (هوفمان)ی خاوەنکاری (ئیڤا)، وەک کارمەندەکانی تری ستدیۆکە و بە ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ (ئیڤا)شدا دەکرد، بەڵام هاوڕێ هەرزەکارەکانی (ئیڤا) پێیان وابوو (فوهرەر) دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ (ئیڤا) بکات.

(هوفمان) دەڵێت» هیتلەر هیچ ئارەزوویەکی نەبوو بۆ شتێکی لەو جۆرە، هەر لەبەر ئەوەش بوو (ئیڤا) بڕیاریدا خۆی بکوژێت و فیشەکێک بنێت بە سەر دڵییەوە»، (هوفمان) تەئکیدیشکردەوە

لەوەی» هیتلەر هەستی بە بەرپرسیارێتی دەکرد بەرانبەر ئەو ڕووداوی خۆ کوشتنە، پرسیاری لە پزیشکەکەی کرد، ڕاستییەکەم پێ بڵێ، ئایا بۆ ئەوەی زیاتر بایەخی پێ بدەم و لە باوەشی بگرم و هەست بە کێشەکانی بکەم، فیشەکی ناوە بە خۆیەوە، بەلام پزیشکەکە سەری بەملاولادا جوولاند و گوتی ڕاستەوخۆ فیشەکەکەی ناوە بە سەر دڵییەوە، بۆیە هیچ گومانێکم نییە لەوەی ویستویەتی خۆی بکوژێت».

هیتلەریش گوتی، ئاشکرایە ئیتر دەبێت لە مەودوا کەموکورتییەکانی خۆی پێ بڵێم، بەلام (هوفمان) ئامۆژگاریی هاوڕێکەی کرد، تا ئەرکەکانی سەرشانی بەرانبەر بە ئیڤا وەک خۆی جێبەجێ بکات، هەر چەندە کەس نەیدەزانی پێوەندی و نزیکی و خۆشەویستییەکەی بۆ (ئیڤا) لە چ ئاستێکدایە.

(هوفمان) گوتیشی، کاتێک لە (بیرگۆف) بوون، واتا سەیرانگە شاخاوییە تایبەتەکەی (هیتلەر)، (ئیڤا و هیتلەر) لە دوو ژووری تایبەتیدا دەژیان، بەلام یەک گەرماویان هەبوو، کە دوو دەرگای جیاوازی هەبوو دەچوە سەر ژوورەکانیان، هەروەها لە ژووری خزمەتکارەکان و دەنگۆکانەوە گوێم لە هەندێک شت بوو کە گوایە شتی تایبەت لە نێوان (ئیڤا و هیتلەر)دا هەیە، بەلام نەسەلمێنراو تەنها وەک گریمانە و ئەگەر مانەوە.

(ئیڤا) هیچ حەزی بە بژاردە و تواناکانی (گوبلز)ی وەزیری پروپاگەندەی ئەڵمانیا نەبوو، هەمیشە لە بەردەم (فوهرەر) دا ڕەخنەی لەو فیلمانە دەگرت کە (گوبلز) هەڵی دەبژاردن بۆ سەیرکردن و نمایشکردن، بۆیە زۆرینەی جار، وەزیر بە توڕەیی و دەمارگیراویی لە ژوورەکە دەهاتە دەرەوە و دەیگوت چۆن دەبێت کچێکی وا بچووک و بێ نرخ و کەم بەها بەو جۆرە

ڕەخنە لە فیلمەکانی من بگرێت، لە ساڵی (1945)دا، (ئیڤا) توانی ژێرزەمین و شوێنی خۆشاردنەوەکەی هیتلەر، بۆ کۆتاییهاتنی ژیانی هەڵبژێرێت.

(یونتی متفۆرد)ی ئینگلیز و ئەرستۆکرات، ژنێک بوو کە لە ئۆتۆمبیلێکدا و بە ئاڵای تایبەت بە نازییەکانی ئەڵمانیا و کۆماری ئەڵمانیاوە، هەموو وڵاتانی ئەورووپا گەڕا، ئەم ژنە توانی کاریگەری لە سەر (هیتلەر) دروست بکات، بەڵام لەگەڵ نزیکبوونەوەی جەنگدا، داوای لێ کرد بۆ ئەوەی لە ڕووی ئاسایش و دڵنیاییەوە پارێزراوبێت، پێویستە وڵاتەکە جێ بهێڵێت، بەڵام (یونتی) نەک هەر ئەڵمانیای جێ نەهێشت، بەڵکوو لە باخچەی ئینگلیزیدا لە میونشن فیشەکێکی نا بەخۆیەوە.

(هیتلەر) فەرمانی کرد کە باشترین پزیشکەکانی ئەڵمانیا سەرپەرشتی و چاودێری تەندروستی بکەن، بەیانی و ئێوارە چەپکێک گوڵی بۆ دەنارد بۆ ئەوەی لە سەر مێزەکەی تەنیشت خۆی دای بنێت، لە سەر مێزەکەی بەرانبەر سیسەمەکەی (وینتی) تابلۆیەکی هیتلەر بە ئیمزایەکی خۆیەوە هەڵواسرابوو، هەر ئەوەندەشی باری تەندروستی تۆزێک جێگیر و باش بوو، لە ڕێگەی سویسراوە ڕەوانەی ئینگلتەرای کرد.

(هوفمان) لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت «دوای ئەوەی هیتلەر پێی گوتم، هوفمان هەست بە دوودڵی و دڵەڕاوکێ دەکەم بەرانبەر بە ژنان، ئایا من کەسێکی باشم بە لای ئەوانەوە و دەتوانم هەستەکانیان بجووڵێنم؟ یان شتێک هەیە و لەم نێوەدا ونبوە، من ناتوانم بەختەوەری بۆ هیچ ژنێک دابین بکەم، بە درێژایی تەمەنی باسی لەو چارەنووسەی خۆی دەکرد، لە بەردەمم دا».

(هوفمان) توانی، چوارەم مێینە بدۆزێتەوە و ئاشکرای بکات کە لە ژیانی ڕۆمانسی و سۆزداریی (هیتلەر)دا بوون و ئامادەیی

هەبوە، لە مێژوودا ئەو ژنە نادیار و شاراوە بوە، لە یەکێک لە یانەکانی مەی خواردنەوەدا کاری دەکرد و لە بەشی سەرەوەی باڤاریا دەژیا و خاوەنی منداڵ بوو.

ئەو ژنە، لە ساڵی (1921)دا لە یەکێک لە هۆتێلەکاندا خۆی خنکاند، بە بڕوای (هوفمان)یش، هیتلەر و ئەو ژنە پێوەندییەکی سۆزداری و ڕۆمانسییان هەبوە.

لە کاتی جەنگدا، (هیتلەر) و (هوفمان) لە بیرگۆفدا دەگەڕان، (مارتن بۆرمان) کە پادشای ئەو ناوچەیەبوو، بەلای (هوفمان) ەوە لە (پاپا) پیرۆزتر بوو، ئەو ڕۆژە (هیتلەر) ژنە چێشتلێنەرێکی سەوزەواتی دەرکرد، بە بیانووی ئەوەی بە لای پادشاوە لە ڕووی نەژادییەوە پاک و خاوێن نییە.

(فوهرەر) باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو ئەو وێنەیەی (مارشاڵ پۆلۆس)ی فەرماندەی مەیدانی لە (ستالینگراد) خۆی دا بە دەستەوە، ڕاستەقینە نییە و داوای لە وێنەگرە تایبەتەکەی کرد ئەو ڕاستییەی بۆ شی بکاتەوە، (هوفمان) دەڵێت پێم گوت ڕاستەقینەیە و «ڕوخساری بۆیە واشێواوە، چونکە تێکشکاوە».

ڕۆژی (20)ی یۆلیۆی (1944)، (هوفمان) لە (ولفز لیر) ی ڕۆژهەڵاتی بروسیا بوو، کاتێک ئەفسەرێکی سوپا ویستی (هیتلەر) بکوژێت، (هوفمان) وێنەی سەرکردەکەی خۆی گرت کاتێک بە پانتۆڵە دڕاوەکەیەوە لە تەقینەوەکە ڕزگاری ببوو، دوا جاریش لە ژێرزەمین و شوێنی خۆحەشاردانەکەدا، (هوفمان) لە نزیک (هیتلەر)ەوە بوو، کاتێک هەنگاوی دەنا بەرەو ژوورەکەی تا خۆی بکوژێت.

لە یەکێک لە ڕاڕەوەکاندا، (ئیدی) شەڕێکی لەگەڵ (هیتلەر و ئیڤا)دا کرد، بەڵام ئەو ڕۆژەی خۆی کوشت، (هیتلەر) ئەو کەسە

نەبوو کە پێشتر ناسیبووم، هەروەها ئەو کەسەش نەبوو کە دوای خۆکوشتنەکەی (جیلی) بینیم.

(هوفمان) خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی وێنەیەکی هیتلەر بگرێت، کە گەیشتە یەک ملیۆن و پێنج سەد هەزار وێنە و بۆ ماوەی چوار ساڵ شاردییە و لە ساڵی (1954) دا توانی بڵاوی بکاتەوە، (هوفمان) لە بارەی وێنەکانییەوە باسی لەوەکردوە هەر کەسێک سەیری وێنەکانم بکات، دەتوانێت وێنای ئەو شوێن و کاتە بکات، کە وێنەکەم تێدا گرتوە.

هەروەها (دەزگای لۆشیرش میدی) لە پاریس کتێبێکی (ڕوکوس میسچ)ی بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (پاسەوانی تایبەتی هیتلەر بووم (1940-1945)، (ڕوکۆس میسچ)، لە پێنج ساڵی کۆتاییدا، واتا لە مانگی مایۆی (1940 بۆ 30 ئەپریلی 1945)، لە نزیک (هیتلەر)ەوە دەژیا، ئەو پێنج ساڵە ماوەی جەنگی دوەمی جیهانی بوو، (میسچ) دوایین پاسەوانی تایبەتی (هیتلەر) بوو کە لە ژیاندا بێت، هەروەک دوایین سەربازی ئەڵمانی بوو، کە (شوێنی خۆحەشاردانی هیتلەر)ی جێ هێشت، دوای ئەوەی سوپای سووری یەکێتی سۆڤیەت بەرلینیان داگیرکرد و وێرانیان کرد.

(ڕوکۆس میسچ) یەکێک بوو لەو شاهیدحاڵە دەگمەنانەی جەستە خوێناوی و ساردوسڕەکەی (هیتلەر)یان بینی، لە تەنیشت جەستەی (ئیڤا براون)ی هاوڕێی ژیانییەوە، لە سەر یەکێک لە قەنەفەکانی ئەو شوێنە تایبەتەی لە چیمەنتۆ دروستکرابوو بۆ خۆحەشاردان و پاراستنی هیتلەر، (نیکۆلا بۆرسییە)ی ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی، بۆ ماوەی چەند مانگێک بیرەوەرییەکانی پاسەوانە تایبەتییەکەی هیتلەری نووسیەوە و بڵاویکردەوە.

« میسچ، یەکێک بوو لە ئەندامانی دەستەی پاسەوانی تایبەتی هیتلەر و توانای هێندەی (20) سەرباز بوو، ئەرکەکەی بە پلەی یەکەم بریتی بوو لە پاراستنی ژیانی، هەروەها دابەشکردنی نامە تایبەتییەکان و وەڵامدانەوەی پێوەندییە تەلەفۆنییەکان لە بارەگای ڕاوێژکاریی، دواتر لە ژێرزەمینە تایبەتەکەی هیتلەر کە چەند هەفتەیەک تێیدا مایەوە»، هەروەها بەپێی ڕۆژنامەی (بەیان)ی ئیماراتی»دوای دیداری یەکەمیان، (ڕوکوس میسچ) هەستیکرد ئەوەی لە بەردەمیدایە فوهرەری بە ناوبانگە، نە کەسێکە لە سەروو مرۆڤەوە، نە دڕندەیەکی تۆقێنەرە، هیتلەر هیتلەرەکەی جاران نەبوو، کەسێکی ئاسایی بوو، لە ناوەڕاستی مانگی ئاداری (1945)دا، هیتلەر ژێرزەمینەکەی کرد بە بارەگای سەرکردایەتیکردن، بوە دوایین بارەگا و شوێنی فەرماندەیی کردنیشی.

(میسچ) لە قسەکانیدا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی (30 ئەپریلی ساڵی 1945)، کاتێک بۆردوومان و تۆپبارانی سۆڤییەتییەکان تا دەهات نزیکتردەبۆوە، (هیتلەر) نانی نیوەڕی دەخوارد، پاسەوانە تایبەتییەکەی لە یەکێک لە ڕاڕەوەکانی ژێر زەمینەکەدا چاوی پێی کەوت، کە زۆر هێمن و بێ دەنگ و لە سەرخۆ بوو، دەیویست چاوی بەوانە بکەوێت کە لە نزیک خۆی مابوونەوە، لە ڕاستیدا بۆ ئەوە هاتبوو تا بە هاوڕێیەتی (ئیڤا براون) بۆ هەمیشە ماڵئاواییان لێ بکات، ئەو گەڕانە چەند ساتێکی زۆر کەم بوو، دواتر و بۆ کۆتا جار، هیتلەر و ئیڤا گەڕانەوە بۆ ژوورە تایبەتەکەی خۆیان.

(میسچ) دەڵێت «جەستەی ماندووی هیتلەرم بینی، نەچوومە ئەو ژوورە، نزیکەی شەش بۆ هەشت مەتر دوورتر وەستام،

هیتلەر کەوتبوە سەر کورسییەکی بچووک و لە نزیکی مێزەکە بە سەر جەستەی خۆیدا چەمابۆوە، ئیڤاش لە نزیکییەوە بوو، بە جەستەی ئاماژەی بۆ کورسییەکەی هیتلەر دەکرد، سنگی کەمێک نزیکتربوو بەر ئەژنۆی هیتلەر کەوتبوو، بە پارچە قوماشێکی بۆر، جەستەی هیتلەریان پێچایەوە و لە دەرگای پشتەوە بردیانە دەرەوە و سووتاندیان».

تا ئێستاش، (ڕوچۆس میش)ی کارمەندی پێوەندییە تەلەفۆنییەکان، ئەو ساتەی لە بەرچاوە، بە تایبەتی لە ڕۆژی (30 ئەپریلی 1945)، کاتێک دەرگای ئەو ژوورە کرایەوە و بینی کە (هیتلەر و ئیڤا براون)ی هاوسەری خۆیان کوشتوە.

(ڕۆچۆس میش) دوایین کەسە کە لە ژیاندا مابێت، لەو گروپە کەمەی دیکتاتۆرە نازییەکەیان بە مردوویی بینی، لە شوێنێکی پارێزراوی ژێر زەویی بەرلیندا، پێش ئەوەی لە لایەن سوپای سوورەوە داگیربکرێت.

(میش) دەشڵێت « هیتلەر لە سەر کورسییەک دانیشتبوو و کەوتبووش بە سەر مێزێکدا، بەڵام ئیڤا براون لە تەنیشتییەوە کەوتبوو، من بە چاوی خۆم ئەوەم بینی، پێشبینی ئەوەمان دەکرد، بە ڕێکەوت نەبوو، هەموومان خۆمان بۆ کۆتاییەکەی ئامادەکردبوو».

(میش) کە ئەو کاتە تەمەنی (28) ساڵ بوو، باسی لەوەشکرد «ئەو ژوورەی من کارم تێدا دەکرد،بەرانبەر ئەو بەشە بوو کە دەچوە سەر ژوورەکەی هیتلەر، لەگەڵ نزیک بوونەوەی هێزەکانی ڕووسیا، کە چەند سەد مەترێک دووربوون لە شوێنە پارێزراوەکەی ژێرزەمینەکەوە، هیتلەر ماڵئاوایی لەو کەسانەکرد کە خزمەتیان کردوە و داواشی لێ کردن کەسییان نەچنە

ژوورەوە بۆلای. داواشی لە (مارتن برومان)ی دەستەڕاست و سکرتێرە تایبەکەی کرد، کە شاهیدی هاوسەرگیرییەکەیان بوو، تەرمەکەی بسووتێنێت، بۆ ئەوەی هەمان چارەنووسی (بینیتۆ مۆسۆلینی) هاوڕێی نەبێت، کە دوای لە سێدارەدانیشی، بۆ ماوەیەک بە ستوونەکانی سەر شەقام دا و لە ناوچەیەکی گشتیدا، بە هەڵواسراوی مایەوە بۆ ئەوەی هەموو کەس ببیبنیت».

(میش)، لە بارەی دواساتەکانی ژیانی هیتلەرەوە گوتیشی» دواتـر هیتلەر و ئیڤابـراون، چـوونـە ژوورەکــەی خـۆیـان و دەرگاکەشیان داخست، کاتەکە سەعاتێک یان دوو سەعات تێ پەڕی، من خۆم گوێم لە دەنگی فیشەک نەبوو چونکە لە سەر ئامێری تەلەفۆنەکە کارم دەکرد، بەڵام یەکێک هـاواری کردو گوتی لینگی، لینگی، هەست دەکەم شتێک ڕووی دابێت، لینگی پاسەوانی تایبەتی هیتلەر بوو».

ئەو پیاوەی کە هەموو ئەورووپای توشی توندوتیژترین و خوێناویترین ململانێ کرد لە مێژوودا، کەوتوە بە سەر مێزێکداو فیشەکێکیش بە سەریەوەیەتی، ئیڤا براونیش، لە سەر زەوییەکە جەستەی ساردبوو و ڕۆحی تێدا نەمابوو.

مێژوونووسان دەڵێن، هیتلەر پێش ئەوەی فیشەکێک بنێت بە سەریەوە و خۆی بکوژێت، ژنەکەی ژەهرخوراد کرد، دواتر هەردوو جەستەکە لە شوێنێکی نزیک ژێرزەمینە پارێزراوەکە بە سڵاوی نازییانەوە سووتێندران.

ئەو کارمەندی پێوەندییە تەلەفۆنییانە ئاماژەی بەوەشکرد، سەرکردەکان داوایان لە هیتلەرکرد لە ڕێگەی فڕۆکەوە هەڵبێت، بەڵام ڕەتیکردەوە و سوربوو لە سەر ئەوەی لە بەرلین بمێنێتەوە، تا دواساتەکانیش، هیتلەر پێی وابوو بەریتانیا پەشیمان دەبێتەوە

لەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ ڕووسیای شیوعیدا ئیمزای کردبوو.

(میش) بەشداربوو لە بەرهەمهێنانی فیلمی (کەوتن)ی دەرهێنەر (ئۆلیڤەر هێر شپیگل)دا، کە یەکێکە لە فیلمە مەزنەکان و باس لە دواڕۆژەکانی ژیانی (ئەدۆڵف هیتلەر) دەکات، سەرەڕای ئەوەی کاردانەوەی جۆراوجۆری لێ کەوتەوە، بەڵام هەر لە سەرەتاکانی نمایشکردنییەوە توانی سەرکەوتنێکی گەورەی جیهانی و نێودەوڵەتی بە دەست بهێنێت.

(میش) تەئکیدیشیکردۆتەوە فیلمەکە پڕە لە هەڵە و نەدەبوو وێنەی ئەو ژوورە پارێزراوە بگیرێت، ئەو ژێرزەمینە شوێنێکی گەورە و پارێزراوبوو چەندین ژووری هەبوو، بەڵام شوێنەکەی کە چووین وەک خۆی تەنگەبەر و تەسک بوو، تەنها جێی ئەو پێنج کەسەی تێدا دەبۆوە کە شاهیدی خۆ کوشتنەکەی (هیتلەر و ئیڤا) براون بووین.

له (29ی یەنایەری ساڵی 2007)دا، (ڤیرۆنیکا برلسکۆنی) هـاوسـەری (سلڤیۆ برلسکۆنی) سـەرۆک وەزیـرانـی ئیتالیا، لـە(ڕۆژنـامـەی لاریـبـۆیـلـیـکـا)دا کـە دووەم بـەربـڵاوتـریـن و پڕخوێنەرترین ڕۆژنامەی ئیتالیایە، وتارێکی بڵاوکردەوەو تێیدا داوای لە (سلڤیۆ بیرلسکۆنی) هاوسەری کرد کە 20 ساڵ لەخۆی گەورەتربوو، بەشێوەیەکی ڕەسمی و ئاشکراداوای لێبوردنی لێ بکات، بە هۆی ئەوەی ژنان و کچانی تر زۆر دەدوێنێت و پێوەندییان لەگەڵدا دەبەستێت.

(ڤیرۆنیکا لاریۆ)ی تەمەن پەنجا ساڵ، لە وتارەکەیدا گوتبووی «سیڤلیۆ، کەرامەت و کەسایەتی بریندارکردووم، دەمەوێت بە ئاشکرا داوای لێبووردنم لێ بکات، لە کاتێکدا لە سەر ئاستی پێوەندیی تایبەتی نێوانیشمان داوای لێبووردنی نەکردوە»، تەئکیدیشیکردۆتەوە لەوەی کە دەیەوێت بەرگری لە کەسایەتی خۆی بکات وەک خانمی یەکەمی ئیتالیا و نموونەیەکی جوانیش پێشکەش بە کچەکانی بکات.

یەکێک لە بەشداربووانی بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی (RIL) دا گوتی»ئیتالیا پێشتر جەنگێکی گوڵی هاوشێوەی ئەم جەنگە بەخۆیەوە نەبینیوە، ئاماژەی بەوەشکردوە بابەتەکە دورە لە گاڵتەجاڕییەوە، چونکە (ڤیرۆنیکا) زۆر بە جدی مامەڵە لەگەڵ ئەو دۆسیێیەدا دەکات».

هاوسەرە لە خۆباییەکەی سـەرۆک وەزیرانی ئیتالیا، لەو وتـارەیـدا باسی لـەوەشـکـردوە «بیرلسکۆنی یەکێک لە کچە هونەرمەندە تازە دەرکەوتوەکانی بەرنامەیەکی لە تەلەڤزیۆنی (میدیاسات)ی زۆر دوانـدوە، کە خـۆی خاوەندارێتی دەکات و گوتبووی «ئەگەر هاوسەرگیریم نەکردایە، ئـەوا یەکسـەر

هاوسەرگیریم لەگەڵ دەکردیت و لەگەڵ تۆدا دەچووین بۆ هەموو شوێنێک».

چەند مانگێکی کەم دوای بایەخپێدانی زۆری ڕۆژنامەکانی ئیتالیا بە بابەتی ناکۆکی نێوان (سیلڤیۆ بیرلسکۆنی) سەرۆک وەزیرانی پێشووی ئیتالیا و هاوسەرەکەی، جارێکی تر و بە تایبەت لە مانگی مارسی هەمان ساڵ دا (بیرسلکۆنی) بۆوە بە مانشێت و بابەتی سەرەکی ڕۆژنامە و میدیاکان، ئەوەش دوای ئەوەی یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتە وێنەیەکی بیرلسکۆنی لەگەڵ چەند کچێکی گەنجدا بڵاو کردەوە، وێنەکەش دەوڵەمەندترین پیاوی ئیتالیابوو کە لە ڤێلاکەی خۆیدا لە (ساردینیا) بە هەر دوو دەستی چەند ژنێکی گرتوە و لە سەر ڕانی دانیشتوون، ئەو وێنەیە بوە بەرگی گۆڤاری (ئوگی) تایبەت بە بڵاو کردنەوەی هەواڵی کەسانی بە ناوبانگ و چەند ڕۆژنامەیەکی تریش هەمان وێنەیان بڵاوکردەوە.

لەو بارەیەوە (نیکۆلۆ جیدینی) پارێزەری (برلیسکۆنی) باسی لەوەکرد ئەو وێنانە بە شێوەیەکی نایاسایی گیراون، هەندێک کەسیش مافی ژیانی تایبەتییان پێشێلکردوە، لەو ئاهەنگەدا کە ژمارەیەکی زۆری پیاوانی کاری لێ بوە، لە دەرەوەی ئەو وێنەیەش چەندین کەسی تری لێ بوە جگە لە ستافی تایبەت بە خزمەتگوزاری و پاسەوانی.

لایەنگرانی (برسلکۆنی)ش، دەڵێن ئەو وێنەیە بە هیچ جۆرێک توشی شۆکی نەکردوون و ناونیشانەکەشی هیچ مانایەکی نییە، کە نووسیبووی (دۆستەکەی برلسکۆنی)، هەر لەو بارەیەوە ڕۆژنامەی (ئاڵ جۆرناڵی) کە لە لایەن خانەوادەی برلسکۆنییەوە

خاوەنداریێتی دەکرێت نووسیبووی بڵاو کردنەوەی ئەو وێنە و قسانە، تەنها (تۆڵەکردنەوەیەکی سیاسییانەی بچووکە).

پێشتریش (ڤیرۆنیکا) ی خانمی یەکەمی ئیتالیا و هاوسەری (سیلڤیۆ برلسکۆنی)، دەمامکی سەر پێوەندییەکەی نێوان خۆی و هاوسەرەکەی لابردبوو، هەمیشەش باسی لە هەندێک بابەتی زۆر نهێنی ژیانی و هەندێک ڕەفتار و هەڵس و کەوتی نامۆی دەکرد.

لە کتێبی بیرەوەرییەکانیشیدا بە ناونیشانی (هەنگاوەکانی ڤیرۆنیکا)، (ڤیرۆنیکا لاریـۆ)ی هونەرمەندی پێشوو کە بە خۆشەویستییە بێ سنوورەکەی بۆ گۆشەگیری ناسراوە و ڕۆژێکیش بە جەستەیەکی نیمچە ڕووتـەوە لە سەر تەختەی شانۆ دەرکـەوت، باسی لەوەکردبوو کە دیارترین خووەکانی هاوسەرەکەی بریتییە لە قسەکردنێکی زۆر بە دەم خەوەوە و کۆ کردنەوەی بووکەڵەکانی ناپلیۆنە.

ڕۆژنامەی (زە سکۆتسمان) لە زاری (ڤیرۆنیکا برلسکۆنی) ییەوە ڕایگەیاندبوو، کە هاوسەرەکەی حەزی زۆر لە ڕاگەیاندنە و هەر کاتێک سەیری کردوە هێدفۆنی مۆبایلەکەی لە گوێدا بوە.

ڕۆژنامەکە باسی لەوەشکردوە، (ڤیرۆنیکا) دوور لە چاوی میدیا و کامێراکان دەژیـی، بە جۆرێک میدیاکان بایەخێکی زۆریـانـدا بە ئامادەبوونی (ڤیرۆنیکا برلسکۆنی) لـەو ئێوارە خوانەی (برلسکۆنی) بۆ (جۆرج بۆشی کوڕ) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA) و هاوسەرەکەی ڕێکخستبوو، بایەخدانی ڕۆژنامەکانی ئیتالیا، بە ئامادەبوونی (ڤیرۆنیکا) لەو ئێوارە خوانەدا، نزیک بوو لە بایەخدانی میدیاکان بە گرینگی سەردانەکەی جۆرج بۆش بۆ ئیتالیا.

بەڵام ئیتر ئەو جارە، (ڤیرۆنیکا) ی تەمەن (47) ساڵ، وازی لە بێ دەنگی هێنا و سەرەڕای ئەوەی هەمیشە بە خاوەنی تایبەتمەندییەکانی هاوسەرێکی نموونەیی وەسفدەکرا، بەڵام بڕیاریدا چیتر بێ دەنگ نەبێت و بیرەوەرییەکانی بنووسێتەوە و بڵاویان بکاتەوە.

(ڤیرۆنیکا) ، کە دایکی پێنج منداڵەکەی برلسکۆنییە دەڵێت، لێ گەڕاوە تا برسلکۆنی سروشتی خۆی پیادە بکات و ڕۆڵی یۆلیۆس ببینێت، دەشڵێت لە ژیانیدا جۆرێک لە ئەفسانە بوونی هەیە و هەمیشە ویستویەتی بچێتە نێو ژیان و کەسایەتی پاڵەوانەکانەوە.

هەروەک باسی لەوەشکردوە «لای کەسایەتییەکی وەک کەسایەتی برلسکۆنی، هەستم کردوە کە من هاوسەرێکی نموونەیی دەبم بۆی، لێی گەڕام تا تەرخان بێت بۆ کارەکەی، هاوسەرێک نەبووم هەمیشە کێشەی بۆ دروست بکەم لە سەر ئەوەی کە لە ماڵەوە نییە و لە نێو خێزانەکەیدا نییە، پێشتر هیچ کاتێک لە ناو ماڵەکەمان دا شەڕمان نەبوە» .

(ڤیرۆنیکا) ، ئەوەشی ئاشکراکردوە، کە هەمیشە هاوسەرەکەی سەرقاڵی تەلەفۆنکردن بوە و هیچ کاتێک ئامێری تەلەفۆنەکەی لێ دوور نەبوە، (ڤیرۆنیکا) کە لە ساڵی (1980) دا هاوسەرگیری لەگەڵ (برلسکۆنی) کردوە، ئاماژەی بە نەبوونی هەندێک حاڵەتی ڕۆمانسی کردوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا و دەڵێت «لە ماوەی (25) ساڵی ڕابردوودا و تا ئێستا هیچ ڕۆژێک نەبوە چێژمان لە خۆرئاوابوون یان هەر دیمەنێکی تر وەرگرتبێت و زەنگی تەلەفۆنێک لێی تێک نەدابین».

(ڤیرۆنیکا) بێزاری و تووڕەیی خۆی لە تەلەفۆنەکانی هاوسەرەکەی نەشاردۆتەوە، کە هیچ کاتێک لێی دووورناکەوێتەوە

و دەڵێت «ئامێری تەلەفۆنکردنەکە وەک لەزگە بە گوێکانییەوە نووساوە، کاتێک نانمان لەگەڵ دەخوات تەلەفۆنەکە بە گوێیەوەیەتی، تەنانەت لە جەژنی سەری ساڵی نوێشدا، کاتێک کەڵەشێری لەگەڵدا دەخواردین، بە هەمان شێوە بە تەلەفۆنەکەی قسەی دەکرد، تەنانەت زۆر جار لە کاتی خەویشدا بینیومە کە بە دەم خەوەوە قسەی لەگەڵ خۆیدا کردوە «.

ڕۆژنامەیەکیش ئاماژەی بە هەندێک دەنگۆ کردوە بەوەی چەند کێشەیەکی نهێنی لە نێوان ئەو دوو هاوسەرەدا هەیە، بە هۆی ئەوەی زۆر بە کەمی و پێکەوە لە میدیاکاندا دەردەکەون، ڕۆژنامەکانی ئیتالیا (برلسکۆنی) ملیۆنێری ئیتالیشییان بەوە تۆمەتبارکردوە هیچ هەوڵێکی نەداوە بۆ کەمکردنەوە و ڕەتکردنەوەی ئەو دەنگۆ و پڕوپاگەندانە.

(ڤیرۆنیکا) حەز و ئارەزوویەکی زۆری هاوسەرەکەی ئاشکرا کردوە بەوەی ببێتە (ناپلیۆن پۆناپارت)ی سەرکردەی گەورەی فەرەنسا، دەشڵێت (بیرلسکۆنی) حەزی زۆری لە کۆ کردنەوەی پارچەی سیرامیکی پەیکەر و بووکەڵەی ناپلیۆن پۆناپارت بوە، هەروەها داواشی لە کاریکاتێریستێک کرد تا وێنەیەکی بکێشێت و کڵاوێکی هاوشێوەی کڵاوەکەی ناپلیۆنی بکاتە سەر و پێڵاوێکی هاوشێوەی پێڵاوەکەی ناپلیۆنیشی لە پێ بکات، کتێبەکەی (ڤیرۆنیکا) چەند دیمەن و بەسەرهاتێکی خۆش و پێکەنیناوی گێڕاوەتەوە، بە تایبەتی لە قۆناغی منداڵی و قۆناغی نواندنیدا و دەڵێت «جارێکیان بە (برلسکۆنی)م گوت، شوقەکەم لە ڕۆما زۆر ساردە، کەچی لە بەرانبەردا لێفەیەکی دامێ بە دیاری کە لە خووری دروستکرابوو، ئەو هەڵوێستەی زۆر جوان بوو، پێکەنیم، بەڵام هەڵوێستێکی زۆر کاریگەر بوو».

(ڤیرۆنیکا) لە کتێبەکەیدا باسی لەوەشکردوە هەموو کات بۆچوون و دیدگاو ڕوانییەکانیان لەگەڵ (برسلکۆنی)دا وەک یەک نەبوە، ئەو هەمیشە ڕاستڕەوێکی میانڕەوی خۆش دەویست، بەڵام زۆرینەی جار من جیا کاری ناکەم لە نێوان پارتەکاندا، جارێک توندڕەوەکان هەڵدەبژێرم و جارێکیش کۆمەڵایەتییەکان.

لە لێدوانێکیشیدا بۆ گۆڤاری (مایکرۆمیگا)ی چەپڕەو، (ڤیرۆنیکا) ئاشکرای کردوە کە زۆر دژی هەڵوێستی هاوسەرەکەی بوە بۆ بەشداریکردن و چوونە ناوجەنگی دژی عیراقەوە و دەڵێت» بە تەواوی دژی جەنگم، ئێستاو دوای ئاشکرابوونی بابەتەکە، باوەڕی تەواوم بە بڕیار و هەڵوێستەکەی ئەو کاتەم زیاتر بوە».

(ڤیرۆنیکا) لە کۆتایی کتێبەکەیدا ئاشکرای کردوە «بۆ ماوەی ساڵێک مۆڵەت وەردەگرم و لەماڵەوە دوور دەکەومەوە»، دەشڵێت «بەم نزیکانە ساڵێک تەرخان دەکەم بۆ خۆم، بە تەنها هەموو جیهان دەگەڕێم بە بێ ئەوەی کەسم لەگەڵدا بێت»، گوتیشی «ئەوە دەهێنمە بەرچاوی خۆم کاتێک بە بێ ئەوەی سەیری کات بکەم بەپێ بە سەر شەقامەکاندا دەڕۆم، چونکە من زۆر حەزم لە ڕۆیشتە، هەر وەک حەزیش دەکەم هۆکارەکانی گواستنەوەی گشتی وەک پاس و شەمەندۆفێر بە کار بهێنم». لە بارەی هۆکاری گەشتکردنیشی بە تەنها و بە بێ هیچ هاوڕێیەک، (ڤیرۆنیکا) دەڵێت «بیرۆکەکە لە هەستێکی ڕۆمانسییەوە وەرگیراوە، دەمەوێت هەم خودی خۆم و هەم جیهانیش ئاشکرا بکەم و بیدۆزمەوە، دەمەوێت پێش هەنگاونان بەرەو قۆناغی داهاتووی ژیانم، ئەم کارە بکەم»، هەر چەندە (ڤیرۆنیکا) ئاماژەی بە وردەکاری قۆناغ و هەنگاوی داهاتووی نەکرد، بەڵام ئاماژەی بەوەکرد دەیەوێت پەراوێزخستن و پشتگوێخستنی خۆی کەمتر

بکاتەوە و وەک پێشوو نەبێت، هەر وەک گوتیشی، «دەمەوێت بوون و کاریگەرییەکی زیاترم هەبێت، بۆ ئەوەی ببمە شتێکی زۆر گرینگ و بە بایەخ».

بە پێکەنینەوە و وەک نامەیەک بۆ هاوسەرەکەی گوتی «نیگەران مەبن، لە سەر لاپەڕەی ڕۆژژمێری ساڵ دەرناکەوم»، نووسەری بیرەوەرییەکانی (ڤیرۆنیکا) باسی لەوەکردوە نزیکەی (12) ساڵ هەوڵیدا تا توانی (ڤیرۆنیکا) ڕازی بکات بیرەوەرییەکانی بنووسێتەوە، ئەو نووسەرە دەشڵێت «ڤیرۆنیکا ژنێکی وریا و زیرەکە، هیچ کەسێک ناتوانێت بچێتە ناو دونیا تایبەتەکەیەوە ئەگەر خاوەنی متمانە نەبێت،من دوای (12) ساڵ لە یەکتر ناسین توانیم ئەو متمانەیە بە دەست بهێنم».

بەم جۆرە و لە ساڵی (1980)دا لە شاری میلانۆ، بە تەنها ساتێک و بە نیگایەکی جادوویيانە، ملیۆنێرە ئیتالییەکە توشی خۆشەویستییەکی کتوپڕبوو، دوای بینینی هونەرمەندێک کە سەما دەکات و لە سەر شانۆ نواندن دەکات، لە بەردەمیدا نوشتایەوە و هەرچی پارەیەک لە گیرفانەکانیدا بوو هەڵیدایە بەر پێکانی و سوێندی بە هەموو پیرۆزییەکانی ژیانی بۆ خوارد کە دەبێتە یەکەم و دوایین عیشق لە ژیانیدا و لە پێناوی ئەودا ژنەکەی بە جێ دەهێڵێت و هەموو تەمەنیشی پاڵ دەکەوێت تا بە سەریدا بڕوات، هەر وەک ئەوەی (کیلۆپاترا) توانی بچێتە ناو دڵی (قەیسەری ڕۆما)وە.

بەو جۆرە زیاتر لە (20) ساڵ تێ پەڕی، بەڵام شۆڕە سوارەکە هەستی بە نیگەرانی و بێ تاقەتی دەکرد، بۆ ئەوەی ژیانی نوێ بکاتەوە، چانسی خۆی لە سیاسەتدا تاقیکردەوە، ژیانی بوو بە بەشێک لە کۆبوونەوە و دیدار و کۆنگرە و

وتاردان، بەم جۆرە (ساندریلای جوان)ی لە بیرکرد کە نزیکەی (20) ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو.

بە ئازایەتییەکی زۆرەوە هونەرمەندەکەی پێشووی ئیتالیا و هاوسەری سەرۆک وەزیرانی ئێستای ئیتالیا (ڤیرۆنیکا لاریۆ)، کە ئێستا بۆتە (ڤیرۆنیکا بیرلسکۆنی) دانی بە بەشێک لە نهێنییەکانی ژیانی خۆی و ژیانی هاوسەرێتییەکەیدا نا، ئەمەش دوای بیست و پێنج ساڵ یان چارەکە سەدەیەک لە بێ دەنگی، تەنانەت هەندێک کەس پێیان وابوو توانای قسەکردنی لە دەست داوە.

لەو کاتەوە کە (برلسکۆنی) تێکەڵاوی سیاسەت بوو، (ڤیرۆنیکا) لە بەرچاو نەما و حەزی بەوە نەبوو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا، بەشداری بۆنە و ئاهەنگە ڕەسمییەکان بکات، دواجار هاوسەرە جوانەکەی (برلسکۆنی)، بەوپەڕی بوێری و ڕاستگۆییەوە وەڵامی پرسیاری کچە ڕۆژنامەنووسێکی هاوڕێی دایەوە و بەم دواییانە لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (ئارەزووەکانی ڤیرۆنیکا) بڵاو کرانەوە.

(ڤیرۆنیکا) لە بیرەوەرییەکانی دا دانی ناوە بەوەی هیچ کاتێک (برلسکۆنی) لەگەڵی نەچوە بۆ بینینی شانۆ، یاخود سینەما، یان ئاهەنگ و کۆنسێرتی موزیک و گۆرانی، هیچ کاتێکیش پێکەوە کتێبێکیان نەخوێندۆتەوە و بە هێواشی و بە بێ دەنگی لە باخچەیەکدا پیاسەیان نەکردوە و وەک دوو هاوسەری ئاسایی و خۆشەویست پێکەوە نەچوون بۆ بازاڕکردن، هەروەها هیچ کاتێکیش ناوەستێت لە قسەکردن و وەڵامدانەوەی مۆبایلەکەی، ئەو گوێی لێ نەگرتوە و بایەخی نەداوە بە بۆچوون و هەڵوێستە سیاسییەکانی، پێی باشبوە سەرقاڵ نەبێت بە سیاسەتەوە، هەر وەک هیچ گرینگی و بایەخێکیشی نەداوە بە ئارەزووەکانی

هاوسەرەکەی، بۆ نموونە کاتێک (ڤیرۆنیکا) پەیکەرێکی لە برۆنز دروستکرد، (برلسکۆنی) پێی گوت «هیوادارم ئەم شتە ناشرینەت نەکڕیبێت»، ڤیرۆنیکاش لە وەڵامدا گوتی «نەمکڕیوە، بەڵام خۆم دروستم کردوە»، بۆیە برلسکۆنی خێرا لە قسە و هەڵوێستەکەی پەشیمان بۆوە و گوتی دەزانی، «یەک جار بەو شێوەیە خراپ نییە».

وەک لە بیرەوەرییەکانیدا دەردەکەوێت، ڕاستگۆیی بوونی نەبوە، وەک هەوڵێکیش بۆ جوانکردنی وێنەی (بیرلسکۆنی) لای ئیتالییەکان، پێش هەڵبژاردنی ساڵی (2001)، (بیرلسکۆنی) (12) ملیۆن دانەی لە سیڤی کەسێتی خۆی بە ناویشانی (چیرۆکی ئیتالییەک) بڵاو کردەوە، دەکرێت بڵێین ئەو سیڤییە گەیشتە هەموو ماڵێکی ئیتالیا، لەو بیرەوەرییەیدا، وێنەیەکی خۆی لەگەڵ خێزانە دڵخۆشەکەیدا بڵاو کردۆتەوە، (هاوسەرەکەی و سێ منداڵەکەی)، سەرەڕای نووسین و گێڕانەوەی چیرۆکی ئاسودەیی هاوسەرگیری و ماڵەکەی وەک ژینگەیەکی ئارام و ئاسایش لە ژیانیدا، کە دوای چەندین کاتژمێر لە کارکردن و ماندووبوون، دواجار دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماڵ و ژینگە ئارامە و تێیدا هەم پشوو دەدات هەم ماندوێتی و نیگەرانییەکانی دەڕەوێتەوە.

هاوسەری ئەو پیاوە گرینگ و کاریگەرە ئەرکی خۆی لە هەموو لایەکەوە بە جێ گەیاند، هیچ نەماوەتەوە جگە لەوەی پاداشت بکرێت، بەوەی مۆڵەتی ساڵێک وەربگرێت و بە هەموو دونیادا بگەڕێت، سواری پاس و ئۆتۆبۆس و میترۆ ببێت و چەندین میل بەپێ بڕوات بە بێ گوێدانە کات، وەک لە کتێبەکەیدا ئاماژەی پێ کردوە، دوای ئەمە و کاتێک دەگاتە قۆناغی پەنجا ساڵی، قۆناغێکی نوێی ژیانی دەست پێ دەکات.

هیچ ڕۆژێک خانەوادەی شاهانەی بەریتانیا بەدەر نەبوە لە قسەوقسەلۆک لە بارەی پێوەندی ڕۆمانسی و خۆشەویستی تێیدا، لەو بوارەشدا بە ناوبانگترین خانەوادەی شاهانەن لە سەر ئاستی دونیا، یەکێک لە بە ناوبانگترین چیرۆکەکانی عیشق و خۆشەویستیش، چیرۆکەکەی (شا هێنری هەشتەم) ە، کە بە شێوەیەکی ڕەسمی شەش جار هاوسەرگیری کردوە، یەکەم ژنی لێی جیا بۆوە و بۆ ئەوەی بە دەستبەسەرکراوی بە تەنهایی بمرێت، دوانیشیان سەریان بڕدرا و گیانیان لە دەست دا، یەکێکیشیان بە سەر منداڵبوونەوە گیانی لە دەست دا، پێنجەمیشیان بە شێوەیەکی ئاسایی جیا بۆوە، پێش ئەوەی شەشەمیان هیچی لێ بێت، خۆی مرد، هەر ئەوەش هۆکاری تەمەن درێژییەکەی بوو.

هیچ بەڵگە و ئامارێکی ڕەسمی و متمانەپێکراو بوونی نییە، لە بارەی ژمارە و ناوی دروستی دۆست و خۆشەویستەکانی (شا هێنری هەشتەم)ەوە، بەڵام تاکە شتێک زانراوە و گومانی لە سەر نییە، ئەوەیە ژمارەی دۆست و خۆشەویستەکانی کەم نین و زۆر بوون.

(هێنری هەشتەم) دەیویست لە (شازادەی ئیسپانی کاسرین ئەرگۆنی) هاوسەری یەکەمی کوڕێکی ببێت، بەڵام هیچ منداڵێکی تری نەبوو جگە لە کچێک بە ناوی (ماری)، چونکە هەر جارێک دوو گیان دەبوو، (کاسرین) منداڵەکەی لەباردەچوو یان بە مردویی لە دایک دەبوو، بۆیە (هێنری هەشتەم) نەیتوانی لە هاوسەری یەکەم و دوەمی هیچ کوڕێکی هەبێت، بەڵام هاوسەری سێیەمی ئەگەرچی بە سەر منداڵبوونەکەیەوە گیانی لە دەست دا، بەڵام کوڕێکی تەندروستی پێ بەخشی و ناوینا (ئێدوارد).

(شا هێنری هەشتەم) بە تەنها کەسێکی ئالودە بە مێینە و ژنانە نەبوو، بەڵکوو کەسێکی زۆر دڵڕەق و خراپیش بوو، هیچ شتێک نەیدەتوانی ببێتە ڕێگر لە بەردەم بە دەستهێنانی ئەو شتەی دەیویست و حەزی پێ دەکرد، بە تایبەتی لە دوای ئەوەی بە شێوەیەکی تەواوەتی ئایینی دەوڵەتەکەی گۆڕی، لە پێناوی هاوسەرگیری و جیا بوونەوە دا، هەروەها دەستگرتن بە سەر کاروباری ئایینی وڵات و شوێنەکانی ئاییندارى و خواپەرستیدا، هیچ کاتیش دوودڵ نەبوو لە کوشتن و ئازاردانی زۆری هاوسەر و خۆشەویستەکانی.

(شا هێنری هەشتەم) لە زۆرینەی حاڵەتەکاندا، ڕێگە و شێواز و داهێنانی لە هیچەوە دەدۆزییەوە، تا میراتگرێکی شەرعی و یاسایی دروستکرد، بەڵام (شا ئێدواردی شەشەم) لە تەمەنی (15)ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، دواتر دەسەڵات و تەختی پادشایەتی گواسترایەوە بۆ (ماری) خوشکی و دوای ئەویش بۆ (ئەلیزابێس)ی کچی باوکی، کە ئەوە یەکێک بوو لە نازناوەکانی و بە درێژایی تەمەنی هاوسەرگیریی نەکرد و لە ساڵی (1559) تا کۆچی دواییەکەی لە ساڵی (1603) دا سزا درا، ئەو کاتە تەمەنی (69) ساڵ بوو، ماوەی دەسەڵات و فەرمانڕەواییەکەی بە سەردەمی زێڕین و پێشکەوتن و گەشانەوە و سەرکەوتنی گەورە دادەنرێت، وەک سەرکەوتنی کەشتیگەلی بەریتانی بە سەر ئیسپانییەکاندا و دەرکەوتن و هەڵکەوتنی بەریتانیا وەک هێزێکی گەورەی جیهانی.

(هێنری هەشتەم) پادشای ئینگلتەرا، بە نازناوێکی تا ڕادەیەک نامۆ و سەیر ناسرابوو، ئەو نازناوە خائینی نیشتمان یان خائینی تەختی پادشایەتی نەبوو، ئەو نازناوە تەنها پێوەندی بە ڕەگەزی

بەرانبەرەوە هەبوو، چونکە مەبەستەکەش خۆی و ژنەکانی بوو، جۆرێک لە بە سیاسییکردن بە بابەتەکەیانەوە دیاربوو، بەو پێیەی کە لێرەدا خیانەت بەرانبەر بە هەموو ئەو شاژنانە کراوە کە لە تەنیشت پادشاوە و لە سەر تەختی پادشایەتی دانیشتوە، کە بە مانای خانمی یەکەمی وڵات دێت.

(هێنری هەشتەم) پادشای ئینگلتەرا، پسپۆڕیی وەرگرتبوو لە چۆنیەتی خیانەتکردن لە شاژنەکان، واتا خانمە یەکەمەکانی وڵاتەکەی و چۆنیەتی دەربازبوون لە هەر شەش ژنە ڕەسمییەکە و ئەوانەشی ددانــی بە یاسایی بوون و شەرعی بوونی پێوەندییەکانیدا نەناون، کە لەبەر خۆشەویست و بەرژەوەندی سیاسی دۆستایەتی و پێوەندی لەگەڵ بەستوون، (هێنری) سەری دوان لە ژنەکانی پەڕاندوە، (ئان پۆلین)ی ژنی دوەمی و (کاترین هیوارد)ی ژنی سێیەمی.

سەبارەت بە ژنە یاسایی و شەرعییەکانی تریشی، لە سیانیان جیابۆوە، بەڵام (کاترین بار)ی شەشەم ژنی، (هێنری) بە خاک سپارد و دوای تێ پەڕبوونی دوو هەفتە بە سەر مردنەکەی دا، هاوسەرگیری لەگەڵ خۆشەویستی یەکەمی دا کرد، ئەوەش وەک تۆڵەکردنەوەیەک لە دڕندەیی و ئارەزووی مێبازییەکەی (هێنری هەشتەم) پادشای ئینگلتەرا.

(هێنری هەشتەم) هەر لە قۆناغی لاوێتییەوە نموونەیەکی دیار و تەواوی شازادەکانی سەردمی گەشەکردن و پەرەسەندن بوو، تەمەنی هێشتا لە (18) ساڵ تێ نەپەڕی بوو، ڕوومەتە گەش و دەرپەڕیوەکانی ژیان و گەرموگوڕی و توانایان لێ دەباری، لە هەموو وەرزشێکی تایبەت بە ڕەگەزی نێرینەدا بە توانا و شارەزا و لێهاتوبوو، توانا و ناوبانگێکی زۆری هەبوو

لە ڕاوکردن و یاری قومار و ئەسپسواری و شمشێربازی و عیشقبازی ژنان دا.

(هێنری هەشتەم) هەڕەشە و مەترسییەکی زۆری بۆ تەختی شاهانەی خانەوادەی (تیۆدۆرۆ) دروستکرد، تا توانی هاوسەرگیری لەگەڵ (کاسرین ئۆفناراگۆن)دا بکات، کە خاتوونێکی خانەدان و جدی و خاوەن ڕەوشتێکی زۆر بەرز بوو، چەند ساڵێکیش لەو گەورەتربوو، (کاسرین) ژنی (ئارسەر)ی برا گەورەی بوو، کە بە شێوەیەکی کتوپڕ و لە تەمەنی (16) ساڵیدا، دوای چوار مانگ لە هاوسەرگیری کۆچی دواییکرد.

لە ساڵی (1503)دا پاپا پۆلسی دوەم، لە فتوایەکیدا ڕەزامەندیدا لە سەر هاوسەرگیریکردن لەگەڵ ژنی برایەکی کۆچکردووی دا، ئەگەرچی ئەم فتوایە ناکۆک و دژبوو لەگەڵ دەقێکی ڕەسمی سەردەمی دێریندا، کە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییەی ڕەت و پووچەڵ دەکردەوە.

(هێنری هەشتەم) و (کاسرین ئۆف ئەراگۆن) کچێکییان بوو بە ناوی (ماری)ییەوە ناونرا، بەڵام هیچ منداڵێکی کوڕیان نەبوو، هەر چەندە چەند جارێک لە سەریەک دووگیان بوو، بەڵام هەر لە سکی دایکیاندا دەمردن پێش ئەوەی لە دایک بن، یاخود چەند ڕۆژێکی کەم دوای لە دایک بوونیان دەمردن، هەر لەبەر ئەوە ئەو پادشا بێ ئارامە، نەیتوانی میراتگرێک بۆ تەختی دەسەڵات و پادشایەتییەکەی بخاتەوە، پێیان وابوو ئەوە نەفرەتێکە و لە هاوسەرگیرییەکەی کراوە، بۆیە (هێنری هەشتەم) پەنای بردە بەر (پاپای ڕۆما) بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەی جیایان بکاتەوە، بەڵام پاپا ڕازی نەبوو ئەو کارە زۆردارانەیە بکات، دوای ماوەیەکی کەم (هێنری هەشتەم) زانی ئەو پاپایە

دەسەڵاتی ئەوەی نییە هیچ فتوایەکی ئاینی دەربکات و خۆشی بە شایستەی نازناوی (پارێزەری باوەڕ) دەزانی، بۆیە مافی ئەوەی بە خۆیدا هاوسەرگیرییەکە کۆتایی پێ بهێنێت، بەڵام پاپای ڤاتیکان هەڕەشەی ئەوەی لێ کرد ئەگەر ئەو کارە بکات ئەوا لە هەموو سۆز و بەزەییەکی کڵێسا بێ بەش و بێ بەری دەکات.

(هێنری هەشتەم) هیچ ڕێگەچارەیەکی لە بەردەمدا نەمایەوە جگە لەوەی پەنابۆ پەرلەمانی وڵاتەکەی ببات، تا هاوکاری بکەن و پشتیوانی بکەن لە دژی دەسەڵات و کورسی پاپادا، پەرلەمانیش بڕیارەکەی لە بەرژەوەندی (پادشا هێنری) یەکلایی کردەوە، بەوەی (پادشا) ماف و دەسەڵاتی ئەوەی هەیە سەرۆکایەتی کڵێسەی ئینگلتەرا بکات، نەک دەسەڵاتی پاپای ڕۆما، پەرلەمان بڕیاریشیدا پادشا دەسەڵات و مافی ئەنجام دانی هەر کارێکی هەیە کە بیەوێت یان حەزی لێ بێت، هەروەها دەشتوانێت هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێک بکات کە بیەوێت، یان لە هەر هاوسەرێکی جیا ببێتەوە، بە بێ هیچ کێشە و ڕێگرییەکی ئاینی و شەرعی.

بەپێی بڕیارەکەی پەرلەمانی ئینگلتەرا کە لایەنگران و پیاوانی پادشا هێنری هەشتەم زۆرینەیان پێک دەهێنا، هاوسەرگیری نێوان (پادشا هێنری هەشتەم) و (کاسرین) بە ناڕەوا و هەڵوەشاوە دانرا، لە لایەن دەستوپێوەندەکانییەوە هەڕەشە لە هەر ئەندامێکی پەرلەمان کرا ئەگەر دژی بڕیاری مافی سەرۆکایەتی کڵێسا لە لایەن (هێنری)ییەوە دەنگ بدات ئەوا بە خیانەتی گەورە تاوانبار دەکرێت و سزا دەدرێت، بەم جۆرە هاوسەرگیرییەکە پووچەڵ کرایەوە و (کاسرین)یش لە لایەن پادشاوە دوور خرایەوە و ژیانی بە تەواوی لە ناوچوو.

لە یەنایەری ساڵی (1533)دا، (پادشا هێنری هەشتەم) هاوسەرگیری لەگەڵ (ئان پۆڵین)دا کرد، کە چوارمانگ پێش هاوسەرگیرییەکە دووگیان بوو لێی، (کرامەر) بەو پێیەی سەرۆکی دەستەی ئەساقیفەی کانتری بوو، ڕایگەیاند (ئان) هاوسەری شەرعی پادشایە، کە کاتی خۆی ناردبووی بۆ لای (کاترین)ی هاوسەری یەکەمی بۆ گەڕاندنەوەی ئەو خشڵ و زێڕانەی وەک شاژن بە کاری دەهێنان و دەیکردن بە خۆیەوە و بەخشینی بە (ئان پۆڵین)، کە دواتر بەو زێڕ و خشڵانە خۆی ڕازاندەوە و تاجەکەی کردە سەر، بۆ ئەوەی لە ئاهەنگێکی ڕازاوە و شکۆمەند و شاهانەدا وەک شاژنی ئینگلتەرا بناسێنرێت.

لە هەمان کاتدا، (کلیمێنت)ی پاپای ڕۆما ڕایگەیاند هاوسەرگیرییە نوێیەکەی پادشا هێنری هەشتەم، هاوسەرگیرییەکی پووچەڵە، ئەو منداڵانەشی بەرهەمی ئەو هاوسەرگیرییەیە نایاسایی و ناشەرعین، (پاپای ڕۆما)، (پادشا هێنری)شی لە هەموو بەزەییەکی کڵێسا بێ بەش کرد، بەڵام (پادشا هێنری هەشتەم) هیچ بایەخێکی بۆ ئەو بڕیارەی پاپا دانەنا و لە ڕێگەی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتییەکەیەوە یاسایەکی دەرکرد و تێیدا نووسرابوو هەر کەسێک قسە لە سەر ڕاستی و ناراستی هاوسەرگیرییەکەی پادشا و (ئان پۆڵین) بکات، شایستەی توندترین سزایە.

یاساکە بڕیاریشیدا لە سەر ئەوەی هەموو کەسێکی ئینگلیز بە ژن و پیاوەوە سوێند بخۆن بەوەی وەفادار و شوێنکەوتەی پادشا بن، هەر وەک تەئکیدیشیکردۆتەوە لە سەر دەسەڵات و سەروەری تەختی پادشایەتی بە سەر دەوڵەت و کڵیساوە لە ئینگلتەرا، هەر وەک کڵێسایەکی نیشتمانی نوێشی بۆ ئینگلتەرا بە

ناوی (کڵێسای ئینگلیکانی) دامەزراند، سزای لە سێدارەدانیشی بۆ ژمارەیەکی زۆری پیاوانی ئایینی و پیاوانی کڵێسا دەرکرد، کە ڕەتیان کردەوە سوێندی وەفاداری و شوێنکەوتەیی و دڵسۆزی بۆ (پادشا هێنری هەشتەم) بخۆن.

(ئان پۆڵین) منداڵێکی مردووی لە (پادشا هێنری) بوو، بەمەش (هێنری) زۆر تووڕە و بێزار بوو، بیری لە جیا بوونەوەیەکی تر و پووچەڵکردنەوەیەکی نوێی هاوسەرگیرییەکەی دەکردەوە.

بەپێی هەندێک سەرچاوەی مێژووییش، کە لە سەر زاری پادشا هێنری هەشتەمەوە گێردراونەتەوە و نووسراوەتەوە، (پادشا هێنری هەشتەم) گوتویەتی کە هاوسەرگیری دوەمی لە ژێر کاریگەری جادوو دا بوە، لەبەر ئەوە هاوسەرگیرییەکی پووچەڵە، لەو ماوەیەشدا (پادشا هێنری) بایەخێکی زۆری دەدا بە (جینی سیمۆر) کە یەکێک بوو لە هاوەڵ و خزمەتکارەکانی شاژن.

پادشا جارێکی تر کەوتە بە کار هێنانی ڕێگە و بیانوەکانی جاری پێشوو، بۆ ئەوەی هەم لە هاوسەرەکەی ئێستای جیا ببێتەوە، هەمیش هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا بکات کە چاوی کەوتۆتە سەری، ئەمەش دوای تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی باشترینی ئەوانەی لە نزیکی بوون.

هیچ کارێک لەوە ئاسانتر نەبوو، کە پادشا بتوانێت لەگەڵ یەکێک لە هاوەڵەکانی شاژندا لە ناو کۆشکدا پیلانی لەشفرۆشی (ئان) دابڕێژن، ئەوەبوو لە ڕۆژی یەکی مانگی مایۆی ساڵی (1536)دا ژنێک بە ناوی (لیدی وینگفیلد) بە پادشای گوت «شاژن تاوانی زینای ئەنجام داوە لەگەڵ پێنج پیاودا، کەیەکێکیان براکەمە».

به هۆی ئەم پیلانەوە، ڕۆژی دواتر پادشا هێنری هەشتەم، توانی (ئـان پۆلین)ی هاوسەر و شاژنی ئینگلتەرا، بنێرێت بۆ زیندانی تـاوەری لەندەن، هەمان ڕۆژ شاژن لە بەلەمێکدا ڕەوانەی (لیبرج) کرا، بە بێ ئەوەی بزانێت چ تاوان و تۆمەتێکی ئاڕاستە کراوە و لە سەر چی سزادراوە و دوور خراوەتەوە، دواتریش بە بێ بوونی هیچ بەڵگە و شاهیدێک دادگایی هەموو ئەو کەسانە کرا کە تاوانباربوون بە ئەنجام دانی زینا لەگەڵ شاژنی ئینگلتەرادا، بـەڵام لێکۆڵەرەوەکان شکستیان هێنا لە دەستکەوتنی ددان پێدانان و سەلماندنی تاوانەکە بە سەر هیچ یەکێک لەو کەسانەی تۆمەتی زیناکەیان درابوە پاڵ.

ئەگەرچی هیچ یەکێک لە ڕێگا و ڕێکارەکانی دەستوپێوەندەکانی پادشا لە پێدانی پارە و سامان، توندترین و خراپترین سزا، نەیانتوانی تۆمەتبارەکان ناچاربکەن، بـەڵام موزیکسیانێکی غەمگین، لە ترسدا ناچاربوو ددان بە تۆمەت و تاوانێکی ساختەدا بنێت بەوەی زینای کردوە لەگەڵ شاژنی ئینگلتەرادا.

سـەرەڕای ئەوەی هیچ بەڵگە و ددان پێدانانێکی ساختە و ناچارییانە لە سەر چوار تۆمەتبارەکەی تر بەردەست نەبوو، بەڵام دادگا بڕیاریدا کە هەموویان لە سێدارە بدرێن لە سەر ئەو تاوانەی ڕووبەڕوویان کرابۆوە.

دوای دوو ڕۆژیش لە بڕیارەکەی دادگا، سزاکە بە سەر ئەو چوارکەسەدا جێبەجێکرا کە ددانیان بەو تۆمەتەدا نەنابوو کە ئاڕاستەیان کرابوو، سزاکەش پەڕاندنی سەریان بوو تا شایستەی پلەو پۆستەکەیان بێت، سەبارەت بە موزیکسیانەکەش کە ددانی بە تاوانێکی نەکردەدا نابوو، لێکۆڵەرانیش سەرکەوتووبوون لە سەپاندن و ساغکردنەوەی تۆمەتێکدا، سزای لە سێدارەدان تامردنی

بە سەردا جێبەجێکرا، بۆ ئەوەی نهێنییەکە لەگەڵ خۆیدا بەرێتە ژێر گڵەوە و هیچ کەسێک ڕاستی ڕووداو و چیرۆکە هەڵبەستراوەکە و زینایەکی درۆ لەگەڵ شاژندا نەبیستێت و نەزانێت.

سەبارەت بە شاژن و براکەی، لە بەردەم گروپێکی (26) کەسی خانەداندا بە سەرۆکایەتی (دۆق ئۆن نورفلک) دادگاییکران، (دۆق) مامی شاژن بوو، بەڵام لە ڕووی سیاسیشەوە دوژمن و نەیاری بوو، خوشک و براکە، چەند جارێک تەئکیدیانکردەوە کە هیچ تاوانێکیان نەکردوە و ئەو تۆمەتەشی ئاڕاستەیان کراوە ناڕاست و بێ بنەمایە، بەڵام دادگا بڕیاریدا بە سووتاندن یان سەربڕینیان بەپێی خواست و ویست و پادشا.

دوای سەرپەڕاندنی هاوسەری دوەمی پادشا، لە پێناو هاوسەرگیرکردنی سێیەمی پادشا هێنری هەشتەم لەگەڵ (جینی سیمۆر)ی یەکێک لە هاوەڵەکانی شاژندا، (کەرامەر)ی گەورەی ئەساقیفەکان، بیانوویەکی تری بۆ هاوسەرگیرییەکی نوێی پادشا دۆزییەوە، کە هەوڵدانییەتی بۆ لە دایک بوونی کوڕێک بۆ ئەوەی ببێتە میراتگری تەختی دەسەلات و پادشایەتی.

ڕۆژێک دواتر، پادشا هێنری، (جینی سیمۆر)ی مارەکرد و دواتر بە نهێنی هاوسەرگیری لەگەڵ کرد و گواستییەوە، لە ڕۆژی (4ی یۆنیۆی ساڵی 1526) دا کردییە شاژنی ئینگلتەرا، (جینی) بەشێک بوو لە نەوەی خێزانێکی پادشایەتی کە دەچوونەوە سەر پادشا ئێدواردی سێیەم، هەر چەندە خاوەنی جوانییەکی تایبەت و سەرنج ڕاکێش نەبوو، بەڵام بە زیرەکی و ژیری و سادەیی و لە خۆبووردوویی و کەشخەیەتییەکەی کاریگەری لە سەر زۆرینە دروستکردبوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەک سەردەمی ژیانی ئان پۆلینی لە یاد نەچووبۆوە، کاتێک هەموو دیارییەکانی

ڕەتکردەوە و ڕێگەی نەدەدا لێی نزیک بێتەوە، هەروەها بە بێ ئەوەی بیانخوێنێتەوە هەموو نامەکانی کە بۆی دەنارد، وەک خۆی بۆی دەناردەوە و لەگەڵ کۆمەڵێکدا نەبوایە ڕێگەی نەدەدا قسەشی لەگەڵ بکات.

کاتێک (جین سیمۆر) دووگیان بوو، پادشا هێنری هەشتەم، ئەنجوومەنی نوێنەرانی وڵاتەکەی کۆ کردەوە و بڕیاری دا تاجی جێنشینی بخرێتە سەر ئەو منداڵەی لە (جۆن سیمۆر) دەبێت و ئەگەری زۆریشی هەیە کوڕ بێت، ئەوەبوو لە ئۆکتۆبەری ساڵی (1537)دا، پادشا کوڕێکی بوو لە (جۆن سیمۆر) و ناونرا (ئێدواردی شەشەم) بەوەی لە داهاتوودا دەبێتە پادشا، بەڵام (هێنری) ئەو خەون و خواستەشی نەهاتەدی و منداڵەکە مرد.

(جین سیمۆر)ی شاژن، بەرگەی ئازاری مردنی کوڕەکەی نەگرت، بۆیە ئەویش بوە قوربانییەکی تری جیا بوونەوە، کەوتبوە ناو ترسێکی زۆرەوە و چاوەڕێی جیا بوونەوەکەی نەکرد و (12) ڕۆژ دوای لە دایک بوونی کوڕەکەی گیانی لە دەست دا و مرد.

پادشا هێنری هەشتەم، فەرمانی بە (کرۆمۆیل)ی وەزیر و هاوڕێی کرد، بگەڕێت و شوێنگرەوەیەکی تر و دەرمان و چارەسەر و هاوژینێکی تری بۆ بدۆزێتەوە، ئەوەبوو (کرۆمێل) یش پێشنیاری کرد هاوسەرگیری لەگەڵ (ئان کلیفز)ی خوشکی هاوسەرەکەی شازادەی سەکسۆنیا و خوشکی (دۆق دی کلیفز) دا بکات، کە ئەو کاتە لە ناکۆکی و کێشە دا بوو لە گەڵ ئیمپراتۆری ئیسپانیا.

ئەوەبوو (پادشا هێنری)، فەرمانی کرد تا (هولین)ی وێنەکێش بچێت وێنەیەکی تایبەتی ئەو خانمە بکێشێت، بەڵام بە بێ ئەوەی

بزانێت، (کرۆمێل) چەند ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکی داوەتە وێنەکێشەکە، بۆ ئەوەی لە وێنەکەیدا شوێنیان بکاتەوە، دوای گەڕانەوەی وێنەکێشەکە و سەیرکردنی تابلۆکە، (هێنری) پێی وابوو، کەسێکی غەمگینە، بەڵام شایستەی خۆشەویستییە.

بەڵام کاتێک (کلیفەر) خۆی هات و ڕاستەوخۆ بینی، ئەو خۆشەویستییەی هێنری چاوەڕێی دەکرد لە چاوەکانیدا مرد و هەر لە یەکەم نیگاوە خۆشەویستییەکەی هەڵگەڕایەوە و بووبە ڕق و کینە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاوەکانی نووقاند و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، هیچ کاتێک وەک جاران پێوەندی لەگەڵ (کرۆمۆیل)دا ئاسایی نەبۆوە و مامەڵەی لەگەڵ نەکرد، دوای چوار مانگیش بڕیاریدا بە دەستگیرکردن و زیندانیکردنی وەزیرەکەی، بە هۆی تێوەگلان و نقوومبوونی لە چەندین هەڵەی گەورە و گەندەڵییەوە.

(هێنری هەشتەم) چەند جارێک ڕای گەیاند بـوو، ڕازی نەبوە بەو هاوسەرگیرییە و هیچ کاتێکیش لەگەڵیدا نەخەوتوە و تا ئێستا بە پاکیزەیی ماوەتەوە، ڕەزامەندبوو بەرانبەر بە بڕینەوەی مووچەیەکی باش و ژیانێکی شایستە و گونجا و بۆی لە ئینگلتەرا، هاوسەرگیرییەکە پووچەڵ بکاتەوە، بەڵام لە ڕۆژی (28ی یۆلیۆی ساڵی 1940) دا و دوای دادگاییکردنێکی دروستکراو، فەرمانیکرد بە پەڕاندنی ملی (کرۆمۆیل).

لە هەمان ئەو ڕۆژەی کە کرۆنیل سزای سەرپەڕاندنەکەی جێبەجێکرا، (هێنری هەشتەم) بۆ جاری پێنجەم هاوسەرگیریکرد، ئەم جارە لەگەڵ (کاترین هیـوارد)ی تەمەن (20) ساڵدا، کە لە خێزانێکی کاسۆلیکی بوو، هەر چەندە بە هیچ شێوەیەک دەستبەرداری بیروباوەڕەکەی خۆی نەبوو ددانیشی نەنا بە بیروباوەڕی پرۆتستانتیانەی پادشادا.

دەتوانین بڵێین (کاترین) جوانترین هاوسەری (پادشا هێنری هەشتەم) بوو، تا ڕادەیەکی باشیش دەیزانی چۆن خۆشی بوویت، هەمیشە سوپاسگوزاری خودای دەکرد بۆ ئەو ژیانە خۆش و باشەی لەگەڵ (کاترین)دا پێی بەخشیوە، بەڵام ڕۆژێک دوای گەڕاندنەوەی تەسبیحێکی سوپاسگوزاری بۆ (کاترین) لە لایەن سەرۆکی ئەساقیفەوە، بوە بەڵگەیەک لە سەر ئەوەی پێشتر (کاترین) پێوەندی هاوسەرگیری لەگەڵ سێ دەستگیرانی سزادراودا هەبوە.

دوان لەو کەسانە و هەروەها شاژنیش دانیان بە بوونی ئەو پێوەندییەدا نا، دوای ئەمە (پادشا هێنری هەشتەم) توشی خەم و خەفەت و ترس و نیگەرانییەکی زۆر بوو لەو نەفرەتەی توشی هەموو هاوسەرگیرییەکانی بوو، پادشا تا ڕادەیەک مەیلی هەبوو بۆ لێ خۆشبوونی شاژن، تا ئەو کاتەی بەڵگەیەکی تریان دایە دەست بەوەی شاژن لەگەڵ کوڕی مامی پادشادا زینایان کردوە، لە دوا هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ پادشا، (شاژن)یش، نەیشاردەوە کە لە درەنگانێکی شەودا، لە ژوورە تایبەتییەکەی خۆی چاوی کەوتوە بە کوڕە مامەکەی پادشا، بەڵام ڕەتی کردەوە کە نە ئەو شەوە و نە هیچ کاتێکی تر لە ماوەی هاوسەرگیرییەکەیدا هیچ گوناهێکی کردبێت، بەڵام دادگای پاشایەتی و لە سەر داوای خودی (پادشا هێنری هەشتەم) ڕای گەیاند، کە (شاژنە کاترین گوناهبارە).

ئەوەبوو لە ڕۆژی (13ی نۆڤەمبەری ساڵی 1542) دا و لە سەر بڕیاری پادشا، سزای سەرپەڕاندنی (شاژنە کاترین) جێبەجێکرا، کەللە سەری پەڕێندراوی (کاترین) کەوتە هەمان ئەو شوێنەی شەش ساڵ پێشتر کەللە سەری پەڕێندراوی (شاژنە ئان پۆلین)ی کەوتبوە ناوی.

(کاترین بار)ی شەشەم هاوسەری پادشا هێنری هەشتەم، کە لە ساڵی (1543)دا هاوسەرگیرییان کرد، پێش مردنی دوو هاوسەرەکەی پێشووتری بە تەنها دەژیا، لەگەڵ ئەوەشدا پادشا چیتر سوورنەبوو بۆ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچانی پاکیزەدا بکات.

(کاترین) ژنێک بوو خاوەنی هۆشیاری و سەلیقەیەکی باش بوو، لە دڵڕازیکردن و چاودێریکردنی پادشادا کە توشی نەخۆشی ببوو زۆر ئارام و لە سەرخۆ و هێمن و ددان بە خۆداگرتوو بوو، لە هەشت ساڵی کۆتایی فەرمانڕەوایەتییەکەیدا، هەوڵی زۆریدا بۆ ئەوەی هەڵچوون و توڕەییەکانی کەم بکاتەوە، چونکە (28) کەسی سووتاند بە تۆمەتی لادان و دەرچوون لە یاسا پیرۆزەکان.

شاژنە نوێیەکە توانی ببێتە دایکێکی باش بۆ کچەکانی، چونکە لەو سەردەمەدا (پادشا هێنری هەشتەم) تا دەهات جەستەی تێک دەچوو، باری تەندروستی زۆر خراپ ببوو، زۆر قەڵەو و ناڕێک بووبوو، بە تایبەتی لە لایەن شاژنەوە چاودێریی دەکرا.

پادشا هێنری هەشتەم لە بەردەمیدا ددانی نا بەوەی بە ناهەق (ئان بۆلین)ی هاوسەری دوەمی کوشتوە، لە کاتێکیشدا کە (پادشا) گیانی دەدا، (شاژن) سوێندی خوارد بەوەی دوای بە خاک سپاردنی پادشا، بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو پیاوەی خۆشی دەویست پێش ئەوەی لەگەڵ هێنریدا هاوسەرگیری بکات، دوای دوو هەفتەش لە بەخاکسپاردنی تەرمی پادشا، بەڵێنەکەی خۆی جێبەجێکرد.

کاتێک مێرد لە یاسا دەردەچێت و لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتی بە دوای چێژو ئارەزووویەکی هەرزان و بێ نرخ دا بگەڕێت، ئەوا ئاگر و دۆزەخی ژیانی وردە وردە دەردەکەوێت و ئاشکرا دەبێت، هەڵبەت ئەمە سەبارەت بە پیاوێکی سادە و ئاسایی ناو کۆمەڵگە، بەڵام کاتێک پیاوێک هەمان کردەوەی هەبێت و لە پێگەیەکی سیاسی بەرزدا بێت، یاخود لە پێگەی سەرۆککۆمار یان سەرۆک وەزیران یاخود وەزیردا بێت، ئەوا کێشەکە گەورەتر و کارەساتەکە ترسناکتر دەبێت، دەشبێتە ئابڕووچونێکی بەردەوام بۆ ئەو سیاسییە یان ئەو بەرپرسە بە درێژایی تەمەنی، هەر چییەک بکات و هەر چییەکی بەرانبەر بکرێت ئەوا تۆمار دەکرێت و بڵاو دەکرێتەوە.

زۆر جار هاوسەری ئەو پیاوە سیاسییانەی توشی ئەو ئابڕووچوونانە دەبنەوە، هاوسەرەکانیان بە جێ دەهێڵن بەو بیانوەی کەسایەتی و شکۆمەندی ژنانەی شکێنراوە، یاخود بۆ پاراستن لە چاوی دەسەڵات و ئەو ژیانەی پێشتر بە حوکمی ژنی سەرۆک یان سەرۆک وەزیران هەی بوە، ئەویش بە هەمان شێوەی هاوسەرەکەی تێک دەشکێت و دەکەوێت، دەبێت بیانوو بۆ ئەو خیانەتە بهێنێتەوە کە تێیدا دەژی، هەست دەکات زیادەڕۆیی کردوە لە پەرچەکرداری خیانەتی هاوسەرەکەیدا، بەمەش کەمێک لە ئاستی خیانەتەکە کەم دەبێتەوە و دەبێتە بوومەلەرزەیەکی سیاسی.

سەبارەت بە سەرۆککۆماری فەرەنسا (نیکۆلا سارکۆزی) یاخود (دون جوان)، هەر شتێکی توش دەبێت ئەوا بە هۆی پێوەندییەکانییەوەیەتی لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتی، (سیسیلیا)ی هاوسەرە جوانەکەی و دایکی منداڵەکانیشی بە

هەمان شێوە خیانەتی کردوە، دواتر (سارکۆزی) بۆ ئەوەی خۆی لەو دۆخە ڕزگار بکات، هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێک لە خۆشەویستە کۆنەکانی کرد بە ناوی (کارلا برۆنی)، کە نمایشکارێکی جلوبەرگی بە ڕەگەز ئیتالی بوو، ئەمەش هەمووی کەمتر لە ساڵێکی خایاند دوای ئەوەی لە هاوسەرەکەی جیا بۆوە و بە تەنها لە ئەلیزێ دەژیا.

(سارکۆزی) دوای ئەوەی شکۆمەندی (سیسیلیا)ی هاوسەری بریندارکرد و دڵی شکاند، پەنای برد بۆ باوەشی ژنانی تر، بەڵام (سیسیلیسا)ش کەمتەرخەمی نەکرد و دوای ئەوەی بە تەواوی لە چوارچێوەی خێزان و هاوسەرگیری چوە دەرەوە و ماڵەکەی بە جێ هێشت، ڕوویکردە (USA) بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بژی کە لەو وڵاتە نیشتەجێ بوو.

هەموو فەرەنسا دەیانزانی (سیسیلسا) لە چوارچێوەی هاوسەرێتی چۆتە دەرەوە و ژیانی هاوسەرگیرییەکەی بۆ هاوسەرەکەی جێ هێشتوە، بە تایبەت دوای ئەوەی گۆڤاری (باری مانش)ی فەرەنسی وێنەیەکی (سیسیلیا)ی هاوسەری بەهێزترین پیاوی حکوومەتی لە فەڕەنسا بڵاو کردەوە، کاتێک لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دەستیان لە ناو دەستی یەکدا بوو لە یەکێک لە شەقامەکانی نیویۆرکدا پیاسەیان دەکرد.

میدیای فەرەنسا باسیان لەوەدەکرد (سیسیلسا) لە هاوسەرەکەی دوورە و لەگەڵیدا دەرناکەوێت، تەنانەت باس لەوەش دەکرا، کە (سیسیلیا) لە هەموو فەرەنسا دوورە، (سیسیلیا) کێشە و ناکۆکییەکانی لەگەڵ (سارکۆزی) هاوسەر و سەرۆکدا کردە دەرفەتێکی باش بۆ ئەوەی بە تەواوی لە ژیانی هاوسەرێتی هەڵبێت و لەگەڵ پیاوێکی تردا بژی، کە ناوی (ئیڤن

ڕیچارد ئەتایس) بوو، پیاوێکی دەوڵەمەند و سەرمایەدار بوو، لە بواری ڕیکلامدا کاری دەکرد و لە چاو هاوکارەکانیدا زۆر بە ناوبانگ و بەهێز بوو، کەسێکی بە توانا بوو لە بواری پێوەندییە گشتییەکاندا، سەرپەرشتیاری ڕێکخستنی کۆڕبەندی داڤۆسی نێودەوڵەتی دەکرد، وردەکاری و پێوەندییە خۆشەویستییەکەیان پڕبوو لە گەرموگوڕی و هەستێکی زۆر، هەموو ڕۆژنامەکانی فەرەنسا و جیهانیش بایەخییان بە ژیانی ئەو دوو کەسە دەدا، بە تایبەتی لە دوای بڵاو کردنەوەی وێنەکەیان لە لایەن گۆڤاری (ماری باتش)ەوە، کە کرابوە بەرگی پێشەوەی گۆڤارەکە، بەوەش دڵی (سارکۆزی) لەتبوو، ژیانی بە تەواوی بوو بە دۆزەخ.

هەر چەندە لە دوای جیا بوونەوەی لە (سیسیلیا)، (سارکۆزی) توانی لەو کێشەیە ڕزگاری ببێت و بەردەوام بێت لە پیادەکردنی ژیانی ئاسایی و ڕۆژانەی خۆی، بە تایبەت لە دوای چوونییەوە بۆ کۆشکی ئەلیزێ، بەڵام درزێکی گەورە بۆ هەتایە وەک سێبەر بە سەر ئەو خانەوادەیەوە مایەوە، بە تایبەتی لە دوای ئەوەی (سارکۆزی) توانی ببێتە سەرۆککۆماری فەرەنسا.

واتا ئەو هۆکارانەی کە وایانکرد (سیسیلیا) لە هاوسەرەکەی جیا بێتەوە و بە دوای خۆشەویستی و عەشقدا بگەڕێت، لە جێگەیەکی تایبەت لە دەرەوەی خێزان و خانەوادەکەی خۆی، تا دەهات ناوی ئەو لیستە زیادی دەکرد کە بۆ یەکەم جار هۆکاری سەرهەڵدانی کێشە و ناکۆکی بوو لە نێوان (سارکۆزی و سیسیلیا) دا، یەکێک لەو هۆکارانەش بڵاو کردنەوەی وێنەیەکی سەردەمی گەنجێتی (سارکۆزی) بوو، کە پێوەندیی لابەلای لەگەڵ ژنانی تردا هەبوو، ئەو وێنەیەش هی کاتێک بوو (سارکۆزی) وەزیر بوو لە فەرەنسا و نەگەیشتبوە کۆشکی ئەلیزێ، هەندێک لە دوژمنەکانی

(سارکۆزی) ئەو وێنەیەیان بەجۆرێک لە جۆرەکان گەیاندە دەست (سیسیلیا)، ئەو وێنانە هۆکاربوون بۆ وەشاندنی گورزێک لە (سارکۆزی) لە لایەن (سیسیلیاوە) لە پێوەندییەکانی پێشووتریدا؟

لەوانەیە هەندێک وێنەی هاوشێوە، پاڵیان بە (سیسیلیا)وە نابێت لە پشت (سارکۆزی) هاوسەرە خیانەتکارەکەیەوە بوەستێت تا بتوانێت گرەوی هەڵبژاردن و سەرۆکایەتی فەرەنسا بباتەوە، بە تایبەتی چەند مانگێکی کەم پێش هەڵبژاردنەکە، (سیسیلیا) لە هاوسەرەکەی جیا ببۆوە و لەگەڵ خۆشەویستێکی تریدا دەژیا، (سارکۆزی) توانی (سیسیلیا) ڕازی بکات بگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی و لە هەڵبژاردنەکەدا پشتیوانی لێ بکات، ئەم کارانەش جگە لە ڕێککەوتنێکی کاتی و بۆ مەبەستێکی دیاریکراو هیچی تریان لێ بەرهەم نایەت و هەڵدەوەشێننەوە.

ئــەم گــورزە میدیاییە قـورســەی ڕووبـــەڕووی (نیکۆلا سارکۆزی ) بۆوە، لە سەر داوای هاوسەرە جیا بۆوەکەی بوو بۆ پێوەندییەک، کە ئامادەبوو گرانبەهاترین و گەورەترین و بە ناوبانگترین کۆشکی فەرەنسا کە کۆشکی ئەلیزی بوو بە جێ بهێڵێت، بە مانایەکی سادەتر، تازە ئەو ژنە هیچ باشییەک لەو پیاوەدا نابینێت، هەموو ئەو دەسەڵات و شاژنی و خۆشنوودی و خۆشـگوزەرانییـەی وەک خانمی یەکەمی فـەرەنـسا پێی دەبەخشرێت، ناتوانێت ڕێگربێت لەوەی ژیانێکی تر هەڵبژێرێت وەک ئەوەی لەو ژیانەدا بێت لەگەڵ هاوسـەرێکی خائیندا، بە تایبەتی کە ژنەکە هەمان خیانەتی لێ کردەوە و هەستی بە چێژ و خۆشییەکی زیاتر کرد لەگەڵ پیاوێکی تردا.

بـەم جـۆرە وێـنـەی (سـارکـۆزی) لـە بــەردەم ڕای گشتی فـەرەنـسـادا شێوا، ئەمە جگە لـەوەی وێنەشی وەک پیاوێک

ئەگەر ژنەکەشی بە جێی نەهێشتبێت، هێشتا لە بەردەم ڕای گشتیدا نادیار و ناڕوونە، بە تایبەتی پێشتر هەم ئەزموونی هاوسەرگیری تاقیکردبێتەوە، هەم ئەزموونی جیا بوونەوە، هەروەها هاوسەرگیریشی لەگەڵ بێوەژنێک دا کردوە، هەموو ئەمانە کارێکی قوورسن، بۆچوونی تۆ چییە کاتێک ژنی ئەو پیاوە ماڵەکەی بە جێ دەهێڵێت و دەچێت لە شوێنێکی تر دەژی و منداڵێکی سارکۆزیشی لەگەڵ خۆیدا بردوە؟

(نیکۆلا سارکۆزی) لە کتێبێکدا کە بەتیراژێکی زۆر لە سەر ئاستی فەرەنسا بڵاو بۆوە، ددانی ناوە بەوەدا کە بە هۆی دووری و بە جێ هێشتنی هاوسەرەکەیەوە، شکۆمەندی و خۆبەزلزانینەکەی توشی شکان بوە، هەر وەک بە هۆی بیرکردن و پێویستبوونییەوە بە هاوسەرەکەی بۆ ماوەیەکی زۆر هەم خۆی لێ ونبوە، هەم لە تەنهایی و دڵەڕاوکێدا ژیاوە، زۆر بە ئاشکرا و بە ڕوونی باسی لەوەشکردوە کە ئازار و ژانی دووری و جیا بوونەوە لە هاوسەرەکەی زۆر زیاتر بوە لە ئازار و سوێی بریندار بوونی کەسایەتی و شکۆمەندی مرۆڤ، ئەو ژنەکەشی لە هەموو ئەو ئازار و کێشە و دەردەسەرییانە دەبەخشی کە توشی کردوە، ئەگەر دووبارە بگەڕایەتەوە بۆلای و سەر لە نوێ ژیانێکی نوێ و هاوبەشیان بۆخۆیان دروست بکردایەتەوە.

چوونی (سیسیلیا) بۆ کۆشکی (ئەلیزێ)، بەپێی ئەو مەرجانە نەبوو کە بۆچوونی خۆی و خێزانە تێکەڵاوەکەی دای نابوو، خێزانەکەی پێک هاتبوون لە دوو کچی (سیسیلیا) لە هاوسەری پێشووی، دوو کوڕی (سارکۆزی) لە هاوسەری پێشووی، هەروەها کوڕێکی هاوبەشی (سارکۆزی و سیسیلیا)، (سارکۆزی و سیسیلیا) دەستی یەکیانگرت و لە سەر فەرشێکی سوور و

لەگەڵ میوانەکانیاندا چوونە ژوورەوە، ئەو چوونە ژوورەوەیە سەرەتایەک بوو بۆ زیادبوونی کۆمەڵێک کێشەی گەورەتر، بە تایبەتی سەرقاڵبوونی (سیسیلیا) بە کۆمەڵێک مێینەی تری نزیک لە هاوسەرەکەی و سۆزی بەردەوامیی بۆ خۆشەویستە دێرینەکەی، لەگەڵ تێکەڵبوونی بە دۆخێکی پڕ لە دوودڵی و نیگەرانی، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو ڕێکار و مامەڵە پرۆتۆکۆلە سەرۆکایەتییانەی (سیسیلیا) پێی ڕانەدەهات، تەنانەت لەو ماوە کورتەشدا کە لە کۆشکی ئەلیزێ وەک خانمی یەکەم مایەوە، کۆمەڵێک دەردەسەری و ئیحراجی زۆری بۆ (نیکۆلا سارکۆزی) هاوسەری و سەرۆکی فەرەنسا دروست کرد، لەوانەش جارێک ڕەتی کردەوە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ئامادەی ئەو ئێوارە خوانەبێت کە (جۆرج بۆش) سەرۆکی پێشووتری (USA) لە کۆشکی سپی بۆی ڕێکخستبوون، بۆیە (نیکۆلا سارکۆزی) ناچاربوو بە تەنها بچێت بۆ ئەو بانگهێشتە و داوای لێبووردنی کرد، کە بە هۆی کێشەی تەندروستییەوە هاوسەرەکەی نەیتوانیوە ئامادە بێت، بەڵام میدیاکانی ئەمریکا، ڕۆژی دواتر چەند وێنەیەکی هاوسەرەکەی (سارکۆزی)یان گرت و بڵاویان کردەوە، کاتێک بەوپەڕی لەشساغی و باشی تەندروستییەوە لە بازاڕ و مارکێتەکان دا دەگەڕا.

بەڵام ئایا، سیسیلیا کێیە و چ چیرۆکێکی لەگەڵ سارکۆزیدا هەیە؟ سیسیلیا کە تەمەنی (52) ساڵ بوو، شانازی بەوەوەدەکرد کە دڵۆپێک خوێنی فەرەنسی لە دەمار و ڕەگەزەکەیدا نییە، ئەو لە (13ی نۆڤەمبەری ساڵی 1957) دا لە دایک بوە، (ئەندرییە) ی باوکی، لە پاریس کاری بازرگانی خووری کردوە، بەشێکە لە خانەوادەیەکی موڵکداری ڕووسیا کە بە ڕووسییە سپییەکان

ناسراون و دژی کۆمۆنیستەکان جەنگاون، لە (12) ساڵییەوە، باوکی چەندین وڵاتی کردوە و کاری کردوە، دوا جار لە پاریس گیرساوەتەوە و لەوێ نیشتەجێ بوە.

دایکی سیسیلیا ناوی (دیانا)یە و جوولەکەیە و لە باوکێکی بەلجیکییە، کە لە بواری دیبلۆماسیدا کاری دەکرد، داپیرەشی ئیسپانییە و کچی موزیکسیانی نـاوداری ئیسپانی (ئیسحاق ئەلبینیز)ە، لە تەمەنی (18) ساڵیدا، چاوی بە (ئەندریە)ی بە ڕەگەز ڕووسیی کەوتوە و کەوتوونەتە داوی خۆشەویستی یەکەوە و ڕوویانکردۆتە پاریسی پایتەختی فەرەنسا بۆ ئەوەی پێکەوە بژین.

(سیسیلیا) پێوەندییەکی خۆشەویستی لەگەڵ (جاک مارتن) دا هەبوو کە یەکێک بوو لە ئەستێرە دیارەکانی تەلەڤزیۆنی فەرەنسا، (سیسیلیا) و (مارتن) لە سەرەتاکانی ساڵی (1984) دا یەکییان بینی و پێوەندییان دروست کرد و منداڵێکیان بوو پاشان هاوسەرگیرییان کرد، ڕێوڕەسمی هاوسەرگیرییەکە لە بینای شارەوانی (نویی سیر سین) لە نزیک پاریس ڕێکخرابوو، کە ناوچەیەکی زۆر شاهانە بوو، ئەو کاتەش (نیکۆلا سارکۆزی) عومدەی ئەو ناوچەیە بوو.

سەرەڕای هاوسەرگیرییەکەی (سیسیلیا) لە (مارتن) و بوونی دوو کچ، هەروەها هاوسەرگیری (سارکۆزی) لەگەڵ (کاترینا نای) و بوونی دوو کوڕ، بەڵام (سیسلیا و سارکۆزی) پێوەندییەکی زۆر پتەویان هەبوو، بە جۆرێک زۆرترین کاتەکان ئەو دوو کەسە پێکەوەبوون و یەکترییان خۆش دەویست، پێوەندییەکانی نێوان (سارکۆزی) و (سیسیلیا) بە جۆرێک گەرموگوڕ و بەردەوام و بەرچاو بوو، دانیشتوانی ئەو ناوچە پارێزگار و بۆرژوازییە بە

(سیسیلیا)یان دەگوت (هاوڕێ کچەکەی عومدە)، ئەم پێوەندییە گەرموگوڕە بەردەوام بوو، تا ئەو کاتەی (کاترین نای) هاوسەری پێشووتری (نیکۆلا سارکۆزی) پێی دەزانێت و ئاشکرای دەکات، بەپێی ئەوەی نووسەری کتێبی (بیرەوەرییەکانی سارکۆزی) باسی دەکات، (کاترین نای) لە میانەی پشوویەکی خلیسکێنەی سەر بەفر دا کە لەگەڵ خانەوادەی (جاک مارتان) ئەنجامیان دابوو، توانی بە شوێنپێی هاوسەرەکەیدا لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەی (سیسیلیا) پێوەندییەکەیان ئاشکرا بکات.

ئەو پێوەندییە گەرموگوڕ و پتەوەی لە نێوانیاندابوو، هەردووکیانی ناچار کرد کە لە هاوسەرەکانیان جیا ببنەوە و بە شێوەیەکی ئاشکرا و لە بەرچاوی هەمواندا پێکەوە بژین، (سیسیلیا)، (مارتن)ی بە جێ هێشت و لەگەڵ کچە بچووکەکەیدا چوو لەگەڵ (نیکۆلا سارکۆزی) بژی، کە ئەویش لای خۆیەوە مامەڵەی جیا بوونەوەی لەگەڵ (کاترین)ی هاوسەری و دایکی دوو کوڕەکەی دەست پێ کرد بوو.

(سیسیلیا) جارێکی تر، ئەو پیاوەی بە جێ هێشت کە نزیکەی (20) ساڵ پێکەوە بوون و لە لێدوانێکیشیدا بۆ ڕۆژنامەنووسان گوتبووی بێزار بوو لەوەی بەرگەی قوربانی دان بگرێت.

(سارکۆزی) دوای جیا بوونەوەی لە (سیسیلیا) زۆری پێ نەچوو کە پێوەندی لەگەڵ (کارلا)ی نمایشکاری جلوبەرگ و جوانکاریی بەست و دواتریش هاوسەرگیرییان کرد، بەمەش زیاتر بوونە مایەی قسە و باس و تانە و تەشەر و بابەتی میدیایی.

بەڵام ئایا ئەو (کارلا برۆنی)ییەی هاوڕێی (نیکۆلا سارکۆزی) کێیە، کە بە هۆی پتەوی پێوەندییەکەیانەوە بوە سەیرترین خانمی یەکەم لە مێژووی فەڕەنسییەکاندا، کە بە کەرەستەیەکی

(چەوریی) ناسرابوو، لە لایەن زۆرینەی دامەزراوە میدیاییەکانەوە بە تایبەت ڕۆژنامەیەکی زەردی وەک ڕۆژنامەی (تابلۆیدز)، دەگەڕا بە شوێن وەڵامی ئەو پرسیارەی ئەو نمایشکارە ئیتالییە، چۆن توانی ناوی (نیکۆلا سارکۆزی) سەرۆکی فەرەنساش بخاتە لیستی ناوی ئەو پیاوانەی پێوەندی خۆشەویستی و ڕۆمانسی لەگەڵیاندا هەبوە؟(کارلا برۆنی) لە (23ی دیسەمبەری ساڵی 1967) لە تۆرین لە دایک بوە، لە تەمەنی (19) ساڵیدا ڕوویکردۆتە کاری نمایشکاری جلوبەرگ لە لایەن ئاژانسی سیتی مۆدێلزەوە لە پاریس.

(کارلا برۆنی) توانی ناوبانگ و توانایەکی باش بە دەست بهێنێت و ببێتە (سۆپەر مۆدێل) و گۆرانیبێژ و ئاوازدانەر و نووسەری تێکستی چەند گۆرانییەکی بە ناوبانگ، بە تایبەتی کە ناوی لەگەڵ ژمارەیەک پیاوی بە ناوبانگ و گۆرانیبێژدا دەهات و پێوەندییە ڕۆمانسییەکانی لەگەڵ (ئاریک کلابتۆن)ی گیتارژەن و گۆرانی بێژی ناودار، (میک جاجەر)ی ئەندامی گرووپی ڕۆلینگ ستۆنز، (دۆناڵد ترەمپ)ی ملیاردێر و سەرۆکی ئێستای (USA)، جگە لە هونەرمەندانی وەک (کیڤن کۆستنەر، فینسینت پیریز)، بێ گومان ئەم پێوەندییانە پێش ناسینی (سارکۆزی) و دەرکەوتنی ئاشکرایان بوە لە (یۆرۆ دیزنی – دیزنی لاندی ئەورووپا).

(ئەلبێرتۆ برۆنی تیدیسکی)ی باوکی (کارلا)، خاوەنکارێکی پیشەسازی دەوڵەمەندبوو، کارگەیەکی گەورەی دروستکردنی تایەی ئۆتۆمبێلی هەبوو لە تۆرین، لە هەمانکاتدا توانایەکی باشی هەبوو لە ئامادەکردنی موزیکی کلاسیکیدا، (ماریسا بۆرینی) دایکیشی، ژەنیارێکی باشی پیانۆی ئیتاڵی بوو، خوشکێکیشی هەبوو بە ناوی (ڤالێریا).

(کارلا) لە فەرەنسا پێگەیشت، لە تەمەنی (15) ساڵیدا نێردرا بۆ ئەوەی لە خوێندنگەیەکی ناوخۆیی فەرەنسا بخوێنێت، بەڵام گەڕایەوە بۆ پاریس و لە (تەلارسازی و هونەر)دا دەستیکرد بە خوێندن، لە تەمەنی (19) ساڵیدا بڕیاریدا واز لە خوێندن بهێنێت و ببێتە نمایشکارێکی شارەزا و بە ناوبانگی جلوبەرگ لە پاریس، لەو چوارچێوەیەشدا یەکەم دەرفەتی کارکردنی دەستکەوت، دوای ئەوەی (پۆل مارسیانۆ)ی سەرۆکی دامەزراوەی (ت جۆس) بۆ بۆن و پۆشاک، وێنەیەکی (کارلا)ی هەڵبژارد و بڕیاریدا ببێتە ڕوخسار و وێنەی نمایشە ڕیکلامییەکانی، لە هەڵمەتێکی فراوانی ڕیکلام و مارکیتینکدا، بە هاوبەشی لەگەڵ (ئیستیل هالیدای) نمایشکاری ناوداری پۆشاک.

دواتریش چەند دەرفەتێکی زۆرباشی بۆ ڕەخسا، بۆ کارکرن و نمایشکردنی پۆشاک و بۆنە براند و بە ناوبانگەکانی تری وەک (کریستیان دیۆر، باکۆرابان، کریستیان لاکروا، کارل لاگرفێڵد، جۆن گالیانۆ، ئیف سان لۆران، شانێل، فریستاتشی، هتد).

یەکێک لەو ئابڕووچوونانەشی توشی (سارکۆزی و کارلا)ی بوو، بڵاو کردنەوەی وێنەیەکی ڕوتی (کارلا) بوو، لە سەر بەرگی گۆڤارێکی پۆڕن و بڵاو کردنەوەی لیستی ناوی هاوڕێ کوڕ و پێوەندییە ڕۆمانسییەکانی.

(کارلا) بەرگرییەکی زۆری لەو وێنە ڕووتەی کردو گوتی (بوونی پێوەندی لەگەڵ سی کەسدا، هیچ نییە جگە لە خەیاڵێکی شاعیرانە، ڕاستییەکەی ئەوەیە من تەنها 15 خۆشەویست و پێوەندی ڕۆمانسیم هەبوە)، لە وەڵامی پرسیارێکی گۆڤاری (ماری باتش)دا لە بارەی (30 خۆشەویستەکەوە)، (کارلا) گوتی «ئەو وشەیە وەک زەنگی موزیک وایە، 30 باشترە لە 25»،

هەروەها گوتیشی «کاتێک گۆرانییەک دەنووسمەوە، من بە وردی سەیری ژیانی خۆم ناکەم، یاخود سەیری ئەو ڕێگەیە ناکەم کە ژیانی خۆمی پێ دەبینم». بەرگرییەکی زۆریشی لە وێنە ڕووتەکەی سەر گۆڤاری پۆرنەکە کردوو گوتی «کارەکە وەک ئێستا مەترسیدار نەبوو، بە تایبەتی بۆ ئەستێرەیەکی پۆپی وەک مادۆنا، من کارەکەم تەنها پۆشینی ئەو پۆشاکانەبوو، ناشمەوێت بچمە وردەکاری چۆنییەتی پۆشینی جلوبەرگەکانمەوە».

لە کاتی سەردانەکەی (نیکۆلا سارکۆزی ) سەرۆکی فەرەنسا بۆ لەندەن لە (26ی ئازاری ساڵی 2008)دا، لە لایەن گۆڤاری (جینتیلمانز کواتیرلی) بەریتانییەوە، پێشوازییەکی خراپ و نەشیاوی لێکرا، ئەویش بە بڵاو کردنەوەی سێ وێنەی نەشیاوی (کارلا سارکۆزی)، لە میانەی کارکردنیدا وەک گۆرانیبێژ و نمایشکاری جلوبەرگ.

ئەوەی جێی باسە، گۆڤارەکە بڕیاریدا ژمارەی مانگی ئەپریل کە وێنەکانی (کارلا)ی تێدابوو، لە لە (25)ی مارس دا و پێش چەند ڕۆژێک لە سەردانەکەی (سارکۆزی) بۆ لەندەن و کۆبوونەوەی لەگەڵ (شاژنە ئەلیزابێس) و سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیدا بڵاو بکاتەوە.

گۆڤارە گەورە و کاریگەرەکانی فەرەنسا، بە سوودمەنترین گروپ دادەنرێن لەوەی (نیکۆلا سارکۆزی) سەرۆکی فەرەنسا، گۆڕەپانی سیاسی وڵاتەکەی داگیر کردوە، بە تایبەتی لە بە دواداچوون و ڕوومالی هەواڵەکانی هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردن و ئەو دۆخەی بە هۆی جیا بوونەوەی لە (سیسیلیا) توشی بوو، هەروەها ماوەی هاوڕێیەتی و پێوەندی ڕۆمانسی و نهێنی نێوان (سارکۆزی و کارلا)ی هاوسەری ئێستای، بەو

هۆیەوە ئەو گۆڤارانە توانییان ببنە براوەی خەلاتەکانی حەوت باشترین گۆڤارەکانی فەرەنسا.

لەو چوارچێوەیەشدا گۆڤاری (لۆنۆڤاڵ ئۆبزەر ڤاتور)، توانی پارێزگاری لە پێگەکەی خۆی بکات، وەک پڕفرۆشترین گۆڤارەکانی فەرەنسا، ئەو گۆڤارە لە ساڵی (2007)دا تیراژەکەی بە ڕێژەی (8.1%) زیادی کرد و دابەشکردنەکەی گەیشتە (87) هەزار (788) دانە، بەلام دواتر و لە مانگەکانی سەرەتای ساڵی (2008)دا، خواست و فرۆشی گۆڤارەکە بە ڕێژەی (91%) زیادی کرد و تیراژەکەی گەیشتە زیاتر لە (92) هەزار دانە.

هەروەها گۆڤاری (ماریان)یش، کە هەر لە سەرەتاوە ناکۆک و دژ بوو لەگەڵ (نیکۆلا سارکۆزی) سەرۆککۆماری فەرەنسادا، یەکێک بوو لە گەورەترین ئەو گۆڤارانەی سوودێکی زۆری بینی لە ڕووماڵکردن و بە دواداچوونی هەواڵەکانی سەرۆککۆماری فەرەنسادا، ئەوەش بە زیادبوونی فرۆشی گۆڤارەکە بە ڕێژەی (34.9%)، هەروەها بە هۆی ئەو بابەت و ڕاپۆرت و هەواڵانەی لە ژمارەی ڕۆژی (14ی ئەپریلی ساڵی 2007) دا، بڵاو کرانەوە، (500) هەزاردانە لە گۆڤارەکە فرۆشرا، ئەوەش تۆمارکردنی ژمارەیەکی پێوانەیی بوو لە فرۆشتنی گۆڤارێکدا، بە هۆی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەوانییەوە بە ناونیشانی (سارکۆزی ڕاستەقینە، کە میدیاکان بوێریی ئاشکراکرنیان نەبوە).

هەروەها (پاتریک بارتیمۆن) بەڕێوەبەری دەستەی دابەشکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی فەرەنسا ڕایگەیاندوە، کە هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی فەرەنسا، کە لە کۆتایی ساڵی (2006)دا دەستی پێ کرد و لە ناوەڕاستی ساڵی (2007)دا گەیشتە ترۆپک و ململانێی توندی نێوان (نیکۆلا

سارکۆزی) و (سیجۆلین ڕوایاڵ)ی ڕکابەرە سۆسیالیستەکەی، ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە کردنەوەی دەرگایەکی گەورە بە ڕووی خوێنەراندا بۆ چاودێریکردنی گۆڕانکارییەکانی هەڵبژاردنەکە و ئەو زانیارییە کەسییانەی لە سەر کاندیدەکان بڵاو دەکرانەوە، ئەمە جگە لەو ڕکابەری و ململانێ توندەشی کە لە نێوان خودی دامەزراوە میدیاییەکاندا هەبوو.

لە لێدوانێکیشیدا بۆ ڕۆژنامەی (لۆفیگارۆ)ی فەرەنسی، (پاتریک بارتیمۆن) بەڕێوەبەری دەستەی دابەشکردنی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی فەرەنسا ڕایگەیاندوە بایەخدانی زۆری ڕای گشتی فەرەنسا، بە هەڵمەتی بانگەشەی هەڵبژاردنی (سارکۆزی) و جیا بوونەوەی لە (سیسیلیا) و سەرکێشییە ڕۆمانسییەکانی لەگەڵ (کارلا برۆنی) گۆرانیبێژ و نمایشکاری پێشووی جلوبەرگ، بە تایبەتی گەشتەکەیان پێکەوە بۆ هاوینەهەواری شەرەمشێخ لە میسر، ڕۆڵی گرینگییان هەبوو لە زیادبوونی ڕێژەی فرۆشی گۆڤارەکانی فەرەنسا بە نزیکەی (110) ملیۆن دانە.

هەر لەو ناوەدا گۆڤاری (لێکسپرێس)، بە بڵاو کردنەوەی لێدوان و گفتوگۆیەکی تایبەت لەگەڵ (کارلا برۆنی) لە (18ی فێبرایەری ساڵی 2008) و دوای هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ سارکۆزی، توانی ژمارەیەکی پێوانەیی تۆمار بکات، بە زیادکردنی فرۆشی گۆڤارەکە بۆ (600) هەزار دانە، ئەوەش بە زیادبوونی (200) هەزار دانە بۆ فرۆشی گۆڤارەکە.

سەرکەوتن و بردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی فەرەنسا لە مایۆی ساڵی (2007)دا لە لایەن (نیکۆلا سارکۆزی) یەوە، ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە زیادبوونی فرۆشی گۆڤاری (لۆبوان) بە ڕێژەی (60%)، لەو ژمارەیەی هەفتەیەک دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە چاپ و بڵاو کرایەوە.

هەروەها گۆڤاری (لۆنۆڤاڵ ئۆبزەر ڤاتۆر)، بە هۆی بڵاو کردنەوەی دیدارێکی تایبەتەوە لەگەڵ (سیسیلیا) لە بارەی ئاسایی بوونەوە و تێکچوونی زیاتری پێوەندییەکانی لەگەڵ سارکۆزی، توانی ڕێژەی فرۆشی ژمارەکانی هەر دوو مانگی (ئۆگەست و ئۆکتۆبەر)ی ساڵی (2007)، بە شێوەیەکی بەرچاو زیاد بکات.

لەو ماوەیەشدا (کارلا سارکۆزی) خانمی یەکەمی فەرەنسا، بەردەوام بوو لە گۆرانی گوتن، کەناڵەکانی میدیایی ئەو وڵاتەش، ئاشکرایان کرد (هاوسەرەکەی سارکۆزی)، ئامادەکاریی کردوە بۆ تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی ئەلبوومی سێیەمی گۆرانییەکانی.

کتێبێکی نوێی (جاک سیگالا) بە ناونیشانی (سیڤییەکی بێ مۆڵەت)، کە شارەزایەکی بە توانای بواری بانگەشەی فەرەنسی و هاوکات کەسێکی نزیکی سارکۆزی بوو، زانیاریی نوێی لە بارەی یەکەم دیداری نێوان (نیکۆلا سارکۆزی) و (کارلا برۆنی) نمایشکاری جلوبەرگ و گۆرانی بێژ ئاشکراکرد، کە لە نۆڤەمبەری ساڵی (2007)دا ئەنجام درابوو، (جاک سیگالا) لەو کتێبەدا ئەوەی درکاندوە (نیکۆلا سارکۆزی) بە هۆی جیا بوونەوەی لە (سیسیلیا) توشی خەمۆکی و دڵتەنگییەکی زۆر بوە، داوای لە هاوڕێیەکی کردوە کە ئاهەنگێکی بچووک بۆ ژمارەیەکی کەم لە هاوڕێکانی ڕێک بخات، بۆ ئەوەی پێکەوە کاتێکی خۆش و پڕ لە پێکەنین بە ڕێ بکەن و ئەویش لە دڵتەنگی و خەمۆکییەکەی دوور بکەوێتەوە، سارکۆزی (8) کەسی لەو بانگهێشتکراوانە دەناسی، لە ناویشیاندا وەزیری پێشووی ڕۆشنبیری فەرەنسا و ئەندازیاریی بە ناوبانگی بواری تەلارسازی، تا ئەو کاتە (سارکۆزی) (کارلا)ی نەدەناسی، بەڵام ڕێگرنەبوو لە بانگهێشتکردنەکەی و بە هاوڕێکەی گوت «حەزم لە یەکێک لە گۆرانییەکانێتی».

(جاک سیگالا) لە کتێبەکەیدا باسی لەوەشکردوە، لە کاتێکدا (کارلا) یەکێک بوو لەوانەی هەر لە سەرەتاوە ئامادەی ئاهەنگەبوو پێش ئەوەی سارکۆزی بگات، هەموو ئامادەبوانی ئاهەنگەکەش، هەستیان بەوەکرد هەر چەندە (سارکۆزی) دوایین کەس بوو کە چوە ئاهەنگ و ئێوارە خوانەکە، بەڵام پێوەندی و قسەکردنێکی گەرموگوڕ و بایەخدانێکی زۆر لە نێوان (سارکۆزی و کارلا)دا هەبوو.

نووسەری کتێبەکە دەشڵێت یەکەم جار (کارلا) هەوڵی داوە سەرنجی (سارکۆزی) بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، بەوەی کاتێک (سارکۆزی) بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ (وەزیری گواستنەوەی فەرەنسا)دا دەکرد، (کارلا) لێی چۆتە پێشەوە و پێی گوتوە ئایا ئەو پێوەندییە تەلەفۆنییە لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا بوو...؟ نووسەری کتێبەکە دەشڵێت پێوەندییەکانی نێوان (سارکۆزی و کارلا) زیادی کرد و تەنانەت لە سەر مێزی نانخواردنەکە، (سارکۆزی) ڕووی کورسییەکەی گۆڕی بە ئاراستەی (کارلا) دا، بە تایبەتی دوای ئەوەی بە پێکەنینەوە پێی گوت ئایا لە خانوە هاوینەییەکەیدا لە ناوچەی کاپ برگنسۆنی باشووری فەرەنسا، کە بەرانبەرماڵی باوکی بوە بە دزییەوە سەیری کردوە و چاودێری کردوە، (سارکۆزی)ش لە سەر هەمان شێوازی قسەکردن و بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە و پێی گوت دیارە جیام ناکەیتەوە لەگەڵ (شیراک)دا، هەر چەندە (کارلا) وەڵامەکەی باش دەزانی، بەڵام بە نەخێر وەڵامی دایەوە.

نووسەر، لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بەوەشکردوە دیداری ئەو دوو کەسە، زیاتر لە یارییەکی وروژاندنی یەکتر و ئاژاوەیەکی دۆستانە دەچوو، لە سەر مێزی ئێوارە خوانەکە، (سارکۆزی)

له (کارلا)ی پرسی، چۆن توانیوته بۆ ماوەی هەشت ساڵ لەگەڵ هاوڕێکەی پێشووی و گۆرانی بێژی پۆپ (مایک جاغەر)دا بمێنیتەوە، بەوەش هەموو ئامادەبوانی سەر ئەو مێزەی هێنایە پێکەنین.

وەک (جاک سیگالا)ی شاهیدحاڵ دەیگێڕێتەوە، نزیک بوونەوە و گەرم بوونی پێوەندییەکانی ئەو دوانە، لەگەڵ درەنگ بوونی شەودا، تا دەهات زیاتر و پتەوتر دەبوو، بە جۆرێک (سارکۆزی) بە گوێی (کارلا)دا چرپاندی وەک ئاڵنگارییەک دەتوانێت لە بەردەم ئامادەبواندا ماچی بکات؟ هەروەها (کارلا)ش داوای لە (سارکۆزی) کردوە ئایا دەتوانێت لە ئۆتۆمبیلەکەیدا هاوڕێیەتی بکات؟ چەند ساتێک دوای ڕۆیشتنەوەی، (کارلا) پێوەندی بەو هاوڕێیەیەوە کردوە کە بانگهێشتی کردوە بۆ ئاهەنگەکە و سەرسامی خۆی دەربڕیوە بە کەسایەتی (سەرۆک) و بە کەسێکی سەرنج ڕاکێش و باش وەسفیکردوە، هەروەها نیگەرانیشی دەربڕیوە لەوەی زۆر درەنگ ناسیوێتی و پێوەندییان دروست کردوە.

جێی باسە، (سارکۆزی و کارلا)، تەنها (7) مانگ لە دوای ئەو یەکتربینینەی یەکەم جاریان، هاوسەرگیرییان کرد.

نووسەری کتێبەکە، کە لە چەندین کەناڵ، بانگەشە و ڕیکلامی بۆ کتێبەکەی دەکرد، بەشێکی زۆری ئەو ڕەخنانەی قەبووڵ کرد، کە ئاڕاستەی کرابوون، هەندێک لە ڕەخنەگران پێیان وابوو ڕەزامەندی (نیکۆلا سارکۆزی) سەرۆکی فەرەنسا، بۆ بڵاو کردنەوەی ئەو زانیارییە تایبەتییانە، بۆ جوانکردن و ڕوونکردنەوەی وێنەی خۆی و هاوسەرەکەی بوو، کە توشی جۆرێک لە ناشرینی و بێزراوی بووبوو، چونکە وەک تێبینی دەکرا

دوای تێ پەڕبوونی ساڵێک لە هاوسەرگیری سەرۆکایەتی، چیتر خانمی یەکەمی فەرەنسا، نەبوە جێی باس و سەرنجی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن و ئەو مریشکە نەبوو کە لەجیاتی هێلکە زێڕ بکات.

وەک ئاشکرابوو میدیای نووسراوی فەرەنسا، بە هۆی تەرخانکردنی چەند ژمارەیەکییان بە ژیان و کارەکانی (خانمی یەکەمی فەرەنسا و هاوسەری سەرۆک نیکۆلا سارکۆزی) توانییان ژمارەیەکی پێوانەیی لە فرۆشتنی ژمارەکانیاندا تۆماربکەن، بەجۆرێک گۆڤاری (لێکسپرێس) بە هۆی بڵاو کردنەوەی یەکەم لێدوانی خانمی یەکەمی کۆشکی ئەلیزێ لە ژمارەی مانگی فێبرایەری ساڵی (2007)دا توانی (600) هەزار دانە بفرۆشێت.

بەڵام بە تێ پەڕبوونی کات، بایەخدانی فەرەنسییەکان بە خانمی یەکەمی فەرەنسا تا دەهات کەمتر دەبۆوە، بۆ نموونە گۆڤاری (ماری باتش) لە مانگی دیسەمبەری ساڵی (2008)دا بەرگی گۆڤارەکەی تەرخان کرد بۆ ڕووماڵ کردنی چالاکییەکانی (نیکۆلا سارکۆزی) لە بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی ئایدز، چونکە (ڤێرچینیۆ)ی برای دوو ساڵ پێشتر بەو نەخۆشییە کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام ئەو ساڵە گۆڤارەکە کەمترین و خراپترین ڕێژەی فرۆشی هەبوو.

گۆڤاری (لۆبوان)یش دوەم قوربانی بایەخ دان بوو بە چالاکییەکانی خانمی یەکەمی فەرەنسا، ئەویش بە تەرخانکردنی بەرگی پێشەوەی گۆڤارەکە لە مانگی یەنایەری ساڵی (2009) بۆ (کارلا سارکۆزی) نمایشکاری پێشووی جلوبەرگ و هاوسەری ئێستای سەرۆکی فەرەنسا، ڕێژەی فرۆشی گۆڤارەکە بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دابەزینی تۆمار کرد.

به هەمان شێوە ئەو پرۆگرام و بەرنامە تەلەڤزیۆنانەشی تایبەتبوون بە میوانداریکردن و قسەکردن لە سەر (خانمی یەکەمی فەرەنسا) ڕێژەی بینەریان بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کرد، بەجۆرێک بەرنامەی (فیفمان دیمانش) کە لە لایەن پێشکەشکاری بە توانا و ناودار (میشال درۆکەر)ەوە پێشکەش دەکرا و لە مانگی سێپتەمبەردا میوانداریی (کارلا سارکۆزی) خانمی یەکەمی فەرەنسای کرد، ڕێژەی بینەرەکانی بۆ (3 ملیۆن بینەر) کەمی کرد، ئەمەش ڕێژەیەکی زۆر خراپ بوو بەراورد بەو پرۆگرامەی لە ساڵی (2007)دا بۆ (برنادیت شیراک) کراو نزیکەی (7 ملیۆن) بینەری هەبوو.

به هەمان شێوە کەناڵی شەشی فەرەنسا، نەیتوانی نزیکەی یەک ملیۆن بینەر مسۆگەر بکات بۆ ئەو پرۆگرامەی تەرخانی کردبوو بۆ خانمی یەکەمی فەرەنسا.

هەموو ئەمانە لە کاتێکدایە، (سیسیلیا)ی هاوسەری پێشووی (نیکۆلا سارکۆزی) کە تەنها چەند مانگێکی کەم لە کۆشکی ئەلیزێ مایەوە، توانی سەرنج و بایەخ دانی خوێنەرێکی زۆر بۆ خۆی دەستەبەربکات، کتێبێکی (ئانا بیتۆن)ی ڕۆژنامەنووس لە بارەی (سیسیلیا)وە سەرکەوتنێکی گەورەی تۆمارکرد و (163) هەزار دانەی لێ فرۆشرا، بەڵام لە بەرانبەردا کتێبی (مشوار العاتفی) کە تایبەت بوو بە (کارلا) تەنها (40) هەزار دانەی لێ فرۆشرا، هەروەها کتێبی دوەمیش لە سەر ژیانی (کارلا) بە ناونیشانی (خانمی دڵەکان) و لە لایەن دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی (لۆک بیر)ەوە چاپ و بڵاو کرایەوە، خراپترین ڕێژەی فرۆشی هەبوو بە وەی لە سەرانسەری فەرەنسادا تەنها (4) هەزار دانەی لێ فرۆشرا.

ڕێــژەی ئــەو فــەرەنسـاییانـەی لـە مانگەکانی ســەرەتـای هاوسەرگیرییەکەیدا و وەک جۆرێک لە حەزکردن بە زانینی وردەکاری ژیانیان، بایەخیان بە ژیان و هەواڵەکانی (کارلا برۆنی) خانمی یەکەمی فەرەنسا دەدا، هەر جارە و بە شێوەیەک و بە هۆکارێک، کەمتر دەبۆوە، شارازایانی ئەو بوارەش پێیان وایە بەشێکی هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیی ئاستی جەماوەری خانمی یەکەمی فەرەنسا، بە هۆی سروشتە دەستکرد و بێ تواناکەیەوە، کە هەمیشە بە بنەچە بۆرژوازییەکەیەوە دەنازا و ئەوەش ئاماژەبوو بۆ ئەوەی هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی ڕاستەقینە نین و دروست کراوون.

لە هەموو ئەمانە گرینگتر و کاریگەرتر کە فەرەنسییەکان پێیان وایە (کارلا) شایستەی ئەوە نییە خانمی یەکەمی فەرەنسا بێت، ئەو ڕابردوەی کە نمایشکارێکی ئیتاڵی بە ڕەگەز جوولەکە هەیەتی و خاوەنی چەندین پێوەندی ڕۆمانسی و خۆشەویستییە و لە بیرەوەری فەرەنسییەکانداچەسپیوە و کاڵ نابێتەوە، چونکە سەردەمانێکی زۆر ڕۆژنـامـەکـانـی فەرەنسا ســەرقـاڵ بـوون بە لێدوانەکانییەوە سەبارەت بە پێوەندییە خۆشەویستی و ڕۆمانسییە جۆراوجۆرەکانی و چیرۆکە ڕۆمانسییەکانی لەگەڵ کەسایەتییە ناسراوەکانی وەک (مایک جاگەر)ی گۆرانیبێژی پۆپ، (ئیریم کلابتۆن)ی گۆرانیبێژ، (دۆناڵد ترەمپ)ی ملیاردێر و سەرۆکی ئێستای (USA)، (لۆک فێری) وەزیـری پێشوو لە حکوومەتی فەڕەنسا، (ئارنۆ لکسفەرد)ی پارێزەری لاو... جگە لە چەندین کەسایەتی تر، وێنای کەسایەتی (کارلا) لای فەرەنسییەکان وێنایەکی پەسەند نییە وەک خانمە یەکەمەکانی تـری فـەرەنـسـا، کـە هەمیشە بـە داپـۆشـراوی و پـابـەنـدی و پەیوەستبوونی کۆمەڵایەتی ناسرابوون.

ئەم سەرۆکەی(USA)، هەمیشە لە کێشەدا بوە لەگەڵ دۆست و ناسیاو و هاوڕێکانی، ئەوەش بە هۆی گێچەڵە سێکسییەکانی بەرانبەر بە هاوسەرەکانیان، سەرەڕای ئەو هەموو ئابڕووچوونە سێکسییەی لە میدیاکاندا باسی لێوەکراوە و ئاشکرا کراوە، بەڵام تەنها ددانی نا بەو پێوەندییەی لەگەڵ هاوسەری (جۆن ۆوکەر)ی هاوڕێیدا هەیبوە.

هەر کاتێکیش بە هۆی هەڵس و کەوت مامەڵە نەشیاوەکانییەوە ڕەخنەی توندی لێ دەگیرا، هەمیشە بە قسە بە ناوباگەکەی وەڵامی دەدانەوە، کە دەیگوت «ئەمریکییەکیان خەسێندراو و نەزۆکێکییان دەوێت لە کۆشکی سپی»!!!

ئەو سەرۆکەش، سەرۆکی کۆچکردووی (USA) (تۆماس جیفرسۆن)ە، کە لە کاتی ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بۆوە، بە هۆی زۆری پێوەندییە ڕۆمانسی و سێکسییەکانی و بوونی چەند منداڵێکی ناشەرعی لە یەکێک لە کەنیزەکەکانی بە ناوی (سالی هیمنقەز)، وەک خۆی باسی کردوە، هەر لە منداڵییەوە پێوەندی لەگەڵ ئەو کچەدا هەبوە، یەکێک لە منداڵەکانیشی بە تەواوی شێوە و ڕوخساری خۆی تێدایە و ئەوەش لە لایەن میدیا و ڕۆژنامەکانی ئەمریکاوە بایەخێکی زۆری پێدرا، تەنانەت یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەمریکا، بە تەنزەوە ئەو کوڕەی بە (سەرۆک تۆم) ناودەبرد، کە ناوی (تۆم) بوو.

لە ساڵی (1988)دا، لە لایەن نەوەکانی (سالی هیمنقەز)وە داوایەک لە سەر (جیفرسۆن) تۆمارکرا، بۆ ئەوەی ددان بنێت بەوەی ئەو منداڵانە لە خوێنی ئەون و نەوەی ئەون، لەوچوارچێوەیەشدا پشکنینی دی ئێن ئەی بۆ (جیفرسۆن) کراو

لە ئەنجامیشدا دەرکەوت خوێنی (جیفرسۆن) و ئەو منداڵانە هاوتای یەکتربوون و گونجابوون و سەلمێندرا کە منداڵی ئەوون، بەڵام لە لایەن خانەوادەکەی (جیفرسۆن)ەوە ڕەتکرایەوە ئەو منداڵانە وەک نەوەی (جیفرسۆن) بناسێندرێن، تەنها ڕێگەی ئەوەیان پێدرا، جار جارە سەردانی یەکتر بکەن و یەکتر ببینن.

دوای ئەوەی (تۆماس جیفرسۆن) بە قەرزاری مرد، ژمارەیەک لە خەمڵێنەران ئامادەی دانیشتنێکی تایبەت بوون بە دەستنیشانکردن و دیاریکردنی ئەوەی لە پاش خۆی بە جێی هێشتوە، بەڵام بەپێی تۆماری خەمڵاندنەکە (سالی هیمنقز، دایکە ئەمریکییەکە، تەمەن 52 ساڵ، تەنها 50 دۆلاری بەرکەوت)، بەڵام (سالی هیمنقز) ئەو بڕە میراتییەی ڕەت کردەوە و ڕەخنەی زۆری لێ گرت و بەراوردی کرد بە (جۆرج واشنتۆن) کە لە دوای مردنی و لە وەسیەتنامەکەیدا کۆیلەکەی ئازاد کردبوو، بەڵام (جیفرسۆن) ئەوەشی لەگەڵ (سالی)دا نەکرد کە بۆ زیاتر لە (40) ساڵ پێوەندییان پێکەوە هەبوو.

لە یەکێک لە دەستەواژە بە ناوبانگەکانیشیدا دەڵێت «دەبێت داری ئازادیی بە بەردەوامیی بە خوێن ئاو بدرێت، بۆ ئەوەی ڕەگەکانی هەمیشە پتەو و گەشاوەبێت»، کاتێکیش ئەو کەسە دەستگیرکرا کە بیناکەی ئۆکلاهۆمای تەقاندەوە، لە سەر کراسەکەی ئەو دەستەواژەیەی (جیفرسۆن) نووسرابوو.

(تۆماس جیفرسۆن)، سێیەم سەرۆککۆماری (USA) بوو، یەکێکیش بوو لە باوکە دامەزرێنەرە سەرەتاییەکانی (USA)، هەر وەک یەکێکیشە لەو کەسانەی دەستووری ئەمریکایان داڕشتۆتەوە و (باوکی شەرعی زۆرینەی دەستووری وڵاتانی جیهان)ە، لە داڕشتنەوەی دەستووریشدا کەوتۆتە ژێر کاریگەری

پرەنسیپەکانی شۆڕشی فەڕەنسا سەبارەت بە دادپەروەریی و یەکسانی نێوان مرۆڤەکان، چونکە لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسادا، (تۆماس جیفرسۆن) باڵیۆزی (USA) بوو لە فەڕەنسا.

سەبارەت بەچیرۆکی ئەو فیلمەش کە (تۆماس جیفرسۆن) پێوەندییەکی نهێنی بە (لوسی) خزمەتکارە قەشەنگە بە ڕەگەز ئەفریقییەکەیەوە هەبوو، لێرەولەوێ باس لە چۆنییەتی دەستپێکی ئەو چیرۆکە دەکرێت کە چۆن توانی ببێتە سەرەکیترین ئافرەت لە ژیانیدا و (چوار کچ و کوڕ)ی لێ بوە، پێکیشەوە چیرۆکێکی خۆشەویستی و ڕۆمانسی نایابییان هەبوو، بە جۆرێک (جیفرسۆن) لە پێناویدا دەستبەرداری ئەو خۆشەویستە ئینگلیزە ئەرستۆکراتییەش بوو، کە لە فەرەنسا یەکییان ناسیبوو، کاتێکیش بوو بە سەرۆکی (USA) وەک دۆستی خۆی پارێزگاریی لێ کرد و دوای مردنیشی لە وەسیەتنامەیەکدا ئازادیی تەواوەتی بە خۆی و منداڵەکانی بەخشیبوو.

(فلوسی) خۆشەویستە پێسترەشەکەی (جیفرسۆن)، لە باوکەوە خوشکی هاوسەرە پێست سپییەکەی بوو، دایکی (لوسی) کۆیلەی باوکی هاوسەری یەکەمی (جیفرسۆن) بوو، چەند منداڵێکیشی لێی هەبوو، کە وەک دیاری بەخشینی بە کچە پێست سپییەکەی کاتێک هاوسەرگیری لەگەڵ (جیفرسۆن) کرد، کاتێکیش هاوسەرەکەی (جیفرسۆن) کۆچی دوایی کرد، چەند کۆیلەیەکی لێ بەجێما، یەکێکییان (لوسی) بوو کە (لە باوکەوە خوشک بوون).

(تۆماس جیفرسۆن) لە ساڵی (1743) لە ویلایەتی ڤێرجینیا لە دایک بوە، لە ساڵی (1826) دا و لە تەمەنی (83) ساڵیدا کۆچی

دوایی کردوه، باوکی یەکێک بوە لە جووتیار و خاوەن زەوییە دەوڵەمەندەکان، بەڵام لە ساڵی (1757) لە تەمەنێکی کەمدا کۆچی دوایی کردوە، و ئەو کاتە (جیفرسۆن) تەنها (14) ساڵ بوە.

(تۆماس جیفرسۆن) لە خوێندندا کەسێکی سەرکەوتوو بوو، کاریگەری گەورەی لە سەر زۆرینەی هاوپۆلەکانی دروست کرد بوو، بە ئاسانی توانی بگاتە زانکۆ و یاسا بخوێنێت، ساڵی (1767) و لە تەمەنی (24) ساڵیدا بوە پارێزەر، هەر لە سەرەتاوە توانا و لێهاتوویی و سەرکەوتنەکانی دەرکەوتبوون و خەسڵەت و تایبەمەندییەکانی سەرکردە و سەرکردایەتی کردنیشی تێدابوو.

دواتر تێکەڵاوی کاری سیاسەت بوو، ساڵی (1769) لە سەر ئاستی ناوچەکەی خۆی، بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەران، بە هۆی توانا و شارەزایی و لێهاتووییەکەیەوە، هەر زوو زۆرینەی پلەکانی لێپرسراوێتی بڕی و بە ماوەیەکی کەم بوە یەکێک لە سەرکردە دیارەکانی ئۆپۆزسیۆن.

لەو سەردەمەدا هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژنێکی دەوڵەمەنددا کرد، کە هاوکار و پشتیوانێکی باش بوو بۆی تا بتوانێت بە سەرکەوتوویی لە سەر هەنگاوەکانی خۆی و گەیشتن بە ئامانجەکانی بەردەوام بێت و ببێتە یەکێک لە دامەزرێنەرانی گەلی ئەمریکا، لەگەڵ (جۆرج واشنتۆن) و (بنیامین فرانکلین) و چەند کەسێکی تردا.

ڕۆڵێکی گرینگی هەبوو لە بزووتنەوەی خەبات و تێکۆشان لە دژی داگیرکاری بەریتانیا، چونکە ئاشکرایە لەو سەردەمەدا ئەمریکا یەکێک بوو لە وڵاتە داگیرکراو و کۆلۆنیالەکانی ئینگلیز.

(تۆماس جیفرسۆن) دەقێکی یاسایی ئامادەکرد و بڵاوی کردەوە بە ناونیشانی (ئاماژەیەکی کورت بە مافەکانی

ئەمریکای بەریتانی) و تێیدا داوای سەربەخۆیی کردبوو، بەڵام داواکارییەکی پێشوەختەبوو، ئاشکراشە ئەو دەقە وەک پێشەکی ئامادەکارییەک بوو بۆ ڕا گەیاندنی سەربەخۆیی، (جیفرۆسن) وەک نووسەرێکی سیاسی شارەزا جۆرێک لە گریمانەی ئەو دۆخەی کردبوو.

تۆماس جیفرسۆن، ساڵی (1775) لە سەر بازنەی ویلایەتی ڤێرجینیا بە ئەندامی ئەنجوومەنی پیران هەڵبژێررا، دواتر ڕاسپێردرا و تەکلیفکرا بە نووسینی ڕا گەیەندراوە بە ناوبانگەکە بۆ سەربەخۆیی (USA)، ئەو ڕاگەیەندراوە وەک دەقێکی پیرۆز و هاوشێوەی دەستووری ئەمریکا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت».
بێ گومان ئەگەر باکگراوند و ڕۆشنبیرییە سیاسی و یاسایی و فەلسەفییە فراوانەکەی نەبوایە، هەرگیز نەیدەتوانی دەقێکی یاسایی گرینگ و مێژوویی لەو جۆرە بنووسێت.

لە ساڵانی دواتریشدا، ئەو سیاسییە لاوە دەرکەوتوەی ناو دونیای سیاسەت، لە هەوڵەکانی بەردەوام بوو بۆ ئەنجام دانی چاکسازیی ئایینی ڕادیکاڵی لە ویلایەتی ڤێرجینیادا.

هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی لانی کەم سیستمی دەرەبەگایەتی هەڵبوەشێنێتەوە، بانگەشە و پشتیوانییەکی زۆری لە سیاسەتی چاکسازیی ئایینی دەکرد و داوای ئازادیی هۆشیاری و ویژدانی بۆ بیروباوەڕەکان دەکرد و دەیگوت، ئازادیی ئایینی، یەکێکە لە دەستکەوتە گەورەکانی سەردەمی هاوچەرخ و عەقڵی ڕۆشنگەریی، دەیویست ئەمریکا بکاتە وڵاتێکی جیاواز و دوور لە دەمارگیری و ناکۆکی و ڕقی ئایینی، هاوکات داواشی کرد پشتیوانییە ڕەسمییە داراییەکانی حکوومەت بۆ کڵێسا هەڵبوەشێتەوە، ئەوەش پێشەکییەک بوو بۆ جیا کردنەوەی کڵێسا لە دەوڵەت.

بەڵام نەیتوانی بە شێوەیەکی خێرا و لە ماوەیەکی کەمدا ئەو چاکسازییانە ئەنجام بدات، بەڵکوو پێویستی بەوەبوو چەندان ساڵ، خەبات و تێکۆشانی لە پێناودا بکرێت، تا چینی ئەرستۆکراتی ویلایەتی ڤێرجینیا بهێنرێتە سەر ئەو باوەڕەی پشتیوانی لەو داوا و خواستە شۆڕشگێڕییە بکەن و وەک شتێکی پیرۆز و بەهادار مامەڵەی لەگەڵ بکەن.

ئەمەش کێشەی هەمیشەیی کەسانی پێشەنگ و مەزنەکانە، بەوەی زۆرینەی کات بیرکردنەوە و هەڵوێست و پێشنیارەکانیان پێش سەردەمی خۆیان دەکەوێت، بەڵام ئامادەکارییەکە بۆ ڕێگەی داهاتوو.

لە ڕاستیدا، (تۆماس جیفرسۆن) ڕۆڵ و بەشدارییەکی زۆری هەبوو لە بڵاوکردنەوەی بیری نوێ لە (USA)، ئەو بیروباوەڕانەش، جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ بیروباوەڕەکانی ئینگلتەرای موحافیزکار ئەگەر نەڵێین دواکەوتوو، زۆریش کاریگەربوو بە شۆڕشی فەرەنسا، پرەنسیپ و درووشمە بە ناوبانگەکانی (ئازادیی، یەکسانی، برایەتی)، لەبەر ئەمەش بە توندی دژایەتی سیستمی کۆیلەیەتی و ڕەگەزپەرستی دەکرد و داوای ڕاگرتنی بازرگانیکردنی بە پێست ڕەش و ئەفریقییەکانەوە دەکرد و دەیگوت «ئەوەی عەیبەیە بۆ ئەمریکا، کە هاوشێوە هاوردەکردنی ئاژەڵ و شمەک و کەلوپەلی بازرگانی، مرۆڤی پێستڕەش و ئەفریقی هاوردە بکات»، ئیدانەی هەموو هەڵوێستێکی گوماناوی و نامرۆڤانەی لەو جۆرەشی دەکرد.

(تۆماس جیفرسۆن) بەم هەنگاو و بیرکردنەوانە سەلماندی، کە کوڕی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەرییە و پڕە لە فەلسەفەی ماف و شکۆمەندی مرۆڤ.

له نێوان ساڵانی(1779 بۆ 1781) حاکمی ویلایەتی ڤێرجینیا بوە، بەڵام شکستیهێنا لە بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی سوپای ئینگلیز، بەو هۆیەشەوە پۆستەکەی وەک حاکمی ویلایەتی ڤێرجینیا لە دەست داو گەڕایەوە بۆ سەر کارەکەی پێشووی وەک ئەندامی کۆنگرێسی ئەمریکا و بەشداربوو لە ئیمزاکردنی پەیماننامەی ئاشتی کۆتایی لەگەڵ ئینگلتەرادا.

هەروەها دەنگیشیدا بە پەسەندکردنی یاسایەکی گرینگ، بۆ هەڵوەشاندنەوەی مامەڵەکردن بە دراوی جونەیهی ئیستەرلینی و خستنەکاری دراوی ئەمریکی لە شوێنەکەی، دوای ئەوە حکوومەتی ئەمریکا (تۆماس جیفەرسۆن، جۆن ئادەمز، بنیامین فرانکلین)ی وەک نوێنەری ڕەسمی ڕەوانەی ئەورووپا کرد، بۆ دانوستان و ئیمزاکردنی پەیماننامەی بازرگانی لەگەڵ فەرەنسا و ئینگلتەرا، لە ساڵی (1785)دا، کۆنگرێسی ئەمریکا (جیفرسۆن) ی وەک باڵیۆزێکی باڵا لە پاریس دامەزراند، لەوێ چەند ساڵێکی خۆی تەمەنی بە ڕێ کرد، پێوەندی و هاوڕێیەتی زۆری لەگەڵ گەورە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری و سەرکردەکانی شۆڕشی فەرەنسا پەیداکرد، وەک (دالامبێر، کۆندۆرسیە، دۆستدت دی تراسی، هتد...).

ئەو مانەوەیەی لە پاریس، ئەزموونێکی گرینگ و دەوڵەمەندی ژیانی بوو، لە بوارەکانی فەلسەفە و سیاسەت و مرۆیی دا.

لە ساڵی (1789)دا، (تۆماس جیفرسۆن) گەڕایەوە بۆ (USA)، تا وەک وەزیری دەرەوە لە کابینەی حکوومەتەکەی (جۆرج واشنتۆن) دەستبەکاربێت، لەو کاتەشدا لەگەڵ (هاملتۆن) دا توشی ناکۆکی بوو، کە یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی (USA)، (هاملتۆن) یەکێک بوو لە لایەنگرانی فیدراڵییەتی مەرکەزی،

بەڵام (جیفرسۆن) پشتیوان و لایەنگری سیستمی حکوومەتی لامەرکەزی بوو، کە دەسەڵاتی زیاتری دەبەخشییە ویلایەتە جیاوازەکان، بەپێی پێوەری واشنتۆنی پایتەخت.

ئیتر لەو کاتەوە ناکۆییەکی گەورە و بەردەوام لە نێوان (جیفرسۆن و هاملتۆن)دا دروستبوو، بیریشمان نەچێت (هاملتۆن) لایەنگریی لە سیستمی ئینگلیزی پاشایەتی موحافزکار دەکرد، لە کاتێکدا (جیفرسۆن) لایەنگری سیستمی کۆماری پێشکەوتوو بوو لە سەر ڕێبازیی فەرەنسی.

ئاشکراشبوو لەو کاتەدا ئەمریکا دەوڵەتێکی بچوکی گەشەکردوو بوو، ئینگلتەرا و فەرەنساش، دوو دەوڵەتی بەهێزی گەورەبوون لە سەرجەم ئاست و بوارەکاندا.

(USA) لەو سەردەمەدا دەیویست لە زۆرینەی بوار و کایەکاندا، لاسایی فەرەنسا و ئینگلتەرا بکاتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە هێزو توانایەکی نوێ، وەک دەگوترێت دواکەوتوەکان هەمیشە تەقلیدی پێشکەوتوەکان دەکەنەوە، بەڵام دوا جار ئەمریکا توانی بە سەر ئینگلتەرای دایکدا سەربکەوێت و پێش بکەوێت، بەو جۆرەی لە ئێستادا گەورەترین و بەهێزترین دەوڵەتی دونیایە لە زۆرینەی بوار و کایەکاندا.

بە هۆی توانا و شارەزایی و ئەزموونەکەیەوە (تۆماس جیفرسۆن) بوە سەرکردەی پارتی کۆماری و ڕکابەری سەرەکی پارتی دیموکراتەکان بوو، لەو کاتەدا، ئەمریکا لە سەردەمی دیموکراتەکاندا دەیویست بە هەموو شێوەیەک پێوەندییەکانی لەگەڵ فەرەنسادا بپچڕێنێت، بەڵام (جیفرسۆن) هەوڵی زۆریدا بۆ ئەوەی ئەو پلانە سەرنەگرێت، ئەمەش بەڵگەیەکی جدی و زیندوە بۆ بوونی ململانێیەکی گەورە لە ئیدارەی ئەمریکادا لە دوای بە دەستهێنانی سەربەخۆیی.

له ساڵی (1801) دا تۆماس جیفرسۆن، بە سەرۆکی (USA) هەڵبژێردرا، کارەکانی سەرۆکایەتی بە شێوەیەکی سادە و ئاسان و دوور لە ڕێورەسمی ڕەسمی و گرانبەها بەڕێوەدەبرد، ئەمەش هۆکاربوو بۆ ئەوەی ئاستی جەماوەریی ڕوو لە هەڵکشان بکات، کاتێک بوو بە سەرۆک، هیچ یەکێک لە کارمەندانی کۆشکی سپی نەگۆڕی کە پێش هاتنی ئەو لە کاردابوون، لە ساڵی (1805) یشدا، جارێکی تر و بۆ خوولی دوەم (جیفرسۆن) بە سەرۆکی (USA) هەڵبژێررایەوە، بە هەموو پێوەرێک دەیتوانی بۆ خولی سێیەمی سەرۆکایەتی خۆی هەڵبژێرێت و سەرکەوتن بە دەست بهێنێتەوە، بەلاّم ئەو بیرۆکەیەی ڕەت کردەوە و گەڕایەوە بۆ ناوچەی سەرەکی و ڕەسەنی خۆی بۆ ئەوەی ڕۆژەکانی داهاتووی تەمەنی لەوێ بە ڕێ بکات، کە زۆرینەی کاتەکانی تەرخانکردبوو بۆ خوێندنەوە و نووسین.

له ڕاستیدا (تۆماس جیفرسۆن) کەسێکی لۆژیکی تەواو بوو، ئینکاری لە هەندێک بیروباوەڕی سەرەکی مەسیحی دەکرد، لەوانەش بیروباوەڕی (بالوهیە)ی مەسیح، بەوەش لە لایەن ئوسوڵییەکان و پارێزگاران و توندڕەوان و تەقلیدییە مەسیحییەکانەوە بە بێ دیین (کافر) درایە قەڵەم.

لە سەر دراوی جۆری (20 دۆلاری) وێنەی (ئەلێکساندەر هاملتۆن) دەبینی، کە یەکێکە لە باوک و دامەزێنەرانی ئەمریکا، ئابڕووچوونە سێکسییەکانی و لە دایک بوونە ناشەرعییەکەی و دەرئەنجامەکانی ئەو کردەوانەی، هۆکاری شکستهێنانی بوون لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکەی ئەمریکادا، بەلاّم یەکەم وەزیری دارایی ئەمریکاو دامەزرێنەری بانکی ئەمریکی بوو، ئێستاشی لەگەڵدابێت بانکەکانی ئەمریکا لە سەر ئەو سیستم و سیاسەتە داراییە کاردەکەن کە (هاملتۆن) لە کاتی خۆیدا دایڕشتبوون، یەکێکیشە لە نەیارانی دەستووری ئەمریکا و ماسۆنییە نوورانییە ڕەسەنەکان، بەلاّم کێشە و ناکۆکییەک لە نێوان (هاملتۆن) و نوورانییەکاندا ڕووی داو باس لەوەش دەکرێت ڕەنگە نوورانییەکان پێوەندییان بە ڕووداوی کوشتنەکەیەوە هەبێت.

(هاملتۆن) لە ساڵی (1775) پیاوکوژێک لە خاوەنکارێکی شکستخواردووی سکۆتلەندی لە دایک بوە، لە کاتێکدا دایکی هاوسەرگیریی لەگەڵ کەسێکی تردا کردوە و لە ژیانیدا دڵخۆش نەبوە.

پیاوێکی تری دانیشتووی هەمان ناوچە، ئەرکی خوێندن و فێرکردنی (هاملتۆن)ی لە ئەستۆ گرتوە، هەندێک لە شارەزایان و لێکۆڵەران بە دووری نازانن ئەو پیاوە باوکی ڕاستەقینەی بوو بێت، ئەوەش بە هۆی ئەو هەموو گرینگی پێدان و بایەخە زۆرەی بە (هاملتۆن)ی دەدا، هەروەها پێوەندییەکی باشیش لە نێوانیاندا هەبوو.

(هاملتۆن) پێوەندی بە گروپ و میلیشیا ئەمریکییەکانەوە کردوە، بە شێوەیەکی زۆر خێرا، سەرکەوتن و شارەزایی

زۆری له کارەکانیاندا به دەستخست، هەر لەبەر ئەوەش له جەنگی سەربەخۆییدا (جۆرج واشنتۆن) وەک یاریدەدەری خۆی دایمەزراند، بەڵام هەمیشه قسەوقسەڵۆکی نەسازی له سەر (هامڵتۆن) و یاردەدەرێکی تری (جۆرج واشنتۆن) به ناوی (جۆن لۆرینز) کراوە، به تایبەتی دوای دۆزینەوەی ئەو نامانەی له نێوانیاندا ئاڵوگۆڕ کراوە و بەشێکیشییان له سەری نووسراوە نامەی خۆشەویستی، له یەکێکیاندا نووسیویێتی «ئازیزم لۆرینز، چەندە دمەوێت به کردەوە نەک بەقسە باوەڕت پێ بهێنم که چەندە خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێی....»، له سەر یەکێک له پوولەکانی پۆستەی ئەمریکا له ساڵی (1981)دا وێنەیەکی هاوبەشی (هامڵتۆن و لۆرینز) دانرابوو.

(هامڵتۆن) ژیانێکی شێواو و شپرزە و پڕ له ئابڕووچوونی هەبوو، تا مردنیش به هەمان شێوە ژیا، ئەوەی له هەموو شتێک زیاتر کاریگەریی له سەر ژیان و ناو و ناوبانگی دروست کرد، پێوەندییەکەی بوو لەگەڵ ژنێکدا به ناوی (ماری ڕینۆڵدز)، که له کاتی خۆیدا ڕۆژنامەکانی ئەمریکا، به تەواوی، وردەکاری ڕووداوەکە و پێوەندییەکەی نێوانیان ئاشکرا کرد و بڵاو کردەوە، به تایبەتی که نزیکەی (10) هەزار دۆلاری له گەنجینەی گشتی ئەمریکا (که بڕێکی زۆر بوە لەو سەردەمەدا) بۆ هاوسەری ئەو ژنه خەرج کردوە بۆ ئەوەی بێ دەنگی بکات، چونکه پیاوەکە بێزاریی کردبوو و هەڕەشەشی لێ دەکرد، بەڵام ڕۆژێکیان هاوسەری ئەو ژنه (هامڵتۆن و ڕینۆڵدز)ی پێکەوەگرت که سێکسیان دەکرد، بۆ ماوەیەکیش جلوبەرگەکەی لێ دوور خستنەوە و له ژوورێکدا زیندانی کردن، هەروەها بەڵگە و وردەکاری پێویستیشی پێشکەش کرد، لەگەڵ خستنەڕووی بڕی

ئەو پارەیەی (هاملّتۆن) لە دژی نەیارە سیاسییەکانی خەرجی کردوە.

هەروەها ئەوەش ئاشکرابوو، کە پێوەندییەکی خۆشەویستی و سێکسی تریشی هەبوە لەگەڵ خوشکێکی هاوسەرەکەیدا، دواتر کورەکەی لە شمشێر بازییەکدا کوژرا و لە هەمان کاتدا کچەکەشی شێت بوو، خۆشی لە هەمان شوێنی کوشتنی کورەکەی لە لایەن یەکێک لە نەیارە سیاسییەکانییەوە کوژرا، کە (ئارۆن بر)ی جێگری (تۆماس جیفرسۆن)ی سەرۆکی (USA) بوو.

لە سەر دراوی (20) دۆلاری ئەمریکی وێنەی (ئەندرۆ جاکسۆن) هەیە، کە حەوتەم سەرۆکی (USA) و دامەزرێنەری پارتی دیموکراتەکانی ئەمریکایە، لە لایەن نەیارەکانییەوە بە (گوێدرێژ) ناودەبرا، ئەویش لە بەرانبەردا وێنەی (گوێ درێژ)ی کردە لۆگۆی سەرەکی پارتی دیموکراتەکانی ئەمریکا، لە مێژووی ئەمریکادا هیچ کەسێک نەبوە وەک ئەو تیرۆریست و خوێنڕێژ، سەربازی و سەرۆک، تەناتەت کۆنگرێسی ئەمریکا کە پابەند بوە بە هەموو یاساکانی لە ناوبردنی هیندییە سوورەکان، بەڵام ئیدانەی جەنگی نێوان (ئەندرۆ) و (هیندییە سوورەکان)ی کرد لە ساڵی (1834)دا، یەکێک لە ئارەزووەکانی بریتی بوو لە کاری نواندن بە تەرمی هیندییە سوورەکان، خودی خۆی سەرپەرشتی چەندین ئاهەنگی نواندنی کردوە بە تەرمەکانیانەوە، یەکێک لەو ئاهەنگانەش نواندن بوە بە تەرمی (800) هیندی سوورەوە، لە نێویشیاندا دەیان ژن و منداڵ هەبوو، چێژ و خۆشی دەبینی کاتێک دەستوپێوەندەکەی، پێستی هیندییەکانیان دەگوری و دایاندەماڵی، جارێکیان بە سەربازەکانی خۆی گوت «هیندییەکان بکوژن و پێستەکانیان دابماڵن، جیا کاریی لە نێوان گەورە و بچووکدا مەکەن، ئەوەی لە هێلکەی ئەسپێ دروست دەبێت هەر ئەسپێیە»، جارێکیی تر خۆی و سەربازەکانی (48) هیندی سووریان لە ناوماڵێکدا کۆ کردەوە و ئاگریان تێ بەردان و سووتاندنیان، دواتر پەتاتەیان لە سەر خۆڵەمێشەکەیان برژاند و وەک خواردنێکی بە تام خواردیان.

هەر وەک ژمارەیەک گوندی هیندییە سوورەکانی لە فلۆریدا سووتاند، ئەو کەسانەشی ڕزگاریان بوو، ژمارەیەکییانی کردە کۆیلەی خۆی، ئەوانەی تریشی وەک کۆیلە فرۆشت.

له ساڵی (1830)دا یاسای ڕاگواستنی هیندییه سوورەکانی له سەر خاک و ناوچەکانی خۆیان دەرکرد، بەڵام ساڵێک دواتر، دادگای باڵای ئەمریکا، ئەو بڕیارەی هەڵوەشاندەوە و هەندێک مافی بۆ هیندییه سوورەکان دەستەبەرکرد، له ماوەی سەرۆکایەتییەکەیدا ژمارەیەک بڕیار و یاسای دەرکرد، که هەموویان بوونه هۆی تاوانی گەورە بەرانبەر به هیندییه سورەکان و له ساڵی (1838) دا به ڕێگەی فرمێسک ناسرا.

لەگەڵ دەرکەوتن و بڵاو بوونەوەی ناو و ناوبانگه سیاسییەکەی، هاوکات ئابڕووچوونه سێکسییەکانیشی زیاتر پەرەیان سەند له سەر دەستی نەیارەکانی، وەک ئابڕووچوونەکەی دایکی، که وەک لەشفرۆش لای سوپای بەریتانیا کاری دەکرد، هەروەها هاوسەرگیرییەکەی خۆشی لەگەڵ ژنێکدا که هێشتا له ئەستۆی هاوسەرەکەیدابوو، هەروەها چەند شمشێربازییەکی دیاریشی هەیه لەگەڵ ئەو کەسانەی به جۆرێک له جۆرەکان گاڵتەجاڕییان به هاوسەرگیرییەکەی دەکرد.

له ساڵی (1831)دا ناوی (ئەندرسۆن) و هاوسەری کوڕەکەی پێکەوە دەهات له ئابڕووچوونێکی سێکسیدا، هاوشێوەی ئەو ئابڕووچوونانەی ئەندامانی حکوومەتەکەی و هاوسەرەکانیانی گرتەوە و هەندێکیانی ناچارکرد دەستلەکار بکێشنەوە، وەک (کفان بۆرین) که دوای (ئەندرسۆن) بوە سەرۆکی (USA).

هاوسەری کوڕەکەی ئەندرسۆن، ببوە شوێنگرەوەی هاوسەرە کۆچکردوەکەی (ئەندرسۆن)، له بەشداریکردن له ڕێوڕەسمه تەشریفاتییەکانی کۆشکی سپیدا.

لێرەدا (وەزیری جەنگ و حکوومەت و نیشتمان) سیاسییەکی قوربانی ئارەزووەکانێتی، ئەو وەزیـرەش (جۆن برۆفیمۆ)ی وەزیری جەنگی بەریتانیایە، لە حکوومەتی پارتی پارێزگارانی بەریتانیا کە (ماکمیلان) سەرۆک وەزیران بوو، لە نیشتمانێکدا کە بەریتانیا بوو.

(جۆن برۆفیمۆ) لە پێگەیەکی هەستیار و مەترسیداردا بوو، کە شایستەی ئەوەنییە بە ئاسانی بکەوێتە ژێر کاریگەریی هەندێک پێوەندیی گوماناوییەوە، کە خۆی و وڵات و دەوڵەتەکەشی بخاتە مەترسییەوە، (دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت)، (کریستین) ی دامەزراند بۆ ئەوەی پێوەندییەکی ناشەرعی لەگەڵ وەزیری جەنگی بەریتانیادا دروست بکات، مەبەستی دەستخستن و گەیشتن بە هەندێک زانیاریی زۆر مەترسیدار و ناسینی ئەو کەسانەی کاریان بۆ دەکەن.

لە سەردەمی شاژنە ئەلیزابێس دا و تا ساڵی (2018،12) سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لە سەر حکوومەت سزادراون، کە هەندێکییان زیاتر لە جارێک سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا بوون، بەڵام (هارۆڵدماکمیلان) لە هەموو سەرۆک وەزیرانەکانی تر چانسی خراپتر بوو، بە هۆی تێوەگلانی وەزیرە بە ناوبانگەکەی جەنگی کابینەکەی (جۆن برۆفیمۆ) لە پێوەندییەکی سێکسیدا، کە خیانەتی لەو و لە وڵاتەکەشی کرد، کە لە هەمان کاتدا پێوەندیشی بە پاشکۆی سەربازیی سۆڤیەتییەوە هەبوو، سیخوڕی بە سەر بەریتانیاوە دەکرد لە بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤیەت، وردترین و هەستیارترین و مەترسیدارترین نهێنی و زانیاری بۆ دەگواستنەوە.

سەرەڕای تێ پەڕبوونی نزیکەی نیو سەدە بە سەر گەورەترین چیرۆکی خیانەت لە مێژووی نوێی ئەورووپادا، کە

پاڵەوانەکەی ژنێک بوو بێت، هاوکات ئابڕووچوونێکی سیاسیشی لەگەڵ خۆیدا تەقاندەوە، کە بوە هۆی لە ناوچوونی حکوومەت و کاریگەری نەرێنی لە سەر چارەنووس و داهاتووی کۆمەڵێک سیاسەتمەداری دیار دروست کرد، بەڵام تا ئەمڕۆ بەریتانییەکان ناوی (کریستین کیلەر)یان لە یاد نەچوە، وەک بە ناوبانگترین خیانەتکار، مەترسیدارترین سیخوڕ، کە سوودی لە جوانی و نەرمونیانییەکەی بینی، بۆ ئەوەی وەک هێڵێکی جاڵجاڵۆکە چوار دەوری بە ناوبانگترین وەزیری بەریتانیا بتەنێت، کە تا ئەو سەردەمە بەریتانیا بە خۆیەوە بینیبوونی، هەروەها بۆ وێنەگرتنی چەندین دیمەنی ئابڕووچوون لەگەڵ سیاسەتمەدارە گەورەکانی بەریتانیادا.

لەگەڵ تێ پەڕبوونی ئەو هەموو کاتەدا، بەڵام هێشتا وتار و کتێبی نوێ دەنووسرێت لە سەر ئەو ئابڕووچوونەی هەر جارە و شتێکی نوێی لێ ئاشکرا دەبێت و بڵاو دەبێتەوە، چونکە تا ئێستا گەلی بەریتانیا چاوەڕێی زانینی تەواوی نهێنییەکانی پشت ئەو چیرۆکی ئابڕووچوونەیە.

ساڵی (1963) خراپترین ساڵ بوو لە مێژووی بەریتانیا، هــەروەک ئینگلیز دەڵێت لـەو ساڵـەدا بەریتانیا توشـی بە ناوبانگترین ئابڕووچوون بوو لە سەدەی بیستەمدا، کە بۆنی خیانەتێکی داپۆشراو بە سێکس و سیخوڕیی لێ دەهـات، کە وەک پەڵەیەک بوو لە نێو کۆمەڵگەی بەریتانیا لەو سەردەمەدا، نازناوەکەی (کریستین کیلەر) بریتی بوو لە «ئەو سەماکارە ڕووتـەی حکوومەتەکەی پارتی پارێزگارانی ڕووخـاند»، بۆ هەمیشەش تیۆری پیرۆزکردنی لای بەریتانییەکان بەرانبەر بە سیاسەتمەداران گۆڕی، دوای سەلماندنی پێوەندییەکەیان لەگەڵ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت دا.

(بـرۆفـيـۆمـۆ)ی وەزیـری جەنگی بـەریـتـانـیـا، دەرچـووی زنکۆی هـاروو ئۆکسفۆردبوو، ناچاربوو لە سالّی (1963) دەستلەکابینەکەی (هارۆلّد ماکمیلان) بکێشێتەوە، دوای ئەو درۆیەی لە بەردەم پەرلەمانی بەریتانیادا کردی سەبارەت بە پێوەندییەکەی لەگەڵ خاتوو (کیلەر)دا، کە ئەو کاتە بە (ژنە مەغوییەکە)، (ژنێک بەپێی داواکـاری)، (التورتە المحشومە بالعسل).

(پرۆفیمـۆ) بـە ئـەنـدامـانـی پـەرلـەمـانـی بـەریـتـانـیـای گوت پێوەندییەکەی لەگەڵ (کیلەر)دا شاراوەبوە، لە ڕاستیدا دوو ساڵ پێشتر، (پرۆفیمۆ) لە مەلەوانگە تایبەتەکەی (لۆرد ئەستەر)دا چاوی کەوت بە نمایشکارێکی جلوبەرگی تەمەن (19) ساڵ و پێوەندییەکی سێکسی و ڕۆمانسی لە نێوانیاندا دەستی پێکرد، ئەوەش لە کاتێکدا وەزیر، سەرقاڵی پێوەندییە ڕۆمانسییەکەی بوو لەگەڵ پاشکۆی دەریایی ڕووسیدا، لە خراپترین ڕۆژەکانی جەنگی سارد دا.

لە هەمان سـاڵدا، دکتۆر (سیتیڤن وارد) کە لە ڕوانگەی چینی ئەرۆستۆکرانی باڵای بەریتانیاوە پزیشکێکی شارەزا و بە ئەزموونی دانانی ئێسک بوو، لە هەمان کاتدا وێنەکێشێکی شارەزاو لێهاتووش بوو، پیاوە بە ناوبانگەکانی بەریتانیا چەند سەعاتێک لە بەردەمیدا دادەنیشتن بۆ ئەوەی وێنەیان بکێشێت، بەڵام هیچ یەکێک لە میوان و سەردانکارەکانی نەیانزانیوە، کە پێوەندییەکی باشی هەیە لەگەڵ کچانی جوان و پسپۆڕییەکەی لە بانگهێشتکردنی کەسانی گەورە بۆ ئەو ئاهەنگانەی سازی دەکردن، کە یەکێک لە ئەستێرەکانی ناو ئاهەنگەکانی (خاتوو کریستین کیلەر) بـوو، یەکێکی تریش لە هـاوڕێ نزیکەکانی

پزیشکەکە (جۆرن پرۆفیمۆ)ی وەزیری جەنگ بوو، (دکتۆر وارد) یەکێک بوو لە ئەندامانی دەزگای هەواڵگری بەریتانیا، کچی جوان و سەرنج ڕاکێشی پێشکەشی لێپرسراو و پیاوانی نێردە دیبلۆماسییەکان دەکرد و وێنەی نەشیاوی دەگرتن و وەک کارێکی هەواڵگریی لە دژیان بە کاری دەهێنایەوە، بۆ ئەوەی ناچاریان بکات کاری بۆ بکەن، بەڵام نەیدەزانی جادوەکە بە سەر جادووکەرەکەدا هەڵدەگەڕێتەوە و پێچەوانە دەبێتەوە.

لەساڵی (1956) دا (دکتۆر وارد) باوەڕی وابوو کە سیستمی کۆمۆنیزم هەم ڕێبازە هەم باوەڕە، ساڵی (1961)، (کریستین کیلەر)ی سەماکاری ناساند بە (یوجین ئیڤانۆڤ)ی دیبلۆماتکاری ڕووسی، کە بە ئاشکرا وەک پاشکۆی دەریایی لە باڵیۆزخانەی ڕووسیا لە لەندەن کاری دەکرد، بەڵام لە بنەڕەتدا یەکێک بوو لە کارمەندانی دەزگای هەواڵگری ڕووسیا.

(ئێدوارد) و (ئیڤانۆڤ) بەم جۆرە یەکییان بینی و یەکترییان ناسی، هەردووکیشییان لە دەزگای هەواڵگری کاریان دەکرد، (ئیڤانۆڤ)ی ڕووسی پێی وابوو (ئێدوارد) دەتوانێت بۆ سەلماندنی وەفاداری و بیروباوەڕی نەگۆڕی بەرانبەر بە کۆمۆنیزم، ببێتە بەشێک لە خزمەتی هەواڵگری ڕووسیا و کچە جوانەکانیشی بۆ ئەو مەبەستە بە کار بهێنێت، بەڵام (برۆفیۆمۆ) چانسێکی خراپی هەبوو، قاچی ئاڵا لە داوی (کریستین کیلەر) ەوە، هەر چەندە (ئێدوارد) ئاماژەیەکی پێدا، بەوەی سۆڤیەت دەیەوێت بە نهێنی سوودی لێ وەربگرێت و زانیاری لێوە بە دەست بخەن، لە ڕاستیشدا دەزگای هەواڵگری یەکێتی سۆڤیەت دەیویست لە ڕێگەی وەزیری جەنگی بەریتانیاوە بزانێت ئایا (USA) مووشەکی ئەتۆمی دەداتە ئەڵمانیای خۆرئاوا.

خیانەتەکە لە یەکێک لە نووسینگەکانی ناوەڕاستی لەندەن و یەکێک لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی ئەو شارە دەستی پێکرد، وەک ئاماژەیەک بۆ کلینکەکەی (دکتۆر ستیڤن وارد)ی پزیشکی ئێسک، ئەو پزیشکە کەسایەتییەکی بێزراو و قێزەونی هەبوو، سەرەڕای ئەو پێگە زانستی و پزیشکی و کۆمەڵایەتییە بەرزەی هەیبوو، بەڵام ئەمە ڕێگرنەبوو لەوەی کۆمەڵێک پێوەندی گوماناوی لەگەڵ دوو چینی کۆمەڵگەی بەریتانیدا دروست بکات و بە دوو دەمامکی ساختە و جیاوازەوە، لە نێوان هەر دوو چینەکەدا بژی.

ماسک و کەسایەتی یەکەمی، وەک پزیشکێک خۆی دەنواند بە کار کردن لە کلینیکە تایبەتەکەی و دیدار و بەرکەوتنەکانی لەگەڵ کەسە گەورە و بڕیار بە دەستەکانی گەلەکەی، ماسک و کەسایەتی دوەمیشی، لە ئاهەنگە تایبەتەکاندا دەیپۆشین کە لەگەڵ چینێکی ناسازی کۆمەڵگەدا سازی دەکردن و بریتی بوون لە لەشفرۆش و کچی شەوان و بێ ڕەوشتەکان، بەم جۆرە پزیشکەکە ئەم دوو چینەی لە ئاهەنگە تایبەتییەکانیدا لە کۆشکەکەی یاخود لە باخەکەی بە یەک دەگەیاند، ئەوەش بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیی و بە دەستهێنانی پارەو چەند سوودێکی تری تایبەتی.

یەکێک لە نەخۆشەکانی (د.ستیڤن)، (کۆڵن کۆت) بوو، کە سەرنووسەری ڕۆژنامەی دەیلی تەلگرافی بەریتانی بوو، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی کە (لۆمباگۆ) بوو، پێوەندییەکی دۆستانە لە نێوانیاندا دروستبووبوو، لە یەکێک لە سەردانەکانیدا بۆ نووسینگەی ڕۆژنامەکە، (کۆڵن کۆت)، (دکتۆر ستیڤن)ی بە (کابتن یوجین ئیڤانۆف)ی پاشکۆی دەریایی باڵیۆزخانەی یەکێتی سۆڤیەت لە لەندەن ناساند، کە لە میانەی وەفدێکدا سەردانی

نووسینگەی ڕۆژنامەکەیان کرد، بە مەبەستی ئاگاداربوون و بە دەستخستنی زانیاریی لە سەر ڕەوتی چاپخانە و کاری ڕۆژنامەگەری، کە تا ئەو کاتە بواری ڕۆژنامەگەری پێی گەیشتبوو.

(ئیڤانۆڤ) و (ستیڤن) خاڵی هاوبەشیان زۆربوو، هەر دووکییان بە دوای ژناندا دەچوون و حەزیان لەوەبوو پێوەندی جۆراوجۆر و زۆریان لەگەڵ ژناندا هەبێت، هەر دووکییان ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی ئارەزوو و پێداویستیی و چێژی یەکتری پڕبکەنەوە، هەر یەکەیان بە ڕێگەی خۆی.

بەڵام ئەو کچەی توانی یاری بە وەزیری جەنگی بەریتانیا بکات (کریستین کیلەر) بوو، کە لە یەکێک لە یانەکانی شەوانەدا لە شەقامێکی لەندەن کاری دەکرد، کارەکەشی لەو یانەیە ئەوەبوو بە ڕووتی لە نێوان مێزەکاندا بێت و بچێت، ئەوەش بە هۆی ئەو جەستە سەرنج ڕاکێش و نەرم و نیانەیەوە کە هەیبوو، لە یەکێک لەو شەوانەشدا (د.ستیڤن) چاوی کەوت بە (کریستین)، بانگهێشتی کرد بۆ شووقە تایبەتەکەی و ماددەی هۆشبەر و سێکسی پێشکەش کرد، دوای ماوەیەک (کریستین) ئالودەبوو، بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لێی دوور بکەوێتەوە، بۆیە بە ناچاری ملیدا بۆ جێبەجێکردنی هەموو فەرمان و کارێک کە پزیشکەکە پێی دەگوت و بە هەر نرخێک بوایە ئامادەبوو بی کات.

لە گەشتێکیدا بۆ هەرێمی (کلیفیدین)، (د.ستیڤن) سەردانی (لۆرد ئەستۆر)ی کرد، کەسێیەم دەوڵەمەندی بەریتانیا بوو، یەکێک بوو لە هاوڕێکانی، بە هۆی چاککردنەوەی شکاوییەکانی جەستەیەوە کە لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا بریندار بوو یەکییان

ناسی و پێوەندییەکی پتەو لە نێوانیاندا دروستبوو، (لۆرد) یەکێک لە خانوە گوندییەکانی پێشکەشی (ستیڤن) و هاوڕێکانی کرد کە (ئیڤانۆڤ و کریستین) و چەند کەسێکی تر بوون و پێی گوتن کۆشکەکە لە خزمەت ئەواندایە و هەر کاتێک و هەر چۆنێک دەیانەوێت بە کاری بهێنن، (کریستین و ئیڤانۆڤ) تا دەهات پێوەندییە ڕۆمانسییەکەی نێوانیان پتەوتر و گەرمتر دەبوو، بە بەردەوامی دیداری تایبەت و ئاهەنگی تایبەتییان هەبوو.

تا ئێرە (جۆن برۆمیمۆ)ی وەزیری جەنگی بەریتانی، (کریستین کیلەر)ی نەبینیوە و هیچیشی لەبارەوە نازانێت، تا ئەو کاتەی (کریستین) دەچێتە (کلیفیدین) و لە ماڵەکەی (لۆرد ئەستۆر)دا (برۆمیمۆ) دەبینێت، دیدار و بینینی یەکەمیان زۆر ئاسایی و سادە بوو، کەسیان سەرنجی ئەوەی تریانی ڕانەکێشا، دوای چەند هەفتەیەک جارێکی تر (برۆمیمۆ) لەو ماڵەدا کە (کریستین)ی تێدا نیشتەجێ ببوو، سەردانی (لۆرد ئەستۆر)ی کرد، بەڵام یەکبینینی ئەم جارەی نێوان وەزیر و خاتوونە سیخوڕەکە زۆر جیاوازتربوو لەو جارەی پێشووتر.

(کریستین) لە نێو مەلاوانگەی خانوەکەدا خۆی دەشووشت و تەواو ڕووتبوو، لەگەڵ بیستنی دەنگی پێیەکدا کە لێی نزیک دەبۆوە، دەیویست خێراتر خۆی بشوات و لە مەلەوانگەکە بچێتە دەرەوە و جلەکانی لەبەر بکاتەوە و کەس بە ڕووتی نەیبینێت، بەڵام دەستێکی تر لەو خێراتر، گەیشتە جلەکانی و هەموو جلەکانی فڕێدایە شوێنێکی دوورتر، بۆ ئەوەی زیاتر چێژ لە جوانی و سەرنج ڕاکێشی جەستەی ببینێت، ئەو دەستەش دەستی (برۆمیمۆ) بوو.

وەزیر، بەرگەی جوانییە کوشندەکەی نەگرت و بە درێژایی شەو بیری لێ دەکردەوە، سوربوو لە سەر ئەوەی پێی بگات،

دوای ئەوەی داواکەی لە (لۆرد ئەستۆر)ی هاوڕێی کرد، بە مەرام و ئارەزووەکەی گەیشت.

بەم جۆرە وەزیر و کچە جوانەکە بوونە خۆشەویستی یەک، پێکەوە کۆ دەبوونەوە و سەردانی شوێنە تایبەتەکانیان دەکرد، بۆ ئەوەی کاتی خۆش پێکەوە بە سەربەرن، هەندێک جاریش ئۆتۆمبێلە ڕەسمییە حکومییەکەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، بۆ ئەوەی لە بینای پەرلەمان و ماڵی سەرۆک وەزیران لە (داوننج ستریت) ڕزگاری بکات، زۆرینەی بینینەکانیان لە شووقەکەی (وارد) بوو، ئەو کچە سەرنج ڕاکێشە توانی (وەزیری بەرگری بەریتانیا) و (پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی ڕوسیا لە لەندەن) بباتە سەر جێگەی خەوەکەی، دۆخەکە بە ئاسایی و بە بێ کێشە تێ دەپەڕی.

تیمی (m15) لە هۆبەی دژە سیخوڕی لە لەندەن، هەستی بە نیگەرانی و دوودڵی دەکرد، بەرانبەر تێکەڵاوی و پێوەندییە زۆرەکانی (د.ستیڤن) بە لێپرسراوانی باڵای وڵاتەوە کە پێگەی هەستیارییان هەیە، بەڵام هەموو کاتێک ئەو دۆسیەیەی لە لایەن هەواڵگری بەریتانیاوە لە دژی (د.ستیڤن) دەکرایەوە وەک خۆی دادەخرایەوە، بە هۆی نەبوونی هیچ بەڵگەیەکەوە.

دوای گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەیەکی زۆر، هۆبەی دژە سیخوڕی لە لەندەن بڕیاریدا سود لە پێوەندییە زۆر و زەوەندەکانی (د.ستیڤن) وەربگرێت، ئەوەش بە ڕەخساندن و دروستکردنی کەشی گونجاو و خۆش بۆ دیبلۆماتکارە بیانییەکان کە سەردانی بەریتانیا دەکەن، دواتر داوای زانیارییان لێ کرد لە سەر (ئیڤانۆڤ) کە پێوەندی لەگەڵ (کریستین)دا هەبوو، دەیانزانی (کریستین) سیخوڕێکی ترسناکی سۆڤیەتە.

ئەوەبوو بە پەلە هۆبەی ناوبراو داوایان لە (سێر سۆرمان یۆرک) وەزیری کاروباری ئەنجوومەنی وەزیران کرد، کە وەزیری بەرگری بەریتانیا لەو ژنە فێڵبازە دووربخاتەوە.

بەڵام (ئیڤانۆڤ) بەپێی شارەزایی و هەستە ئاسایشییەکەی، زانی کە لە مەترسیدایە و هەر کاتێک بێت دەستگیری دەکەن، بۆیە بروسکەیەکی بۆ فەرماندەکانی کرد لە مۆسکۆ و ئەوانیش ڕێنماییان کرد لەندەن بە جێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە بۆ مۆسکۆ، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات سووربوو لە سەر ئەوەی هەموو ئەو کاسێتە ڤیدیۆییانە بەرێت، کە تایبەت بوو بە پێوەندی سێکسی هەندێک لە دیبلۆماتکارە بیانییەکان و لە لایەن (د.ستیڤن)ەوە تۆمارکرابوون، بۆ ئەوەی دواتر بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی بە کاریان بهێنێت.

(ئیڤانۆڤ) توانی بە سەرکەوتوویی لەندەن بە جێ بهێڵێت و کاسێتەکانیش لەگەڵ خۆیدا ببات، دوای ئەوە (کریستین) بە یارمەتی (د.ستیڤن) چەند پێوەندییەکی تری نەسازییانەی بە ڕێ کرد، تا لە لایەن یەکێک لەو کەسانەی ئەو کارە ناشرینەی لەگەڵ دەکردن، ڕووبەڕووی هەوڵێکی کوشتن بۆوە، بەوەش هەستی بە ترس و شڵەژانێکی زۆر دەکرد، هیچ هەوڵێک نەیتوانی هێوری بکاتەوە و لەو ترسە دەری بهێنێت کە تێی کەوتوە، تەنانەت پێوەندییەکانیشی لەگەڵ کەسانی باڵادەستدا لە یانەکانی شەوانە توشی شۆکی کرد، لە دڵدانەوە و دڵنیاکردنەوەیدا کە هیچ کەسێک ناتوانێت بیکوژێت، بەڵام قەدەر، شەوێک دوو ڕۆژنامەنووسی ڕۆژنامەی (بیکتۆریاڵ)ی گەیاندە ئەو یانەیە، ئەوانیش گوێیان لە هەموو سکاڵاو قسەکانی (کریستین) بوو کە چەند جارێک ناوی (وەزیری بەرگری) هێنا، ئەوانیش ڕۆژی دواتر هەرچییەکیان گوێ لێ بوو وەک خۆی بڵاویان کردەوە.

ئـەوەش بـوە هـۆی دروسـتبوونی فـەوزایـەکی گـەورە لە شەقامی ئینگلیزی و ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا، داوایان لە وەزیری بەرگری بەریتانیا کرد، وشە بە وشەی ئەو تۆمەتانە ڕەت بکاتەوە و ڕۆژنامەکەش سزا بدرێت و قەرەبووی گەورەی وەزیر بکاتەوە، بەڵام بەڵگەکان زۆربوون لە دژی، بە تایبەتی ئەوەی (تیمی m15) پێشکەشی کردبوو.

جەنابی وەزیـر، دوای ئـەوەی فشارێکی زۆری لە سەر دروستبوو، لە بـەردەم ژنەکەیدا دانـی بە هەموو شتێکداناو هەموو ڕاستییەکانی بۆ باس کرد، ئەویش ئامۆژگاری کرد بچێتە لای سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا و هەموو شتێکی بە ڕاستی و دروستی وەک خۆی بۆ بگێڕێتەوە.

بەڵام لەو کاتەدا (هارۆڵد ماکمیلان)ی سـەرۆک وەزیرانی بەریتانیا ئامادەنەبوو ببینێت و داواکـاری چاوپێکەوتنکەی ڕەت کـردەوە، دواتـر بڕیاریدا (وەزیـری بەرگری) لە بـەردەم نووسینگەی سەرۆک وەزیراندا بە نووسراوێک هەموو درۆکانی کە لە بـەردەم پەرلەماندا کردبووی ڕاست بکاتەوە و دان بە هەموو شتێکدا بنێت، هەروەها لەگەڵ ئەو ڕوونکردنەوە و دانپێدانانەشدا، دەستلەکارکێشانەوەکەی بنووسێت و هاوپێچی ئەو ڕوونکردنەوانەی بکات.

بەپێی ئەو دابونەریتەش کە لە بەریتانیا هەبوو، دەبوایە (جۆن برۆفیمۆ)ی وەزیری بەرگری بچوایەتە کۆشکی (باکنگهام) بۆ وەرگرتنی ئەستۆپاکی شاژنی بەریتانیا و بینینی شاژن، بەڵام خۆی نەیتوانی بچێت کەسێکی تری لە جیاتی خۆی نارد تا چاوی بە شاژنە ئەلیزابێس بکەوێت، دوای ئەوە (د.ستیڤن وارد) دەستگیرکراو ڕەوانـەی زیندانکرا، هەروەها نووسینگە

ڕازاوە و گرانبەهاکەشی لە ناوەڕاستی شاری لەندەن داخرا، لە میانەی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا، دەرکەوت (ستیڤن) و (کریستین) و (ئیڤانۆڤ) تۆڕێکی سیخوڕین، دوای ماوەیەکیش لەن یۆزینداندا خۆی کوشت.

بەڵام دادگا بڕیاریدا (کریستین) ئازاد بکرێت بە هۆی ئەوەی تەمەنی یاسایی تەواو نەکردبوو، هەروەها بە دڵێکی باش و بە ڕاستگۆیی هەموو زانیارییەکی پێ گوتن کە دەیزانی و ئاگای لێ بوو، (برۆفیمۆ)ی وەزیریش بۆ لێکۆڵینەوە برایە بەردەم (لۆرد وینێج) کە سەرپەرشتی لێکۆڵینەوەی لەو دۆسیەیە دەکرد و بە ناوبانگترین دادوەری لەندەن بوو.

دوای ئەوەی گەردەلولەکە تا ڕادەیەکی کەم لە سەر (پرۆمیمۆ) کەم بۆوە، بڕیاریدا بە تەواوەتی واز لە کاری سیاسی بهێنێت و لە گۆشەیەکی لە بیرکراوی خۆرئاوای لەندەندا بژی، هەروەها وەک خۆبەخشێکیش لە ڕێکخراوێکی خێرخوازی تایبەت بە هاوکاریکردنی کەسانی کەمژیر و کەم ئەندامان و خاوەن پێداویستییەکان کاری دەکرد.

بەم جۆرە، پەردە لە سەر ژیان و کار و توانای یەکێک لە دیارترین کەسایەتییە سەربازی و ئینگلیزەکانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو دادرایەوە.

دەزگای هەواڵگری بەریتانیا بە وردی و بە چڕی چاودێری (دکتۆر ستیڤن وارد)ی دەکرد، کەچی بریکارەکانی (m15)، بێ ئاگابوون لەوەی یەکێک لە وەزیرەکانی حکوومەتی وڵاتەکەیان پێوەندی لەگەڵ یەکێک لە کچەکانی بەردەست (دکتۆر ستیڤن)دا هەیە، بەڵام دەیانزانی (پرۆفیمۆ) و (دکتۆر ستیڤن وارد) پێوەندییەکی زۆریان هەیە، ئاگاداریشیان کردەوە و

هۆشداریشیاندایە لە هاوڕێیەتیکردنی ئەو دکتۆرە بەریتانییە، بە هۆی تێکڵاوی زۆریەوە لەگەڵ (ئیڤانۆڤ)ی پاشکۆی سەربازی یەکێتی سۆڤیەت، هەروەها وەزیری بەرگری بەریتانیا هەموو پێوەندییەکی لەگەڵ (کریستین)دا پچڕاند، بەڵام دوای ئەوەی بە بێ ئاگایی هەموو نهێنییەکانی درکاند و ئاشکرای کرد.

ڕەنگە کارەکە هەر بە نهێنی بمایەتەوە ئەگەر (کریستین) هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ بازرگانێکی ماددە هۆشبەرەکاندا نەبوایە، چونکە ڕۆژێک (کریستین) نەچوە بۆ لای ئەو بازرگانە، ئەویش هێرشیکردۆتە سەر ماڵەکەی (د.ستیڤن) و وای زانیوە لەوێیە و لەوێی دەشارنەوە، بەو هۆیەوە (بازرگانی ماددەی هۆشبەر)ەکە دەستگیرکراو (کریستین)یش وەک شاهیدحاڵێک بانگکرا.

کریستین لە سەر کورسی شاهیدحاڵ دانراو پرسیاری لێ دەکرا، ئەوەی دەیزانی و پێوەندی بەرپرسیارەکانیشەوە نەبوو هەمووی گوت، گوتی پێوەندیم لەگەڵ چوار پیاودا هەیە (بازرگانی ماددەی هۆشبەر، دکتۆر ستیڤن وارد، ئیڤانۆڤی پاشکۆی سەربازی باڵیۆزخانەی یەکێتی سۆڤیەت لە لەندەن، پرۆمیمۆی وەزیری بەرگری بەریتانیا)، بەڵام بە زیادبوونی ناوی چوارەم بۆمبەکە تەقییەوە، بە تایبەتی لەو کاتەدا جەنگی سارد گەیشتبوە لوتکە و دۆخێکی هەستیار.

(کریستین) گوتی چەند ڕۆژێک پێشتر هەموو پێوەندییەکم لەگەڵ وەزیردا نەماوە، نازانم چۆن وەزیری بەرگری بەریتانیا دەستبەرداری بەرپرسیارێتییەکەی دەبێت و سێکسم لەگەڵ دەکات لە کاتێکدا هاوسەری هەیە. هەروەها گوتیشی دکتۆر (ستیڤن) ناچاری کردووم زانیاری نهێنی لە وەزیری بەرگری بەریتانیا وەربگرم و کردیشم، وەزیری بەرگری چەند جارێک

ڕای گەیاند هیچ پێوەندییەکی بە دۆخی ئەو دوانەوە نییە، بەڵام هیچ کەسێک لە هاوکارەکانی لە ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا باوەڕیان پێ نەکرد.

لە (4ی یۆنیۆی ساڵی 1963) دا (جۆن برۆفیمۆ)ی وەزیری بەرگری بەریتانیا بە ناچاری دەستلەکارکێشانەوەکەی پێشکەش کرد، (کریستین کیلەر)یش پێی وابوو ددان نانی بەوەی وەک سیخوڕێک لە بەرژەوەندی سۆڤیەت کاری کردوە، ناوناوبانگی زیاتری بۆ پەیدادەکات، ڕۆڵبینینی وەک سیخوڕێک بە ڕاستی، چانسی ئەوەی پێ دەدات هەمان ڕۆڵی سەرەکی لە فیلمی جیمس بۆند (700)دا بگێڕێت، بەڵام تەنها ڕۆڵێکی لاوەکی گێڕا، کە قابیلی لە بیرچوونەوەیە.

لە کاتێکدا (برۆفیمۆ) وازی لە کاری سیاسی هێنا و خۆی بۆ کاری خێرخوازی تەرخانکرد، هەندێک لە سیاسەتمەدارانی بەریتانیا هاوسۆزییان بۆ دەربڕی و پێیان وابوو ، (وەزیری بەرگری بەریتانیا) قوربانی ئەوەیە بۆتە دیلی ئارەزووەکانی و کەوتۆتە داوی مەکر و ناز و جوانی کچێکەوە، کە هەموو گیانی سیحرو جادووبوو.

لە ساڵی (1975)دا، شاژنە ئەلیزابێسی دوەم شاژنی بەریتانیا، نازناوێکی شاهانەی بەخشییە (پرۆفیۆمۆ) وەک ڕێزلێنانێک لەو کار و خزمەتە خێرخوازییەی پێشکەشی کەسانی بێ لانە و کەم دەرامەت و بێ توانای کردوە لە کەرتی ڕۆژئاوای پایتەختی لەندەن.

لە ساڵی (2003)دا هەموو پارتە سیاسییەکانی بەریتانیا کەمپەینێکیان ڕاگەیاند و داوایانکرد (پرۆفیۆمیۆ)ی پیر، بکرێتە ئەندامی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری (ئەنجوومەنی تایبەتی شاژن)،

دوای ئەوە لە لایەن (جۆن مێجەر)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیاوە لە بەرانبەر کارە خێرخوازییەکانیدا خەڵاتکرا، هەروەها یەکێکیش بوو لەو (650) میوانە تایبەتەی بانگهێشتکرابوون بۆ ئاهەنگی (80) ساڵەی لە دایک بوونی (بارۆنە مارگرێت تاتچەر)ی سەرۆک وەزیرانی پێشتووتری بەریتانیا.

بڵاوبوونەوەی وێنەکەی وەزیر لەو ئاهەنگەدا، سەر لە نوێ ناوی (برۆفیمۆ) و (کریستین کیلەر)ی خستەوە بەرباس، هەروەها بڵاوکردنەوە و ئامادەکردنی فیلمێکی دۆکۆمێنتاری لە سەر چیرۆکێکی کۆن لە لایەن کەناڵی (bbc2)ی بەریتانییەوە، ئاگرەکەی خۆشتر کردەوە، ئەو فیلمە دۆکیۆمێنتارییە چیرۆکی پێوەندییەکەی (کیستن کیلەر)ی سیخوڕ و (پرۆفیۆمیۆ)ی وەزیری بەرگری بەریتانیا گێڕایەوە و باسی لەوەکرد، بینیمان چی بە سەر وەزیردا هات، بەڵام ئایا کچە سیخوڕەکە چی لێهات؟

(کیستن کیلەر) دوو جار هاوسەرگیری کردو دوو کوڕی هەبوو، لە شوێنێکی تایبەت بە شووشتن و ئوتووکردن کاری دەکرد، وێنەکەشی لە گۆڤاری (تەنها بۆ پیاوان)دا بڵاوبۆوە، لە یەکێک لە خوێندنگەکاندا کارێکی پێدرا، بەڵام دوای ئەوەی بەڕێوەبەری خوێندنگەکە بە چیرۆکەکەی پێشووتری زانی، هەرزوو دەریکرد.

لە ساڵی (2001) دا (کریستین کیلەر) کتێبێکی بە ناونیشانی (دواجار، ڕاستی چیرۆکەکەم...) بڵاوکردەوە، کە بریتی بوو لە ددان پێدانانی خاوەنی بە ناوبانگترین ئابڕووچوون لە سەدەی بیستدا، کەبوە هۆی کۆتایی هێنان بە چارەنووسی (جۆن پرۆفیۆمیۆ)ی وەزیری بەرگری بەریتانیا و ڕووخاندنی حکوومەتی بەریتانیا بە سەرۆکایەتی (هارۆڵد مەکمیلان)، کە لە لایەن پارتی پارێزگارانەوە پێک هێندرابوو.

هەر لەو کتێبەدا، (کریستن کیلەر) بۆ یەکەم جار خۆی دانی ناوە بەوەی لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا لە بەریتانیا ڕوویدا و بە ئابڕووچوونی سەدە ناسرا.

(کیلەر) ئەوەشی ئاشکراکرد (د.ستیڤن وارد) کە بە (برۆفیۆمیۆ) و (ئیڤاننتان)ی ناساندوون، سیخوڕی یەکێتی سۆڤیەت بوە، ئاگای لە چەند دیدار و پێوەندییەکی نێوان (ستیڤن) و (سێر ڕۆجەرز هۆلیس) بەڕێوەبەری (mi5) بوە، کە لقێکە لە دەزگای هەواڵگری بەریتانیا، هەروەها (هۆلیس)یشی بەوە تۆمەتبارکردوە کە کاری بۆ دەزگای هەواڵگری سۆڤیەت کردوە، ددانیشی ناوە بەوەی لەجیاتی (هۆلیس) چەند بەڵگەنامەیەکی داوەتە دەست باڵیۆزخانەی ڕووسیا لە لەندەن.

(کیستن کیلەر) لە کتێبەکەیدا، بە توندی ڕەتی کردۆتەوە لەشفرۆش بێت و بەو ناوە بانگ بکرێت، تەئکیدیشیکردۆتەوە لەوەی ئەو ڕاپۆرتە ڕەسمییەی لە سەر ئابڕووچوونەکە ئامادە و بڵاوکرایەوە، بە ئەنقەسەت ئیشی لە سەر ئەو لایەنە کردوە و وێناو ناوبانگی شێواندوە، وەک هەوڵێک بۆ کەمکردنەوەی قەبارەی ئابڕووچوونە سیخوڕییەکە و گۆڕینی بۆ ئابڕووچوونێکی سێکسی و چیرۆکێکی خۆشەویستی لە نێوان (لەشفرۆشێک و وەزیرێک و سیخوڕ)ێکدا.

(کیستن کیلەر) لە کتێبەکەیدا، سەرسوڕمانی خۆشی دەربڕیوە بەرانبەر لێ خۆشبوونی خێرای بەریتانییەکان بەرانبەر بە (پرۆفیۆمۆ) کە لە بەردەم ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیادا درۆی کرد و دواتر پەشیمان بۆوە و ددانی بە هەموو ڕاستییەکاندانا.

هەروەها (مارگرێت تاتچەر)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری بەریتانیا، (پرۆفیۆمۆ)ی بە پاڵەوانێکی نەتەوەیی وەسفکردوە،

بەڵام ئەم تا ئێستاش ئەو لەشفرۆشەیە کە هەموو کۆمەڵگە ڕقیان لێیەتی و دەیبوغزێنن و تەنانەت کوڕەکەی و دایکیشی بە هەمان ناو بانگی دەکەن، ئێستا بە تەنیا لە سەر شەقامەکاندا لەگەڵ پشیلەیەکدا دەژی، ڕێگە نادات کەس لێی نزیک بێتەوە و دەستی لێ بدات و قەرزێکی زۆریشی لە سەر کەڵەکە بوە، بەپێی ئەوەی پەیامنێرێکی ئێندی پێندت باسی کردوە.

لە بارەی قۆناغەکانی ژیانیشییەوە، (کریستین کلیر) باسی لەوەکردوە قۆناغی ژیانی منداڵی زۆر سەخت بوە، لە تەمەنی (17) ساڵیدا ڕایکردوە بۆ لەندەن و لە یەکێک لە یانەکانی شەوانەدا وەک سەماکار کاری کردوە، کە سوودی خراپیان لە جوانییە جادووییەکەی وەرگرتوە، گوتووشیەتی هەر لەوێ (د.ستیڤن وارد)ی ناسیوە دواتر ئاشنای کردوە بە کۆمەڵگەیەکی خۆشژیاو و پۆشتە، هەروەها ناساندیشی بە (پرۆفیۆمۆ) هەرزوو کەوتە داویەوە و نەیتوانی ڕێگربێت لە دروستبوونی پێوەندییەکی سێکسی و خۆشەویستی لە نێوانیاندا لە کاتێکدا کە ژنیشی هەبوو.

(کریستین) باسی لەوەشکردوە (د.ستیڤن)، (ئیڤانۆڤ)ی سیخوڕی ڕووسیای سۆڤیەتی پێ ناساندوە، کە زانیاری و بەڵگەی لە سەر سیاسەتی سەربازیی بەریتانیا و جبەخانە و مووشەکە نوێیەکانی و فڕۆکەکان و ژێردەریایی و پلانە ستراتیژییەکانی هاوپەیمانی ئەتڵەسی و پێوەندییە تایبەتی و نهێنییەکانی ئەمریکا و بەریتانیا کۆ دەکردەوە.

بەڵام مەترسیدارترین بەشی ناو کتێبەکە ئەو بەشەیە کە تایبەتە بە تیرۆرکردنی (جۆن کەنەدی) سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا و دەڵێت» بە دەر لەو ڕاستی و بەڵگانەی کە لە لێکۆڵینەوەکەی (لۆرد دیننج)ی دادوەری لێکۆڵینەوەدا بە بڵاوکردنەوەی درۆ

ناویبردوه، من هەموو شتێکم بۆ باس کرد، بەڵام ئەو باوەڕی نەکرد و گوێی پێ نەدا، هەموو شتێکم پێ گوت کە پێوەندی بە ئەنجوومەنی وەزیرانی بەریتانیا و کۆشکی سپییەوە هەبوو، لە هەمووی زیاتر من ئاگادارم کردەوە لەو هەڕەشە و مەترسی و پیلانەی باسی لەوەدەکرد کە لە چەند مانگی داهاتوودا (جۆن کەنەدی) لە شاری دالاس تیرۆر دەکرێت.

بەڵام تەقینەوەی بۆمبی ئابڕووچوونەکەی (کریستین کیلەر) چەند مانگێکی کەم، کەوتە پێش تیرۆرکردنی (جۆن کەنەدی) ییەوە، بەو مانایەی دەزگا هەواڵگرییەکانی (ئەمریکا و بەریتانیا و سۆڤیەت) بە تەواوی ئاگایان لە پیلان و هەوڵی تیرۆرکردنەکەی (جۆن کەنەدی) هەبوە!.

بەڵام لێردا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، کێ سەرچاوەی زانیارییەکانی (کریست کیلەر) بوە؟ بە مانایەکی تر، کێ باسی ئەو زانیارییانەی کردوە و کێش زانیارییەکانی کۆ کردۆتەوە؟

(ئیڤانۆڤ)ی سیخوڕی نهێنی سۆڤیەت و پاشکۆی ئاشکرای سەربازی باڵیۆزخانەی یەکێتی سۆڤیەت لە بەریتانیا، لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (سیخوڕە ڕووتەکە)، باسی لە ڕۆڵی خۆی کردوە لەو ئابڕووچوونە سیخوڕییەی بوە هۆی ڕووخاندنی حکوومەتەکەی ماکمیلان و زیانێکی زۆری بە ئاسایشی نەتەوەیی بەریتانیا گەیاند، ددانیشی نا بەوەی ناسینی (کۆڵین کۆت)ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (دەیلی تەلەگراف) لەو ئاهەنگەی لە باڵیۆزخانەی یەکێتی سۆڤیەت ڕێکخرا، خاڵی دەستپێکی خۆشییەکانی بوو، چونکە بوە هۆی ناسینی (د.ستیڤن وارد).

(ئیڤانۆڤ) لە ساڵی (1961)دا، (کیلەر و سیتیڤن)ی پێکەوە بینیوە، (کیلەر) کچێکی جوان و بێ ڕەوشتی گوندی بوو، (کیلەر) و (ماندی ڕایف دیفیز)ی پاڵەوانی دوەمی ئابڕووچونە

سێکسییەکەی وەزیری بەرگری بەریتانیا، لە ماڵەکەی (د.ستیڤن وارد) دا دەژیان، تێبینی سەرسامی وەزیری بەرگری بەریتانیاشی کردوە بەرانبەر بە (کیلەر)، (ستیڤن وارد) داوای لە وەزیری بەرگری کرد کە لەگەڵ خۆیدا بیگەیەنێتەوە دوای کۆتایی هاتنی دانیشتن و ئاهەنگەکەیان لە ماڵەکەی (لـۆرد ئەستۆر) هەر لەوێشەوە پێوەندییەکەیان دەستی پێکرد.

(کریستین کیلەر) پێوەندی خۆشەویستی و سێکسی لەگەڵ (پرۆیمۆ)ی وەزیری بەرگری بەریتانیا و (ئیڤانۆف)ی سیخوڕی یەکێتی سۆڤیەتدا هەبوە، (ئیڤانۆڤ) بە بەردەوامی فەرماندەکانی خۆی لە (دەزگای هەواڵگری سوپای یەکێتی سۆڤیەت -GRU) لە هەموو ئـەو گفتوگۆیانە ئـاگادار دەکـردەوە کە لە مـاڵ و باخەکەی (لۆرد ئەستۆر) دا لە نێوان سیاسەتمەداران و وەزیر و پەرلەمانتارانی بەریتانیادا دروست دەبوو، زۆرینەی کاتیش وێنەی نامە و پۆستەکانی (ئەستۆر)ی دەگرت، هەر کاتێکیش کاتی وێنەگرتنی نەبوایە نامە و پۆستەکانی دەدزی، نامە و پۆستەکان هێندە زۆر بوون، کە (ئەستۆر) هەستی بە کەمی و دزین و دەستکاریکردنیان نەدەکرد.

یەکێک لەو نامانە، هی هاوڕێیەکی ئەمریکی (ئەستۆر) بوو، تایبەت بوو بە ئەگەری ڕاگرتنی پرۆگرامی مووشەکی سکای بۆڵت، بە هۆی ئەم بەڵگە و دۆکیۆمێنتانەوە، مۆسکۆ نییەتی واشنتنۆنی زانی لە پاشەکشە کردن لە پرۆگرامە مووشەکییەکان، واتا ساڵێک پێش ئیمزاکردنی ڕێککەوتنەکە.

ئەوەش خاڵی گۆڕانکاریی بنەڕەتی بوو لە پلانی هاوبەشی ئەمریکا و بەریتانیا، هـەروەک هەڵکردنی گڵۆپی سـەوز بوو بۆ پرۆگرامی زیادکردنی مووشەکی بولاریسی ئەمریکی، کە کڵاوەی ئەتۆمییان هەیە و لە بەریتانیا دروست دەکرێت، بۆ توانا جەنگییەکانی ژێر دەریاییەکانی بەریتانیا.

یەکێتی سۆڤیەت ئـەوەی بە دەرفـەت زانـی و ناکۆکی لە نێوان ئەو ئەندامانەی ناتۆدا دروستکرد، کە خاوەنی چەکی ئەتۆمی بوون، وەک پەرچەکردارێکیش فەرەنسا توشی شۆک بوو لەو هەڵسوکەوتە تاک لایەنەیەی ئەمریکا، هەروەها هیچ متمانەیەکیشی بە بەریتانیا نەما، وەک هاوپەیمانێکی ئەورووپی.

(مۆسکۆ) سوربوو لە سەر پەرەسەندنی پێوەندییەکانی نێوان (پرۆفیمۆ) و (کیلەر)دا، پلانیشی هەبوو ئەو پێوەندییە وەک خاڵێکی لاواز لە دژی (پرۆفیمۆ) بە کار بهێنێت بە مەبەستی دەستکەوتن و درکاندنی زانیاریی نهێنی سەربازی و سیاسی، بەڵام بە هۆی ئاشکرابوونی پێوەندییەکە لە لایەن ڕۆژنامەکانەوە، پلانەکەی یەکێتی سۆڤیت شکستی هێنا.

سەرەڕای ئەوەی زۆرینەی بەریتانییەکان لە ئێستادا نایانەوێت هیچ پێوەندییەک لە نێوان (کیلەر)ی (تەنیا و خۆشەویستی پشیلەکان) و (کیلەر)ی (سیخوڕ) بکەن، بەڵام (کیلەر) دەڵێت «بە درێژایی تەمەنم ناتوانم لە ناوەکەم هەڵبێم»، ئەو لە ئێستادا نایەوێت لە سەر ژیانی ڕابردووی هیچ لێدوانێک بۆ ڕۆژنامەکان بدات، بەڵام داهاتوو بە مووڵکی خۆی دەزانێت، ئەوەشی لە کتێبە نوێیەکەیدا بە ناونیشانی (لە ژیاندا مامەوە و لەوەش زیاتر هیچی ترم ناوێت)، خستۆتەڕوو.

دواین شت کە لە سەری نووسرا ئەوەبوو کە (کیلەر) هەوڵی زۆر دەدات بۆ بە دەستهێنانی ناوبانگێکی زۆر، پێشی وایە کە ناسینی خەڵکی زیاتر، دەبێتە مایەی برەوی زیاتری پیشەکەی لە دەرەوەی هاوسەرگیرییەکی شەرعی، بەڵام ئەو ئارەزووەی هەیبوو بۆ ناوبانگ، توشی خیانەتی کرد.

(بیل کلینتۆن) یەکێکە لە کەمترینی سەرۆکە نموونەییەکانی (USA)، وڵاتەکەی گەیاندە قۆناغێکی خۆشگوزەرانی کە پێشتر وێنەی نەبوە، هەوڵیشیدا گەلەکەی و وڵاتەکەی لە تێوەگلان لە هەر جەنگێکەوە  بە دوور بگرێت، بەڵام بە بێ گەشەپێدانی ئابووری وڵاتەکەی.

بەڵام ئارەزووەکانی ئەم سەرۆکە، توشی ناشرینی و بێنرخییەکی گەورەی کرد، کە بوە گەورەترین ئابڕووچوون لە مێژووی (USA)، بە هۆی کەوتنە شوێنی ئارەزوەکانییەوە بیری چۆوە چیەو کێیە، «ئەوکەسەی خاوەنی پێگەیەکی سیاسییە بە تایبەت لە وڵاتانی خۆرئاوا، هەموو شتێک قابیلی لێ خۆشبوونە، تەنها ئابڕووچوونە سێکسییەکان نەبێت، چونکە ئەوەی توشی ئەو نەفرەتەبوو، بۆ ئەبەد لێی بێ بەری نابێت»!.

ئابڕووچونە سێکسییەکان، هەمیشە توشی سەرۆکەکان نابێت، بە هۆی ئەو ترسەی هەیانە لە لێکەوتەکانی، بەڵکوو ئەم جۆرە کێشە و ئابڕووچوونانە ڕووبەڕووی لێپرسراوانی ڕیزی دوەم دەبێتەوە، کە وەزیرەکان و هەندێک جاری کەمیش یاریدەدەرەکانیان، بەڵام ئایا بۆچی (بیل کلینتۆن) تێوەگلا لە پێوەندییەکی ناشەرعی و نایاسایی لەگەڵ ڕاهێنەرێکدا لە خانووی سەرۆکایەتیدا، کە ڕاستەوخۆ وەک سەرۆک کارەکانی لێوە بەڕێوەدەبرد، هەروەها شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی و هاوسەرەکەی و کچەکەشی بوو، تا بوە ئابڕووچوونێکی مەبەستدار و شکستێکی گەورەی سەرۆک، لە کاتێکدا لە ئەرکە وەزیفییەکەیدا وەک سەرۆک، لە لوتکەی سەرکەوتنەکانیدا بوو.

(مۆنیکا سامویل لیۆنسکی)، ژنێکی ئەمریکی بوو، لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، وەک ڕاهێنەرێک لە کۆشکی سپی کاری دەکرد، بە هۆی تێوەگلان و ئاشکرابوونی

له ئابڕووچوونێکی سێکسیدا لەگەڵ (بیل کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)، کە بە (ئابڕووچوونەکەی مۆنیکا) ناسراوە، چاوێکی زۆری میدیا و ناوەندەکانی ڕای گشتی ئەمریکا و جیهانی کەوتەسەر.

(مۆنیکا) لە (23)ی یۆلیۆی ساڵی (1973) لە شاری (سان فرانسیسکۆ) لە دایک بوە، لە ناوچەی (بفرلی هیڵز) لە باشووری کالیفۆرنیا لە خۆرئاوای لۆس ئەنجلس گەورە بوە، باوکیشی، لە سلڤادۆر لە دایک بوە و یەکێکن لەو خانەوادە جووە ئەڵمانیانەی کۆچیان کردوە، دایکیشی جوویەکی ڕووسییە.

(مۆنیکا) لە زانکۆی (سانتا مۆنیکا) خوێندوویەتی و پاشان لە ساڵی (1995)دا چۆتە کۆلێژی (لویس ئاند کلارک) لە (بۆرتلاند) ی ویلایەتی (ئۆریگۆن) خوێندوویەتی، دوای ئەوە ڕوویکردۆتە (واشنتۆن) و لە سەردەمی ویلایەتی یەکەمی سەرۆکایەتی (بیل کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)دا لە کۆشکی سپی کاری کردوە، پێوەندییەکی ناشەرعی ماوەکورت لە نێوان ( مۆنیکا) و ( بیل کلینتۆن)دا دروستبوو، بەڵام وردەکاری ڕووداوەکە و پێوەندییەکە دوای دۆسییەی لێکۆڵینەوە لە (ئابڕووچوونەکەی مۆنیکا) ئاشکراکراو بڵاوبۆوە.

(لیندا تریب)ی هاوڕێی نزیکی (مۆنیکا) کە (24 ساڵ) لە (مۆنیکا) گەورەتر بوو، هەموو پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی نێوان خۆی و (مۆنیکا)ی تۆمار کردوە، کاتێک قسەیان کردوە و وردەکارییەکانی پێوەندییەکەی نێوان (مۆنیکا و کلینتۆن)یان باس کردوە.

ئەو ئابڕووچونە و نهێنییەکانی نێو پێوەندییە تەلەفۆنییە تۆمارکراوەکە ڕاستەوخۆ ئاشکراو بڵاونەکرایەوە، بەڵکوو دوای

ئەوەی (مۆنیکا) شایەتییەکی درۆی لە دۆسییەی (پۆلا جۆنز) داو ڕەتی کردەوە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ (کلینتۆن) هەبێت، (مۆنیکا) هەوڵێکی زۆریدا بۆ ئەوەی (لیندا)ش ڕازی بکات تا لە سەر هەمان دۆسییە شایەتییەکی ساختە بدات، بەڵام (لیندا) هەموو پێوەندییە تۆمارکراوەکانی دایە دەست (کینیس ستار) ی ڕاوێژکاری دەستلەکارکێشاوە و یارمەتیدا تا بەردەوام بێت لە سەر لێکۆڵینەوەکانی لە ئابڕووچونەکەی (وایت واتەر)، بە مەش (کینس ستار) بازنەی لێکۆڵینەوەکانی فراوانترکرد تا (بیل کلینتۆن) و (مۆنیکا لوینسکی) و چەند کەسێکی تریش بگرێتەوە، بە مەبەستی ئاشکراکردنی ڕاستییەکانی دۆسیەی (پۆلا جۆنز).

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو، دەنگۆی دزەپێکردنی زانیارییەکان بوو لە لایەن (لیندا تریب)ەوە بۆ میدیاو ڕۆژنامەکان، بۆ ئەوەی بە وردی چاودێری (جنیفەر فیتز جیراڵد) بکرێت، کاتێک باس لەوە دەکرا پێوەندییەکی سێکسی هەیە لەگەڵ (جۆرج بۆشی باوک)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)، بەڵام بە تەواوی ئەو پروپاگەندانەی ڕەتکردەوە و بە درۆ و هەڵبەستراوی دایە قەڵەم.

(مۆنیکا لوینسکی) ددانی نا بەوەی پێوەندی سێکسی هەبوە لەگەڵ (بیل کلینتۆن) لە نووسینگەی هێلکەیی و بەشەکانی پاشکۆی خۆرئاوای کۆشکی سپی، ئەم ددان پێدانان و لێدوانەی (مۆنیکا) بە ڕەسمی لە لێکۆڵینەوەکانی (ستار)دا تۆمارکرا، کە دواتر بوە هۆی دادگایی کردنی (بێل کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا، بە تۆمەتی دروستکردنی ئاستەنگ بۆ چەسپاندنی دادپەروەریی و شایەتیدانی ساختە و ناڕاست.

پێشتریش (بێل کلینتۆن) تۆمەتبارکرابوو بەوەی چەند پێوەندییەکی تری سێکسی هەبوە، دیارترین و گرینگترینیان

پێوەندی (بێل کلینتۆن) بوو لەگەڵ (جینفەر فلا وەرز)ی گۆرانیبێژ و فەرمانبەری پێشوو لە ویلایەتی (ئەرکانساس)، هەروەها ڕووداوی ژوورەکەی هۆتێل (لیتڵ ڕۆک) لە نێوان (کلینتۆن) و (پۆلا جۆنز)ی فەرمانبەری ویلایەتی (ئەرکەنساس)، ئەو کاتە (بێل کلینتۆن) حاکمی ویلایەتی (ئەرکانساس) بوو، لە کاتێکدا پارێزەرەکانی (پۆلا جۆنز) بە دوای بەڵگە و دۆکیۆمێنتی لاوەکیدا دەگەڕان بۆ ئەوەی ڕاستی قسە و داواکاری بریکارەکەیان بسەلمێنن، بەلام (ئابڕووچوونکەی مۆنیکا)ش ئاشکراو بڵاوبۆوە.

پێویستە ئاماژە بەوەش بکرێت ڕاوێژکارەکانی (بیل کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)، زیاتر لە (100) ڕۆژ لە هەوڵدابوون بۆ ئەوەی (کلینتۆن) لەو کێشەیە دەرباز بکەن کە تێی کەوتوە یان هەر دەرچەیەکی تەنگ یان هەر جۆرێکی تر بدۆزنەوە کە لە دەست ( لێکۆڵەر کینیس ستار)ی سەربەخۆ، ڕزگاریان بکات.

دوای ئەوەش قۆناغی دوەمی کارەکە دەست پێ دەکات، کە کۆنترۆڵکردنی دەرچەکەیە بە هەندێک ڕێکاری هاوبەشی کرداری و میدیایی کاریگەر و ژیرانە، بۆ پاراستنی لانی کەمی ئەو ئاوە کەمەی بە ڕوخساری سەرۆکەوە ماوەتەوە و هێندەی تر شەرمەزار نەبێت و بتوانێت لە سەر پێکانی خۆی لە بەردەم ڕای گشتی وڵاتەکەیدا ڕابوەستێت، ئەگەر تەنها بۆ ئەو ماوەیەش بێت کە لە ویلایەتی سەرۆکایەتییەکەیدا ماوێتی.

ئەو دەرچەیەش، بریتی بوو لەوەی (بێل کلینتۆن) ددان بەوەدا بنێت ئەو پێوەندییە، پێوەندییەکی ناشایستە بوە لەگەڵ (مۆنیکا لوینسکی)دا، لە کۆشکی سپی، کە فەرمانبەرێکی سەرەتایی بوو لە ژێر ڕاهێناندا بوو، ڕاوێژکارەکان ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی

(بیڵ کلینتۆن)ی سەرۆک، تەنها ئەم وەڵامەی هەبێت، جائیتر لە میانەی لێکۆڵینەوەکانی (لێکۆڵەرە سەربەخۆ)کە بێت، یان لە ڕاگەیەندراوە تەلەڤزیۆنییەکەیدا، هەروەها دەبێت هەوڵیش بدات وەک کەسێک دەربکەوێت کە ڕاستگۆیانە قسە دەکات و درۆ ناکات، ئیتر ئاستی باوەڕپێکردن پێی چەندە گران و قورس بێت، دەبێت لە مە زیاتر نەکات.

دانبنان بە درکاندن و گوتنی دەستەواژەیەکی هەمەلایەن (پێوەندییەکی نەشیاو)ە، لەوەوە سەرچاوەی نەگرت کە درۆ بکات، بەڵکوو بەشێک بوو پێچ و دەورە بە دەوری ڕاستییەکدا کە ناتوانێت نکۆڵی لێ بکات، بە تایبەتی دوای پیشاندنی ئەو عەزبییەی کە پێی داوە و جێپەنجە بۆ ماوەییەکەشی پێوەدیاربوو، چونکە درۆیەکی ڕاستگۆیانە دەبێتە هۆی زیادبوونی تۆمەتێکی خراپتر و ناشرینتر لە خودی ئەو تاوانەی کە ئەنجام دراوە، لە هەر دۆخێکدا بێت ئەنجامی کارەکە دوورخستنەوەی (کلینتۆن) دەبێت لە کارەکەی، یاخود ناچارکردنی بەوەی لە سەر ئابڕووچوونێک دەستلەکاربکێشێتەوە، کە خراپتر بوو لە ئابڕووچونەکەی (واتەر گەیت) کە بەرۆکی (ڕیتچار نیکسۆن)ی گرت، بەڵام پێش ئەوەی ددان پێدانانەکەی ببێتە هۆی وروژاندنی ڕای گشتی ناوخۆیی و جیهانی، هەوڵیدا دۆسییەی سزادانەکەی کۆنترۆڵ بکات.

ئەو ئاست و پلانانەی ڕاوێژکارەکانی سەرۆک لە سەری ڕێککەوتن بریتی بوو لە:

ئاستی یەکەم، جەختکردنەوە لە سەر ئەوەی چیرۆکەکەی (مۆنیکا لوینسکی) ئیتر تاوانبارەکەی هەر کەسێک بێت، بابەتێکی زۆر کەسی و تایبەتییە، ئەگەر چیرۆکەکە پێوەندی بە یەک کەسی ترەوە هەبێت لە جیهاندا، ئەوا تەنها هاوسەری سەرۆکە ئابڕووەچووکەیە، مافی لێپرسینەوە و لۆمەکردنی هاوسەرە

سەرۆکەکەی هەیە، بەڵام هیلاری ئەوەی نەکرد، (بەڵکوو هیلاری کلینتۆن ڕەفتارێکی پێچەوانەی کرد و لەگەڵ هاوسەرەکەی و کچەکەیاندا گەشتێکی پشوودانیان ئەنجام دا و کارێکی کرد ببێتە جێی بایەخ پێدانی وێنەگرانی ڕۆژنامەکان و بابەتی سەرەکی هەواڵ لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکاندا)، ئەوا بۆ هیچ کەسێکی تر نییە دەستوەربداتە ناو ئەو بابەتە، یاخود بیەوێت (لە هیلاری، هیلاری تر بێت)، بۆیە هەر کەسێک دەیەوێتماڵێک خاپوور بکات و خێزانێک هەڵبوەشێنێتەوە، باشتر وایە شوێنەکەی خۆی چاک بکات و لە وێرانبوون بیپارێزێت.

ئاراستەی دوەم خستنەڕووی بەڵگەیەکی کرداری و ئاسانە، بەوەی ئەم ڕەوشتە تایبەتییەی سەرۆکی ئەمریکا، هەر چەندە عەیب و نەشیاو بێت، بەڵام بە هیچ شێوەیەک کارناکاتە سەر ئەو ئەرکەی هەڵبژێردراوە لە پێناوی دا، کە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە، بە باشترین شێوە و ئیرادەی بەهێزەوە، کە زۆر جار پابەند نابێت بە خوو و نەریت و ڕێکارە نێودەوڵەتییەکان و بەڵێنامەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانیش.

لە ڕاستیشدا بیل کلینتۆن ئەم کارەی کرد، کاتێک مۆڵەتی پشوودانەکەی هەڵوەشاندەوە و فەرمانیدا بەهێزە چەکدارەکانی ئەمریکا، بۆ ئەوەی بۆردوومانێکی چڕی چەند سەربازگەیەکی ئەڤغانستان و کارگەیەکی دروستکردنی دەرمان لە سوودان بکەن، بۆ نمایشکردنی هێز و تواناکانی وەک (گاوان) کاوبۆیەکی ڕەسەن، بەوەی سەرەڕای ئەو فشار و گێژاوە میدیاییەی لە سەریەتی، سوورە لە سەر تۆڵەکردنەوە لەو کەسانەی ئەمریکییەکانیان بێزارکردوە و ڕووبەڕووی مەترسی بوونەتەوە، بە هۆی تەقینەوەکانی (نایرۆبی) و (دارلسەلام)ەوە.

لە هەمان کاتدا دەرفەتی کارکردن بە ئاڕاستەی سێیەم هاتە ئاراوە، کە کورتییەکەی ئەوەبوو ئەوە لە ئەمریکییەکان بگەیەندرێت، (سەرکێشییە سێکسییەکانی کلینتۆن) پێشێلکردنی دابونەریتەکانی ئەمریکا نییە، بەڵکوو ڕەفتار و کارێکی ئاسایی چەند بارەیە لە لایەن هەندێک لە سەرۆکەکانی پێشووتری ئەمریکاوە.

لە میانەی دادگاییکردنەکە و دواتریش لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا لە کۆشکی سپی (بیل کلینتۆن) ڕەتی کردەوە پێوەندییەکی تەواوەتی لەگەڵ (مۆنیکا)دا هەبێت، بەڵام بە هۆی زیادبوونی فشارەکانی (ستار)ەوە و دوای دەستکەوتنی (عەزییە شینەکەی مۆنیکا) کە ئاوی شەهوەتەکەی (کلینتۆن)ی پێوەبوو، لە (17)ی ئۆگەستی ساڵی (1988)دا، (بیل کلینتۆن) ددانی نا بەوەی درۆی لەگەڵ گەلی ئەمریکا کردوە و پێوەندییەکی ناشەرعی لەگەڵ (مۆنیکا لوینسکی)دا هەبوە، بەڵام ڕەتی کردەوە پێوەندییەکی تەواو بێت.

(هیلاری کلینتۆن)یش لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا کە بە ناونیشانی (ئەو مێژووەی تێیدا ژیام) بڵاویکردەوە، باسی لەوە کردوە (بیل کلینتۆن)ی هاوسەری ، بۆ ماوەی (7) مانگ ڕاستییەکانی لە بارەی پێوەندییەکەی لەگەڵ (مۆنیکا لوینسکی) لێ شاردۆتەوە، لە کاتێکدا لەو ساڵەدا واتا ساڵی (1988) چیرۆکی ئابڕووچوونەکە ببوە مانشێتی سەرەکی ڕۆژنامە و میدیاکان.

لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا، (هیلاری کلینتۆن) دەڵێت کە (بیل کلینتۆن) ئەوەی بۆ تەئکیدکردۆتەوە کە «بە ڕاستی سەرسام بوە بە (مۆنیکا)، ئەو کچە لاوەی لە کالیفۆرنیاوە هاتبوو و داوای هاوکاری لێ دەکرد بۆ دۆزینەوەی کار»، هەروەها گوتوشیەتی «چەند جارێکیش قسەمان کردوە»، بەڵام «سووریشبوە لە سەر

ئەوەی ئەو بابەتە بە شێوەیەکی زۆر خراپ گەورە کراوە»، هیلاری نووسیویشێتی «بڕیارمدا باوەڕ بە قسەکانی بیل بکەم».

سیناتۆر (هیلاری کلینتۆن)ی هاوسەری (بیل کلینتۆن)، لە بەشێکی تری کتێبەکەیدا باسی لەوەکردوە کە هاوینی دواتر ڕاستی بابەتەکەی زانیوە، واتا دوو ڕۆژ پێش ئەوەی هاوسەرەکەی لە بەردەم دەستەی ئاڕاستەکردنی تۆمەتەکاندا و لە سەر داوای (کینیس ستار)ی داواکاری گشتیدا سووێند بخوات و شایەتی بدات.

(هیلاری) باسی لەوەشکردوە هاوسەرەکەی لە بەرەبەیانی ڕۆژی (15)ی ئۆگەست هەڵیساندوە لە خەو و پێی گوتوە، «بۆ یەکەم جارە هەست دەکەم دۆخەکە لەوەمەترسیدارترە کە دەمزانی»، هەروەها گوتوشیەتی «دەزانم پێویستە لە سەرم شایەتی بدەم بەوەی من پێوەندییەکم هەبوە، بەڵام لە جێگەکەی تۆدا نا، بەڵام ئەوەی لە نێوانماندا ڕوویدا شتێکی زۆر خێراو دیاریکراو بوە».

(هیلاری) دەڵێت لەو کاتەدا «بە ئاستەم توانای هەناسەدانم هەبوو، دەستمکرد بە گریان و تووڕەبوون، دەتەوێت چیت پێ بڵێم؟ بۆچی درۆت لەگەڵ کردم؟ تا دەهات من زیاتر تووڕە دەبووم و هاوارم بە سەردا دەکرد، بەلام (بیل کلینتۆن) لە بەردەممدا وەستابوو تەنها دەیگوت، داوای لێبووردن دەکەم، زۆر داوای لێبووردن دەکەم، من تەنها دەمویست تۆ و تشیلسی کچمان بپارێزم».

هیلاری باسی لەوەشکردوە لەو کاتەدا دەیویست سەری بتەقێت، هەروەها قورسترین دوو بڕیاری ژیانی بریتی بوە لەوەی (وەک هاوسەری بیل کلینتۆن بمێنمەوە) و (خۆم کاندید بکەم بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی پیران لە سەر ویلایەتی نیویۆرک).

یەک ملیۆن دانە لە کتێبی بیرەوەرییەکانی هیلاری چاپ و بڵاوکرایەوە، کە باسی لە چیرۆکەکانی ئەو هەشت ساڵەی ژیانی کردوە کە لە کۆشکی سپی بە سەری بردوە، پێش چاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی، (هیلاری) (هەشت ملیۆن دۆلار) ی وەک پێشەکی وەرگرتوە، بە هۆی ئاشکراکردنی نهێنی پێوەندییەکانیەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی دوای ئاشکرابوونی ئابڕووچوونەکەی مۆنیکا، کتێبەکە لە(16) دەوڵەتی ئەورووپا و ئاسیا و ئەمریکای باشوور، مافی بڵاوکردنەوەکەی فرۆشراو لە ماوەیەکی کەمدا و بە تیراژێکی زۆر بڵاوبۆوە.

لە هەمان کتێبدا (هیلاری) دەڵێت «بە ڕێگاوەبووین بگەڕێینەوە بۆ واشنتۆن، بۆ جەنگێکی تری سیاسی کە هیچ کات کۆتایی نایەت، تا ئەو کاتە بڕیارم نەدابوو لەوەی لە پێناوی هاوسەرەکەم و هاوسەرگیرییەکەمدا بجەنگم، دوای ئەوەی پێوەندییەکان جۆرێک لە کرانەوە و ئاسایی بوونەوەیان پێوەدیاربوو، لە نێو خێزانەکەمدا، لەگەڵ ئەوەشدا کە من هەستم بە حەسرەت و نائومێدی دەکرد بەرانبەر بە (بیل)، چەندین سەعات بە تەنها دەمامەوە و بیرم دەکردەوە، بە خۆمم گوت کە خۆشم دەوێت، دەتوانین یەکتر لە بیر بکەین، یان بەردەوامیی بە هاوسەرگیرییەکەمان بدەین؟ پێشبینیکردنی ژیانی ڕۆژانە ئاسانترە لەوەی پێشبینی داهاتوو بکەیت».

بەڵام من یەکلابوومەوە لەوەی لە پێناوی سەرۆکەکەمدا بجەنگم، پێویستە دەستبەرداری هەستوسۆزەکەم ببم و تەرکیزم بخەمە سەر ئەو شتەی پێویستە بۆخۆم و بۆ دەروونی خۆمی بکەم، پەنام بردە بەر ئەنجام دانی ئەرکە تایبەتی و گشتییەکانم کە لە گەنجینەیەکی پڕ لە هەستی دژبەیەکدا گەمارۆدرابوون و

پێویستیان بە بیرکردنەوە و هەڵسەنگاندنی زۆر جیاواز هەیە. ئێستا و دوای تێ پەڕبوونی زیاتر لە (20)ساڵ، هاوسەرەکەم و هاوڕێ نایابەکەم و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشییەکانم و باوکێکی خۆشەویستی کچەکەمان، لەبەر چەند هۆکارێک کە دەبێت ئەو باسی بکات، متمانە و برینە قووڵەکانی من، کۆمەڵێک بیانوویان دایە دەست نەیارەکانی هاوسەرەکەم، بەوەی بە ئارەزووی خۆیان بە کاری بهێنن، چەندین ساڵ توانی بەرگەی تۆمەتە ڕاست و بێ بنەماکان و لێکۆڵینەوە حیزبییەکان و داواکاری و سکاڵاکانی دادگا بگرێت. هەستوسۆزە تایبەتییەکانم و بیروباوەڕە سیاسییەکانم هەمیشە پێکیاندا دەدا، وەک هاوسەرێک دەمویست دەستبخەمە بینی و بیخنکێنم، بەڵام (بێل) بە تەنها هاوسەرم نەبوو، بەڵکوو سەرۆکیشم بوو، سەرەڕای ئەوەی کردی، بەڵام پێم وابوو توانی سەرکردایەتی ئەمریکا و جیهانیش بکات، بە شێوەیەک تا ئێستاش من پشتیوانی دەکەم، هیچ کەسێک شایستەی ئەو مامەڵە و هەڵسوکەوتە خراپە نییە کە بەرانبەری کرا، بە شێوەیەکی زۆر خراپ و بێ مانا، پێشێلی تایبەتمەندییەکانی هاوسەرەکەم و مۆنیکا و خێزانەکەشمان کرا، لەو بڕوایەدەم ئەوەی هاوسەرەکەم کردی لە ڕووی ڕەوشتەوە کارێکی هەڵەیە، لەگەڵ ئەو درۆیانەی لەگەڵ من و گەلی ئەمریکا کردی و ویستی بمانخەڵەتێنێت، بەڵام دەشزانم ئەو کارەی ئەو خیانەت نییە بەرانبەر بە وڵاتەکەی.

هەموو ئەو شتانەی لە لێکۆڵینەوەکانی (واتەر گەیت)ەوە فێر بووم، ئەو باوەڕەیان لا دروست کردم کە هیچ بیانوویەک نییە بۆ تۆمەتبارکردنی (بێل)، بۆیە ئەگەر پێشێلکردنی دەستوور و خراپ بە کار هێنانی دەسەلات لە لایەن (کینیس ستار) و هاوپەیمانەکانییەوە لەبەر چەند هۆکارێکی ئایدۆلۆژی و ڕقەبەرایەتی ببێتە هۆی لە سەر کار لابردنی سەرۆک، بەڵام

من لە نیشتمانەکەم دەترسام، سەرۆکایەییەکەی (بێل) و دامەزراوەی سەرۆکایەتی و پاراستنی دەستوور لە بەردەم سەنگی مەحەکدابوو، دەمزانی ئەوەی لە ڕۆژان و هەفتەکانی داهاتوودا دەیانڵێم و ئەنجامیان دەدەم، بە تەنها کاریگەرییان لە سەر چارەنووسی من و (بێل) نابێت بە تەنیا، بەڵکوو کاریگەری لە سەر چارەنووس و داهاتووی ئەمریکاش دەبێت. ئەوەشی پێوەندی بە ژیانی هاوسەرێتیمەوە هەبوو، بە هەمان شێوە کەوتبوە بەردەم کێشانە و یەکلابوونەوەوە، بە ڕاستی نەمدەزانی کەم لایەیان دەیباتەوە یان پێویستە بیباتەوە».

لە ئێستادا دەتوانرێت زۆر بە ئاسانی وەڵامی هەموو پرسیار و گومانەکانی (هیلای کلینتۆن) بدرێتەوە، لە کاتێکدا ئەم وەڵامانە بە تەنها وەڵامی پرسیارەکانی (هیلاری کلینتۆن) نین، بەڵکوو پرسیاری زۆرینەیەکە لە سەر ئاستی جیهان، بە تایبەتی کە ئابڕووچوونەکەی هاوسەرەکەی و (مۆنیکا لوینسکی) گەیشتە لوتکە، لە هەمان کاتدا هەندێک پرسیاری تر دێنە بەرگوێ، لە بارەی جۆر و ئاستی پێوەندییەکانی نێوان (هیلاری) و (بێل)ی هاوسەری لەو کاتەدا کە سیمبولی یەکەم بوو لە (USA).

ئەگەر بێینەوە سەر باسی (مۆنیکا لوینسکی)، ئەوا لە هەر کوێیەک بگەڕێی باسێکی پەیوەست بەو بابەتە دەدۆزیتەوە، سەرەڕای ئەوەی چەند ساڵێکە (بێل کلینتۆن) لە کۆشکی سپی نەماوە، بەڵام تا ئێستا (مۆنیکا) جێی بایەخ و سەرنج دانە، کامێراکان وێنەی هەر شتێک بڵاودەکەنەوە کە پێوەندییان بە ژیانی ئەوەوە هەبێت، ئیتر ئەو شتە بچووک بێت یان گەورەبێت.

دوای ئاشکرابوونی پێوەندییە ئابڕووچوونەکەی لەگەڵ (بێل کلینتۆن)ی سەرۆکی (USA)، (مۆنیکا) چوە لەندەن و لە زانکۆیەکی ئەو شارە بڕوانامەی ماستەری بە دەستهێنا.

دوای ئەوەی (مۆنیکا لوینسکی) ناوی چوە مێژووەوە بە هۆی ئابڕووچوونی و ئاشکرابوونی وردەکاری ئابڕووچونەکەی لە کتێبخانە سەرۆکایەتییەکەی (کلینتۆن)دا، هاوشێوەی ئابڕووچوونی سەرۆکەکانی تری ئەمریکا وک ئابڕووچوونەکەی واتەر گەیت، جارێکی تر ناوی (مۆنیکا) هاتەوە بەر باس و بە دیوێکی تردا مێژوو ناوەکەی تۆمارکردەوە.

لە ساڵی (2008) دا، (تچیلسی)ی کچی (بیڵ کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)و (هیلاری کلینتۆن)ی کاندیدی دیموکراتەکان بۆ هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا، بەشداری کەمپەینی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەی دایکی دەکرد و لە زانکۆکەکاندا سیمیناری سازدەکرد و دەنگی بۆ دایکی کۆدەکردەوە، لە یەکێک لە سیمینارەکانیدا (تچێلسی) ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکی بێزارکەر بۆوە، کە بۆیەکەم جاربوو ئاڕاستەی بکرێت.

لە میانەی بەشداریکردنیدا لە هەڵمەتێکی بانگشەی دایکیدا لە زانکۆی (بتلەر) لە ویلایەتی (ئیندیانا)، یەکێک لە ئامادەبوانی هەڵمەتەکە پرسیارێکی لە بارەی (مۆنیکا لوینسکی) ڕاهێنەری پێشووی کۆشکی سپی ئاڕاستەی (تچێلسی) تەمەن (28) ساڵ کرد، بەوەی چی دەبێت ئەگەر ئەو ئابڕووچونە زیان بە پێگە و ناوبانگ و کەسایەتی دایکی بگەیەنێت؟ (تچێلسی) بەم پرسیارە چاوەڕوان نەکراوە توشی سەرسوڕمان بوو، لە وەڵامدا گوتی «واو، لە ڕاستیدا تۆ یەکەم کەسیت، لە ناو (70) زانکۆدا کە سەردانم کردوون پرسیارێکی لەو جۆرەم لێ بکات، هەر چەندە زۆر دڵنیا نیم، بەڵام دەزانم کە ئەوە پێوەندی بە تۆوە نییە»، ڕاستەوخۆ و دوای وەڵامەکە، ئامادەبوان بە دەنگی بەرز کەوتنە هەلهەلەو فیکە لێدان .

ڕێکخەرانی ئەو سیمینار و کەمپینە، وایاندانابوو ئەو پرسیارە دواین پرسیار بێت، بەڵام (تچێلسی کلینتۆن) بڕیاریدا چەند پرسیارێکی تریش وەڵام بداتەوە و گوتی «باوار ناکەم کە ئەمە دواین پرسیار بێت».

هەر چەندە هەر لە منداڵییەوە کەوتبوە ژێر کاریگەرییەکانی ژیانی گشتی و ناوبانگەوە، بەڵام (تچێلسی) بێزارییەکی زۆری هەبوو، لەوەی بە هۆی ئەو ڕۆڵە گرینگ و بەرچاوەی لە هەڵمەتەکانی بانگشەی دایکیدا هەیبوو، دووبارە کەوتبۆوە بەر زوومی کامێراکان و ڕووماڵی میدیاکان.

هەروەها جارێکی تر دۆسیەی (مۆنیکا لوینسکی)، بۆوە بە مانشێت و سەردێڕی هەواڵەکان، ئەمەش بە هۆی بڵاوبوونەوە و ئاشکرابوونی ئەو خشتە زەمەنییەی (مۆنیکا و کلینتۆن) پێوەندی سێکسییان تێیدا هەبوە و لانی کەم (7) جاریان (هیلاری کلینتۆن)یش لە ناو (کۆشکی سپی) دا بوە و نەچۆتە دەرەوەی بیناکە.

دوای ئەوەی (مۆنیکا لوینسکی) هەوڵیدا (بیل کلینتۆن)ی سەرۆکی پێشووتری (USA) لە پۆستەکەی دوور بخاتەوە، لە ساڵی (2007) و کاتێک کە (جۆرج بۆش)ی کوڕ، لە دوا ساڵەکانی سەرۆکایەتییەکەیدا بوو، (مۆنیکا) دەیویست جارێکی تر کارێکی لە (کۆشکی سپی) دەست بکەوێت، ئەمەش دوای ئەوەی (بڕوانامەی دبلۆمی لە ئابووریدا) لە (لەندەن سکوڵ ئۆ ئیکۆنۆمیکس) بە دەستهێنا، کە یەکێکە لە گرینگترین کۆلێژەکانی بەریتانیا، بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەی (لۆفیگارۆ)ی فەرەنسی، بریکارێکی (مۆنیکا)ی تەمەن (32) ساڵ بە جدی لە هەوڵدا بوە بۆ ئەوەی لە کۆشکی سپی ئەو کارەی دەست بکەوێت.

قسەکردن لە سەر ئارەزووە سێکسییەکانی (جۆن کەنەدی) یەکێک لە بە ناوبانگترین سەرۆکەکانی (USA) بە شێوەیەکی بەرچاو درێژە دەکێشێت، تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی مرۆڤ یەقینی هەبێت لە سەر ئەوەی ئەو سەرۆکە هەمیشە شوێنکەوتەی ژنان بوە و تا ڕادەی ئالودەبوون، پەیوەست بوە بە پێوەندییە سێکسییەکانی لەگەڵ ژناندا، ئەو کەسانەی ژیاننامەی (کەنەدی) یان نوسیوەتەوە باس لەوە دەکەن زۆرینەی ڕۆژەکانی ساڵ، (جۆن کەندی) لە ژووره تایبەتەکەی خۆی کە پاشکۆی ژووره هێلکەییەکەی کۆشکی سپی بوو لە یەک کاتدا میوانداری ژنێک یان چەند ژنێکی کردوە، کە مەرجی سەرەکی میوانداریکردنەکەش (قژی زەردبوو)، ئیتر هیچ شتێکی تر دوای ئەوە بە لای (کەنەدی) یەوە گرینگ نەبوو، تەنانەت ئەگەر ژنەکە، یەکێک بوایە لە ژنە لەشفرۆش و لادەرەکانی یانەکانی شەوانە، یان یەکێکیش بوایە کە ئەمریکییەکیان بە (ژنانی تەلەفۆن) ناویان دەبەن.

ڕۆژنامەنووسێکی ئەمریکی لە ڕاپۆرتێکیدا تەئکیدیکردۆتەوە لەوەی ژمارەی خۆشەویست و پێوەندییە سێکسییەکانی (جۆن کەنەدی) ژمارەیان گەیشتۆتە زیاتر لە هەزاروپێنج سەد ژن، کە لە نێو ئەو ژمارەیەدا ئەستێرەی سینەمایی و نمایشکاری جلوبەرگیش هەبوە، هەر وەک پێوەندییەکەی نێوان (جۆن کەندی) و (مارلین مۆنرۆ)ی ئەستێرەی وروژێنەر و سینەمای ئەمریکیشدا ئاشکرابوو، هەر چەندە (جۆن کەنەدی) بە تەنها پێوەندی لەگەڵ (مارلین مۆنرۆ)دا نەبوە، بەڵکوو لەگەڵ ژمارەیەک ژنی ناسراوی تردا هەبوە، لە دیارترینیان « هونەرمەند (ئێنجی دیکنسۆن)، ڕۆژنامەنووسی دانیمارکی قژزەرد (ئیڤا ئارفاد)، سەماکار (ئیستریتیز بلازی ستار)، نمایشکاری جلوبەرگ

(جودیس ئێکسز کامبیل)، سکرتێرەی کۆشکی سپی (بربسیلا فایەر)، سکرتێرەی کۆشکی سپی (جیل کوان) و هتد».

ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو لەشفرۆشەی تر کە (کەنەدی) پێوەندی هەبوە لەگەڵیان، هەروەها لە نێو دەیان خۆشەویست و پێوەندی سێکسی (کەنەدی)دا، مەترسیدارترین پێوەندی سێکسی (کەنەدی) کە تا ئێستا باسی دەکرێت، پێوەندییە سێکسییەکەی (جۆن کەنەدی) و (ڕۆبەرت کەنەدی) برای بوو لەگەڵ (مارلین مۆنرۆ)دا، لەبەر چەند هۆکارێک، یەکەمیان لەبەر ئەوەی (مارلین مۆنرۆ) لە یەک کاتدا پێوەندی سێکسی لەگەڵ (جۆن کەنەدی) و براکەیدا هەبوە، دوەمیشیان هەر دوو براکە پێوەندییان بە ڕووداوی کوشتنەکەی (مارلین مۆنرۆ)وە هەبوە، سەرەڕای ئەوەی لە ئێستادا کەسیان لە ژیاندا نەماون، بەڵام هێشتا تۆمەتبار دەکرێن بە داڕشتنی پیلانی کوشتنی (مۆنرۆ) و داڕشتنی سیناریۆیەک، کە (مۆنرۆ) خۆی کوشتبێت.

لە ڕووی بابەتی پێوەندی لەگەڵ ژناندا، (جۆن کەنەدی) هەستی بە شەرمەزاری نەکردوە، لە ڕاستیشدا (جۆن کەنەدی) سەرۆکێکی ئاسایی نەبوو، (کەنەدی) ئەفسانەیەک بوو لە ویژدانی ئەمریکییەکاندا و وەک یەکێک لە پاڵەوانە گریکەکان سەیر دەکرێت، (کەنەدی) لای ئەمریکییەکان ئەو سەرۆکە لاوە بوو، کە لە قەیرانی مووشەکی کوبادا، لووتی یەکێتی سۆڤیەتی شکاند و لە جەنگی سارددا یەکەمین سەرکەوتنی گەورەی بۆ (USA) تۆمار کرد.

لە کاتێکدا، (جۆن کەنەدی) سەرکردایەتی قۆناغێکی هەستیار و یەکلاییکەرەوەی قەیرانی مووشەکەکانی دەکرد، بەڵام ئەو قەیرانە ڕێگر نەبوو لەوەی (کەنەدی) گەرموگوڕترین ساتەکانی

پێوەندییەکەی لەگەڵ (مارلین مۆنرۆ)ی ئەستێرەی سینەمایی ئەمریکا بە سەر بەرێت.

(تۆماس ڕیفەز)ی نووسەری ئەمریکا، باس لەوە دەکات مێژووی پێوەندییەکانی نێوان (جۆن کەنەدی) و ئەستێرە بە ناوبانگەکانی بواری ورژاندن لە مێژووی سینەمای (هۆلیود)دا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1945)، واتا چەند ساڵێک پێش ئەوەی ببێتە سەرۆکی (USA)، کاتێک بە هۆی برینداربوونییەوە لە جەنگدا لە نەخۆشخانەیەکی نیویۆرک بە مەبەستی چارەسەرکردن خەوێندرابوو، چەند وێنە و لەزگەیەکی (مارلین مۆنرۆ) بە چەند شێوەیەکی جیاواز بە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە هەڵواسرابوو، لە هەر چوار وێنەکەدا (مارلین مۆنرۆ) نیمچە ڕووتبوو، لە یەکێک لە وێنەکاندا لە سەر پشت پاڵکەوتوە و هەر دوو قاچی بۆ ئاسمان بەرزکردۆتەوە بە شێوەی ژمارە (حەوت) بە پیتی عەرەبی.

(تۆماس ڕیفەز) لە زاری یەکێک لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانی (کەنەدی)ییەوە، کە لەوکاتەدا سەردانی نەخۆشخانەی کردوە، باسی لەوەکردوە (کەنەدی) چۆن بە سەرنجەوە سەیری ئەو وێنانەی (مارلین مۆنرۆ)ی کردوە و بەجۆرێک لە نەشئەوە گوتویەتی تا چاوەکانم توانایان هەبێت چێژ لەو وێنانە وەربگرن، لەم نەخۆشخانەیە هەست بە بێزاری و بێ تاقەتی ناکەم، لەوکاتەدا ئەو هاوڕێیەی بە (کەنەدی) گوتوە (فرانک سیناترا) ی هاوڕێیان دەتوانێت هەر کات ویستی بانگهێشتی بکات و دیدارێکی بۆ ساز بکات.

دوا دیدار و یەکتر بینینەکانیان زیادی کرد و زۆرینەشی لە خانوە گوندییەکەی (جۆن کەنەدی) بوو لە ناوچەی (جۆرج تاون)، ئەو پێوەندییەش درێژەی کێشا و بەردەوام بوو تا سەرەتاکانی

هەڵمەتی بانگەشەی سەرۆکایەتی ئەمریکا لە ساڵی (1960)دا کە بە سەرکەوتنی (جۆن کەنەدی) کۆتایی هات، وادەردەکەوێت ئەو گەنجەی بوە سەرۆکی ئەمریکا، ئیتر بێزاربووبێت لەو (قژ زەردەی هۆلیۆد)، بۆیە گۆڕانکارییەکی لە پێوەندییەکەیدا کرد و یەکێکی تری خستە شوێنەکەی، ئەوەش هەر لە ڕێگە و نێوەندگیری (فرانک سیناترا)وە.

لە لایەکی ترەوە (پیتەر لوفۆرد)ی هاوڕێی نزیکی (جۆن کەنەدی) لە بیرەوەرییەکانیدا باسی لەوەکردوە، پێوەندییە نوێیەکەی (کەنەدی) لە میانەی ئاهەنگی شەوێکی سووردا لە (لاس فیگاس) دەستی پێکرد، (کەنەدی و سیناترا) لە سەر یەکێک لە مێزەکانی ئەو هۆتێلە دانیشتبوون، (جودیت کامبڵ)ی شۆخ و شەنگ بە هاوڕێیەتی پیاوێکی نامۆ بە بەردەمیاندا ڕۆیشتن و (سیناترا) بانگهێشتنی سەرمێزەکەی کردن تا پێکەوە دابنیشن و بخۆن و بخۆنەوە، دواتر دەرکەوت ئەو پیاوە نامۆیە (سام جیانکا)ی سەرکردەی گروپی مافیاکانە، کە لە ناو گروپەکانی مافیا و تاوانە ڕێکخراوەکاندا بە (سام فلود) ناسراوە.

چەند ڕۆژێک دوای ئەوە، (جۆدیت کامبڵ) لە خانوەکەی (جۆرج تاون) سەردانی (جۆن کەنەدی) کرد، لەو کاتەشدا (جاکلین) ڕۆژەکانی دواین دووگیانی لە فلۆریدا بە ڕێ دەکرد، پێوەندییەکەیان بەردەوام بوو، ئەو کەسانەی ئاگایان لە ژیانی سەرۆکەکەی ئەمریکا هەیە باس لەوە دەکەن بوونی هەر یەک لە (مارلین مۆنرۆ) و (جۆدیت کامبڵ) ڕێگر نەبوە لەوەی (جۆن کەنەدی) چەند پێوەندییەکی تری خۆشەویستی و سێکسی لەگەڵ چەند ژن و کچێکی تردا هەبێت.

بۆ نموونە یەکێکی تر لەو ژنانەی پێوەندییان لەگەڵ (کەنەدی) هەبوو، قژ زەردێکی تر بوو بە ناوی (جانێت زی ڕۆزیین) کە لە لایەن کەسە نزیکەکانییەوە بە (کچی ڕۆژانی هەینی) ناودەبرا، چونکە سەرەڕای سەرقاڵییە ڕۆمانسی و سەرۆکایەتییەکانی، بەلام (کەنەدی) سووربوو لە سەر ئەوەی هەموو ڕۆژانێکی هەینی (جانێت) ببینێت، تەنانەت ئەگەر لە ڕۆژی هەینیدا (کەنەدی) گەشتێکی هەبوایە، ئەوا (جانێت)ی بە فڕۆکە لەگەڵ خۆیدا دەبرد.

لە ساڵی (1962)دا (مارلین مۆنرۆ) چوە نیویۆرک بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی لە دایک بوونی (جۆن کەنەدی) دا، بەلام ئەو کارە لە لایەن (کۆمپانیای فۆکس) و (جاکلین) ی هاوسەری (کەنەدی)ییەوە جێی خۆشحاڵی نەبوو، تەنانەت (جاکلین) هەم بانگهێشتەکەی هەڵوەشاندەوە، هەم ڕێگریش بوو لەوەی (مارلین مۆنرۆ) بەشداری ئاهەنگەکە بکات،

هەندێک لە سەرچاوەکان، چەند ڕێکەوت و بەروارێکییان بە دوای یەکدا تۆمارکردوە، کە پێوەندییان بە سەرەتا و کۆتایی هونەرمەندەکەی نیویۆرکەوە هەیە.

لە (1)ی یۆنیۆ، یادی (36) ساڵەی لە دایک بوونی بوو، دوایین دەرکەوتنی ڕەسمی و ئاشکرای (مارلین مۆنرۆ) بوو لەو ئاهەنگەی لە سەر شەرەفی ئەو ڕێکخرابوو.

لە (7)ی یۆنیۆ، دوای کۆتایی هاتنی گفتوگۆ و دانووستانەکانی لەگەڵ کۆمپانیای (فۆکس)، وادەی ڕۆژی یەکەمی وێنەگرتنی فیلمە نوێیەکەی گەیشتە (مارلین مۆنرۆ).

لە (20)ی یۆنیۆ، (مارلین مۆنرۆ) هەڵمەتێکی بانگشەی گەورەی دەستپێکرد، کە پێویستی بە گرتنی چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی هەبوو، هەروەها چەند دیدار و چاوپێکەوتنێکیشی لەگەڵ گرینگترین ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ئەنجام داو ڕاشیگەیاند

له (8)ی ئۆگەستی داهاتوودا جارێکی تر هاوسەرگیری لەگەڵ (دیماجیۆ)دا دەکاتەوە.

هەروەها (مارلین مۆنرۆ) بەشداری لە چەند نمایش و گفتوگۆیەکی فیلمەکانیدا کرد، دواین هەفتەی ژیانی پڕبوو لە دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ پزیشکەکانیدا، کە چاودێری و سەرپەرشتی باری تەندروتسییان دەکرد و چارەسەریان دەکرد.

رۆژی هەینی (3)ی ئۆگەست، (مارلین مۆنرۆ)، پێوەندییەکی زۆری تەلەفۆنی پێ گەیشت، کە هەندێکیان پێوەندی تایبەتی بوون و هەندێکیشیان لە سەر ئیشوکار بوون، هەروەها پێوەندیشیکرد بە (چارەسەرکارە دەرونییەکەی) و (بات نیوکۆمب)ی هاوڕێشییەوە.

ڕۆژی دواتریش ڕووداو و کارەکان بە هەمان شێوەبوون، پێوەندی تەلەفۆنی، کارکردنی ناوباخچەکە، سەردان و بینینی پزیشک، پیاسەیەکی سەر دەریا لەگەڵ (پیتەر لاوفۆرد)ی زڕبرای (کەنەدی)دا. هەموو ئەو کەسانەی کە (مارلین مۆنرۆ) یان دەبینی، بە باشی دەیانزانی لە ژێر کاریگەری بە کار هێنانی دەرمانی هێورکەرەوەدایە.

سەعات (حەوت و 45 دەقیقە) لەگەڵ (لاوفۆرد) قسەی کرد زۆر تێکشکاو و خراپ بوو، دواتر (لاوفۆرد) چەند جارێک پێوەندی پێوەکردۆتەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک وەڵامی نەداوەتەوە، بۆیە هەوڵیداوە پێوەندی بە کەسە نزیکەکانییەوە بکات، بۆ ئەوەی بە پەلە بگەنە لای (مارلین مۆنرۆ) و لەو کاتەداو بەو بارە خراپەیەوە بە تەنها بە جێی نەهێڵن.

(خاتوو موورای) کە لە سەر بڕیاری (دکتۆر گرینسۆن)ی پزیشک، دانرابوو بۆ ئەوەی لەگەڵ (مارلین مۆنرۆ)دا بژی و

دواتیش بەوە تۆمەتبار کرا، کە سیخوڕیی بە سەر (مارلین مۆنرۆ) وە کردوە، دەڵێت لە سەعات (8.30)دا تەندروستی (مارلین) باشبوە، بەڵام (دایڤید سۆبۆتۆ)ی نووسەر دەڵێت لەو سەعاتەی باسی لێوەکراوە (مارلین مۆنرۆ) گیانی دەدا، بە هۆی بە کار هێنانی ڕێژەیەکی زیاد لە پێویست لە دەرمانە هێورکەرەوە و ئارامبەخشەکانی بۆی نووسرابوو.

بۆیە لەو کاتەوە، چەندین چیرۆک و بە سەرهاتی جیاواز و دژ بە یەک لە سەر مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ) بڵاوکرایەوە، کێ هات و سەردانیکرد؟ چۆن؟ بۆچی؟ لە لایەن کێوە نێردراوە؟ بە تەواوی لە کەیدا (مارلین) مرد؟

سەعات (4.35) دەقیقەی بەرەبەیانی ڕۆژی یەک شەممە (5)ی ئۆگەست، پۆلیس گەیشتە ماڵەکەی (مارلین)، کە بە ڕووتی لە سەر سیسەمەکەی ڕاکشابوو و گیانیشی سپاردبوو، سەرەڕای ئەوەی دوو پزیشکی هاوڕێ و نزیکی (مارلین) لە شوێنی ڕووداوەکە بوون، بەڵام ئێستاشی لەگەڵدا بێت نەتوانرا سەری ئەو داوە بدۆزرێتەوە، کە پێوەندییان بە مردنەکەی (مارلین)ەوە هەیە.

ڕۆژی (6)ی ئۆگەست، خوشکێکی (مارلین) و (دیماجیۆ)ی هاوسەری پێشووی، تەرمەکەی (مارلین)یان وەرگرتەوە، دوو ڕۆژ دواتریش بە ئامادەبوونی تەنها (24) کەسایەتی کە بە تایبەتی بانگهێشکرابوون، تەرمەکەی بە خاک سپێردرا، وەک هەندێک سەرچاوەش باسیان کرد، ئەو ڕۆژەش، هەمان ئەو ڕۆژەبوو کە بڕیاربوو بۆ جاری دوەم (مارلین مۆنرۆ) هاوسەرگیری لەگەڵ (دیماجیۆ) بکاتەوە.

لە ساڵی (1962)دا (مارلین مۆنرۆ) دەستیکرد بە وێنەگرتنی دیمەنەکانی دواین فیلمی، بەڵام بە هۆی نەخۆش کەوتن و بێ

هێزی و بێ توانایی (مارلین)ەوە لە ڕاییکردنی کاروباری فیلمەکە، وێنەگرتنەکە ڕاگیرا، (مارلین) ناچاریش بوو بە قەرەبووکردنەوەی زیانە داراییەکانی کۆمپانیای (فۆکس) کە بە هۆی ڕاگرتنی کاری وێنەگرتن و هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەوە ڕووبەڕووی ببۆوە، بەڵام لە ڕۆژی (1)ی ئۆگەستدا، (مارلین مۆنرۆ) هەڵمەتێکی فراوانی بانگەشەی ڕێکخست، بە بۆنەی نوێکردنەوەی گرێبەستەکە و دەستپێکردنەوەی ڕاهێنان و پرۆڤەی ئەو ڕۆڵەی بۆی دیاری کرابوو.

شەوی (4لە سەر 5)ی ئۆگەست، باری دەروونی (مارلین مۆنرۆ) زۆر خراپ بوو، کە دواتریش بە مردویی دۆزرایەوە، بەڵام مردنەکەی تا ئێستا بە گوماناوی ماوەتەوە.

بەپێی ڕاپۆرتێکی پزیشکی دادوەریی، (مارلین مۆنرۆ) بە هۆی بە کار هێنانی ڕێژەیەکی زیاترەوە لە دەرمانی هێورکەرەوە و ئارامبەخش کۆچی دوایی کردوە، بەڵام بەپێی نووسینێکی (نۆرمان مایلەر)ی چیرۆکنووسی ئەمریکی، (مارلین) بوە قوربانیی پیلانێکی ڕێکخراو و داڕێژاو لە لایەن (پۆلیسی فیدراڵی ئەمریکا -FBI-) و (دەزگای هەواڵگری ئەمریکا - CIA-)ەوە، بە هۆی ئەو پێوەندییە ڕۆمانسی و سێکسی و خۆشەویستییەی لەگەڵ (جۆن کەندی) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA) دا هەیبوو.

هەروەها دەشڵێت، (مارلین) قوربانیی یەکەمی تاوانێکی ڕێکخراوی سیاسی بوو، کە دواتر ڕووبەڕووی (کەنەدی، مالکۆم ئێکس، مارتن لۆسەر کینگ) بۆوە.

بەڵام (دۆن وۆلف) کە خاوەنی کتێبێکە لە سەر ئەو دۆخەی پێوەندی بە مردنی (مارلین مۆنرۆ)وە هەبوو، ئەنجامی ڕووداوەکەی کورتکردەوە بەوەی (مارلین) کوژراوە، وەک

بەشێک لە زنجیرەیەکی کوشتن کە دواتر و لە چەند ساڵێکی نزیک لە یەکدا هەریەک لە (ڕۆبەرت کەندی) و چەند کەسێکی زۆر نزیک لە (مارلین مۆنرۆ) کوژران.

لە لایەکی تریشەوە (دۆناڵد سۆبۆتۆ) کە چیرۆکی ژیانی (مارلین مۆنرۆ)ی نووسیوەتەوە، پێی وایە (مارلین مۆنرۆ) بە هۆی هەڵەیەکی پزیشکییەوە گیانی لە دەست داوە، لە یەک کاتدا چەند شیتێک حەبی خواردوە و بە هۆیەوە مردوە.

لە ساڵی (1949)دا، بە هۆی ئەو کێشە و قەیرانە دارایییەی تێیدا دەژیا، (مارلین مۆنرۆ) ڕازی بوو بە پیشاندان و بڵاوکردنەوە و دەرکەوتنی وێنەکانی لە ڕۆژنامەی (خەونە ئاڵتوونییەکان)دا، کە لە بەردەم پەردەیەکی قەیفەی سووردا وێنەی دەگیراو لە بەرانبەردا (50) دۆلاری پێ دەدرا.

لەو کاتەدا، دەزگای چاودێری ئەمریکا پێی وابوو ئەو وێنانە وێنەی سێکسی و وروژێنەرن و بەو هۆیەشەوە لە زۆرینەی ویلایەتەکانی ئەمریکا فرۆشتنی (ڕۆژنامە)کە قەدەغەکرا، بەڵام هەندێک لەو نووسخانەی ڕۆژنامەکە کە مابوونەوە و دەستیان بە سەردا نەگیرابوو، بە دەست و هێلکاری، جلوبەرگ کرایە بەر (مارلین) و بە جەستەی داپۆشراو ڕۆژنامەکە بڵاو کرایەوە.

لە ساڵی (1952) دا و دوای ئەوەی تا ڕادەیەک (مارلین مۆنرۆ) ناوبانگی پەیداکرد، چەند ڕۆژنامەیەکی ئەمریکی هەندێک لەو وێنە ڕووت یان نیمچە ڕووتانەی (مارلین مۆنرۆ)یان بڵاو کردەوە و بەو هۆیەشەوە ئابڕووچوونێکی گەورە دروستبوو، هەندێک لەو وێنانەش لە سەر بەرگی پێشەوەی گۆڤاری (پلەی بۆی) بڵاو کرایەوە، ئەمەش دوای ئەوەی لە لایەن (هیو هینفەر) ی بڵاو کەرەوەی گۆڤارەکەوە، مافی خاوەندارێتیکردن و بڵاو کردنەوەی ئەو وێنانەی لە (مارلین مۆنرۆ) کڕییەوە.

بە هۆی بڵاو کردنەوەی ئەو وێنانەشییەوە، (پڕوپاگەندە و دەنگۆ)یەکی زۆر بڵاو بۆوە بەوەی گوایە (مارلین مۆنرۆ)، وەک ئەکتەر بەشداری لە فیلمێکی سێکسی و پۆرندا کردوە و ئەو وێنانەش بە شێوەیەکی بەربڵاو بە سەرانسەری دونیادا بڵاو بوونەوە، بەڵام لە ساڵی (1982)دا گۆڤاری (پلەی بۆی) چیرۆک و باس و خواسەکەی ڕاستکردەوە و ئاشکرایکرد ئەو کچەی لە فیلمە پۆڕنەکەدا ڕۆڵی بینیوە، هاوشێوەی (مارلین مۆنرۆ) بوە و زۆر لەو چوە.

لە ساڵی (1962) دا (مارلین مۆنرۆ) بەشداری لە دوایین کاری وێنەگرتنی فیلمەکەیدا کرد، لەو بارەیەوە (پێرت ستێرن) ی وێنەگری بە ناوبانگ کە لەو سەردەمەدا چەند وێنەیەکی گرتبوو، باس لەوە دەکات (مارلین مۆنرۆ) چوار سەعات دوای کاتی دیاریکراو گەیشتە شوێنی وێنەگرتن و تۆمارکردنی فیلمەکە لە (گراند هۆتێل) لە شاری نیویۆرک، بەڵام کە گەیشت و وێنەگرتنەکە دەستی پێکرد نزیکەی (12) سەعاتی خایاند.

(پێرت ستێرن) دەشڵێت کە بەرهەمی وێنەگرتنەکانی ئەو ڕۆژەی زۆر نایاب بوو، چونکە نزیکەی هەزار و (500) وێنەی تایبەت و نایابی (مارلین مۆنرۆ)ی گرت، ئەو وێنانە دوای مردنی (مارلین مۆنرۆ) لە یەکێک لە مۆزەخانەکانی شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا نمایشکران، پێویستیشە بگوترێت، یەکێک لە شتە نادیار و شاراوەکانی ژیانی (مارلین مۆنرۆ)، ناسنامە و شووناسی باوکی بوو.

(گلادیس)ی دایکی، ژنێکی بێهێز و ناجێگیربوو، هیچ شتێکی لە سەر یەکەم هاوسەری نەدەزانی جگە لە ناوەکەی، هەر چەندە دوو منداڵیشی لێی هەبوو، هەندێک لە نووسەران، باس لەوە

دەکەن و کۆکن لە سەر ئەوەی چەند گریمانە و ئەگەرێک لە سەر ژیانی باوکی (مارلین مۆنرۆ) هەیە:

(مارتن ئێدوارد مۆرتنسۆن) هاوسەری دوەمی (گلادیس)ە، لە ساڵی (1897) لە نەرویج لە دایک بوە، لە (11)ی ئۆکتۆبەردا هاوسەرگیرییان کردوە، هاوسەرەکەی و سێ منداڵی لە نەرویج بە جێ هێشتوە و ڕوویکردۆتە (USA)، دوای ئەوەی (گلادیس)ی بە جێ هێشت، لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا و بە هۆی ماتۆڕێکەوە لە ئۆهایۆ گیانی لە دەست دا، هەندێکی تریش باس لەوە دەکەن (ئێدوارد مۆرتنسۆن) لە ساڵی (1981) لە کالیفۆرنیا مردوە. ئەگەرێکی زۆریش هەیە کە (ئێدوارد) باوکی (مارلین) بێت، چونکە ناوی (ئێدوارد) لە سەر (بڕوانامەی لە دایک بوونی مارلین) و گرێبەستی هاوسەرگیری (مارلین و دیماگیۆ) نووسراوە.

بەڵام بەپێی گریمانە و ئەگەری دوەم، (ستانلی جیفۆرد) باوکی (مارلین)ە، کە خۆشەویستی (گلادیس) بوە لە ساڵانی (1925 بۆ 1926)، کاتێک پێکەوە لە هەمان دامەزراوەدا کاریان دەکرد و هاوپیشەبوون، دەشگوترێت دوای ئەوەی (گلادیس) پێی گوتوە کە (دووگیانە) لێی، (ستانلی) بە جێی هێشتوە، (مارلین)یش پێی وابوە کە (ستانلی) باوکێتی و چەند جارێکیش هەوڵی زۆریداوە پێوەندی لەگەڵ دروست بکات، بەڵام هەموو جارەکان شکستی هێناوە و ئەو کارەی بۆ نەکراوە، بۆیە بە ناچاری دەستیکردوە بە نامەنووسین و نامەناردن بۆی، بەڵام لەوەش نائومێد بوە و نووسیویێتی (زۆر درەنگ هاتیتەوە).

چیرۆکنووس و پسپۆڕی دەروونناسی فەرەنسی (میشێل شنایدەر) لە چیرۆکە نوێیەکەیدا بە ناونیشانی (ڕووداوەکانی دوو ساڵی ژیانی مارلین مۆنرۆ)، هەوڵێکی زۆریدا لە

ڕوانگەی دەروونناسییەوە، وێنای خاڵە دیارەکانی ئەفسانە خۆشەویستەکەی (هۆلیود) بکێشێت، ئەوەش بە پشتبەستن بە هەندێک کەسایەتی ڕاستەقینە و لێدوان و گفتوگۆ و چاوپێکەوتن و نامە و نووسراو.

(شنایدەر) لەو چیرۆکە چێژبەخشەیدا کە لە لایەن (دەزگای فجوارای ئیسپانی)ییەوە چاپ و بڵاوکرایەوە، بایەخێکی زۆری دابوو بەو دانیشتنی چارەسەرانەی (مارلین مۆنرۆ) کە لە (یەنایەری ساڵی 1960) بۆ (4ی ئۆگەستی ساڵی 1962)، لە سەر دەستی دیارترین پزیشکی دەروونی هۆلیۆد (ڕاڵف گرینسۆن) وەری دەگرت.

ئەو چیرۆکە کە بەزمانی ئیسپانی بڵاو کرایەوە، دەیەوێت پێوەندی ئەو پزیشکە بە مردنی (مارلین مۆنرۆ) بدۆزێتەوە، هەروەها دەشیەوێت بزانێت بۆچی زۆرینەی ژنە هونەرمەندە جوان و شۆخ و شەنگ و بە ناوبانگەکانی جیهان ئومێدیان بە مردن خواستوە، دیارترین ڕەگەزی سەرنج ڕاکێشی چیرۆکە (خەیاڵی و ڕاستەقینە)کەی (شنایدەر)، گەڕاندنەوەی هەر یەک لە (مارلین مۆنرۆ) و (ڕاڵف گرینسۆن)ە بۆ ژیان.

پێویستە ئەوەش بگوترێت کە ئەوە یەکەم جار نییە، ئەو نووسەر و دەروونناسە، کە لە ساڵی (2003)دا لە سەر چیرۆکی (مردنە خەیاڵییەکان) خەڵاتی (میدیسیس)ی وەرگرت، پەنا بباتە بەر ئەو شێوازی نووسینە، دروستکردنی کەسایەتییەکانی نێو چیرۆکەکانی، لە سەر بنەمای ڕووداو و کەسایتییە ڕاستەقینەکان بێت، بەپێی بەڵگەو دۆکیۆمێنتە باوەڕپێکراو و پشتڕاستکراوەکان.

بەلام ئەم جارە، ئەو چیرۆکنووس و دەرونناسە، کەسایەتییەکی هەڵبژارد کە خاوەنی جۆرێک لە سیحرییەت

و پاکێتییە، ئێستاشی لەگەڵدا بێت گفتوگۆیەکی توند لە سەر زۆرینەی لایەنەکانی ژیانی هەیە، تەناتەت ئەو دەستەسرەی بۆ یەک جار بە کاری هێناوە، قسەی زۆری لە سەر دەکرێت و بۆتە بابەتێکی جدی ناو ڕای گشتی، ئەو کەسایەتییەش (مارلین مۆنرۆ)ی ئەفسانەیە.

ئەو نووسەرە لە ڕێگەی گەڕان و لێکۆڵینەوەکانییەوە چیرۆکی دیدار و گەیشتنە سەرشێتانەییەکەی بە (ڕاڵف گرینسۆن) ئاشکرا کردوە و کردوویەتییە بەشێکی سەرەکی چیرۆکێک، لەو بارەیەشەوە دەڵێت «چیرۆکی مارلین و گرینسۆن، وەک خاڵی بە یەک گەیشتنی نێوان دوو جیهانە کە نابێت بە یەک بگەن، بە یەک گەیشتنەکەشیان جۆرە شێواندنێکی دروستکرد کە ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەک وێنای بکرێت».

دەشڵێت «ویستم سەر لە نوێ ئەو پێوەندییە دروستبکەمەوە، بەڵام بە پەلە گەیشتمە ئەو باوەڕەی تەنها لە ڕێگەی نووسینی چیرۆکێکەوە دەتوانم بگەم بە ڕاستییە دژ بە یەکەکان و ئاشکراکردنی نهێنی ئەو پێوەندییەی دیارترین هونەرمەندی جیهان و گەورەترین پزیشکی دەروونی هۆلیوودی پێکەوە دەبەستەوە»، (شنایدەر) نەیدەویست ئەو زانیاری و چیرۆکە بە مەبەست و لە شێوەی ژیاننامەیەکدا بڵاو بکاتەوە، یاخود هەر چییەکی پێ گوترابێت لە کتێبەکەیدا بینووسێت و هیچی خۆی تێدا نەبێت.

لە بارەی کتێبەکەشییەوە، ئەو چیرۆکنووسە دەڵێت «هیوام دەخواست کەسایەتییەکانی نێو چیرۆکەکەم ڕاستەقینە بن، ئەگەرچی وام لێ دەکردن هەندێک کار ئەنجام بدەن کە ڕاست نەبوون، دۆخی ڕاستەقینە بە مانای نەبوونی دژ یەکی نییە،

بەڵکوو هەندێک جار بە مانای ونبوونییەتی، دڵنیانیم لەوەی سەبارەت بە چیرۆکی (مارلین و گرینسۆن) نووسیومە، لە ڕاستیشدا ئەگەر بە هەمان شێوە ڕوویدابێت، ئەوا من شتەکانم تێکەڵ بە یەک نەکردوە، بەڵکوو بە تەنها پەنام بردۆتە بەر ڕاستییە زانراو و ئاشکراکان»، هەروەها باسی لەوەشکردوە «هەموو کەسێک دەزانێت (مارلین مۆنرۆ) ئالودەی هەموو کارێکی قەدەغەکراو بوو».

لای خۆیەوە نووسەرە فەرەنسییەکە دەڵێت «چیرۆک ناتوانێت مارلین مۆنرۆ بکاتە کەسێکی پیرۆز، لە کاتێکدا پیاوان گەندەڵیان کردوە و خراپیان کردوە»، پێشی وایە (مارلین مۆنرۆ) کچێکی سادەی دێهاتی بوو، پێشتر بە ناوی (نۆرما جین) ناسرابوو، خۆی لەو قژە زەردەدا پیشاندا بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت، ئەگەرچی هیچ ڕۆشنبیرییەکی نەبوو، بەڵام زۆر زیرەک بوو، زۆریش حەزی بە خوێندنەوە دەکرد، بە تایبەت کتێبەکانی (کافکا، ڕیلکە، دۆستۆیفسکی)، هاوسەرگیریشی لەگەڵ (ئارسەر میللەر)ی شانۆنووسدا کرد.

بەڵام (مارلین مۆنرۆ)، لە پێناوی هەڵاتن و دەربازبوون لەو کەسایەتییەی کە هەیبوو و هیچ پێی ئاسوودەنەبوو، پەنای بردەبەر وێناکردن و دروستکردنی کەسایەتییەکی تر بۆ خۆی، هەر لەبەر ئەمەش نووسەری چیرۆکەکە بڕیاریدا لە نێو دەقەکەیدا زۆرترین ئاوێنە و شوشە بە کار بهێنێت، وەک پیشاندانەوەی بەردەوامی وێنەی کەسەکان و پێچەوانەکردنەوەی ئەوەی خۆی وێنای دەکات.

(شنایدەر) پەنای بردە بەر ئەو تۆمارە دەنگییەی (مارلین مۆنرۆ) پێش مردنەکەی بۆ (گرینسۆن)ی تۆمارکردبوو، بۆ

ئەوەی لە نووسینەوەی چیرۆکەکەیدا سوودی لێ وەربگرێت، لە کۆتاییەکانی ژیانیدا (مارلین مۆنرۆ) نەیدەتوانی خۆی سەردانی (گرینسۆن) بکات و قسەی بۆ بکات، بۆیە وای بە باشزانی هەر چییەکی بویت باسی بکات لە سەر دوو کاسێت تۆماری کرد و بۆی نارد.

هەر چەندە (شنایدەر) گومانی لە ڕاستی و دروستی و پارێزراوی ئەو دوو کاسێتە هەیە، چونکە هەموو قسە تۆمارکراوەکان هاوتەریبن بەوەی (گرینسۆن) دەیویست بیسەلمێنێت (مارلین مۆنرۆ) نە خۆی کوشتوە نە کوژراویشە، بەڵکوو بە هۆی کارلێک و کاردانەوەکانی ئەو دەرمانە بێهۆشکەرانەوەبوو، کە (مارلین مۆنرۆ) بە شێوەیەکی بەردەوام و بە نهێنی و بە ڕێژەیەکی زۆر بە کاری هێنابوو.

(شنایدەر) باسی لەوەشکردوە لە ڕێگەی چیرۆکەکانییەوە نەیتوانیوە وەڵامی پرسیارە ڕاستەقینەکان بداتەوە، بەڵکوو تەنها چۆتە سەر باس کردن و دەستبردن بۆ چەمکی چارەنووس بە شێوەیەکی تراژیدی، بەوەی کاتێک (مارلین مۆنرۆ) مرد، لەم دواییەشدا وای پیشاندەدا هەموو کێشە سێکسی و پیشەییەکانی چارەسەربووبوو، کە پێشتر دەیشاردنەوە و باسی نەدەکردن، بە لای ئەویشەوە مردنی (مارلین مۆنرۆ)،» تاوانێکە بە بێ بکوژ«، هۆکارەکەشی ئەو پاڵنەرە لا ئیرادەیەبوو، کە بەرەو مردن ئاڕاستەی دەکرد و پاڵی پێوەدەنا.

سەبارەت بە پێوەندی (گرینسۆن) بە مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ)وە، (شنایدەر) پێی وایە لەم ماوەیەی کۆتاییدا (گرینسۆن) زۆر بەڕێز و بە هەستەوە مامەڵەی لەگەڵ (مارلین) دەکرد و هاوکاری دەکرد، لە کاتێکدا زۆریشی حەز لە پارە و سامان

و دەسەڵات و ناوبانگ دەکرد، لەو کاتەشدا (مارلین) بە ناوبانگترین و ناودارترین ژنی جیهان بوو، ئەویش سوودی زۆری لە پێوەندییەکەی وەرگرت بۆ بە دەستهێنانی ناوبانگ، ئەو نووسەرە جۆری پێوەندییەکە بەوە وەسف دەکات کە (چیرۆکێکی خۆشەویستی بێ خۆشەویستی)یيە، سەرەڕای ئەو نەگونجاوییەی هەیانبوو، بەلام کەسیان لەوەی تریان جیانەبوونەوە، لە کۆتاییدا (مارلین) لە هەفتەیەکدا (7) ڕۆژ پزیشکەکەی خۆی دەبینی و پزیشکەکەش هیچ نەخۆشێکی تریشی نەبوو.

لە هەمان کاتدا، ئەگەری بوونی جۆرێک لە (شێتی) لای نەخۆشە دەرونییەکە بە دوور نازانرێت، بە تایبەتی کە ناهاوسەنگ و ئالودەش بوو، (گرینسۆن)یش کەسێکی خۆپەرست بوو زۆر لە کەسایەتی و وێنا و ناوبانگی خۆی دەترسا، بە هۆی پێوەندی نێوان (مارلین و گرینسۆن)یشەوە، شێتییەکی گەورەتر هاتە ئاراوە.

چیرۆکەکەی (شنایدەر)، هۆشدارییەکی توندە بۆ هەڵەکانی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە دەرونییەکان، تەئکیدیش دەکاتەوە لە سەر ئەوەی ئەم جۆرە چارەسەرکردنانە نابێتە هۆی چارەسەرکردنی کێشە و گرفتی کەسەکان، چونکە کەسەکە بۆ خۆی دەزانێت ڕووداوە ڕاستەقینەکان چین و پێویست ناکات بۆ ئاشکراکردن و دۆزینەوەی ڕووداوەکان چەندین ساڵ سەردانی پزیشکی دەروونی بکات.

(شنایدەر) لە کۆتاییدا باسی لەوەشکردوە کتێبەکەی «چیرۆکێک نییە سەبارەت بە مارلین مۆنرۆ یان شیکردنەوەی دەروونی، بەڵکوو کتێبێکە سەبارەت بەو ململانێیەی لە ناو

ناخماندا بوونی هەیە، لە نێوان وێنە و قسەدا بوونی هەیە، مەبەستمە بڵێم ڕاستی نە لە وێنەدایە نەلە قسە دا، بەڵکوو لە ڕووبەڕووبوونەوە بەردەوامەکەی نێوانیاندایە».

سەرەڕای تێ پەڕبوونی چەند ساڵێک بە سەر کۆچی دوایی بە ناوبانگترین ئەستێرەی ورووژێنەر و کاریگەری جیهان، بەڵام تا ئێستا مردنەکەی بە نادیاری ماوەتەوە و جێی قسە و باسی هەموانە، هەر ڕۆژە شتێکی نوێ دێتە پێش و هەموان دڵخۆش دەبن بەوەی نهێنی مردنەکەی ئاشکرا بکرێت، بەڵام ئایا (مارلین مۆنرۆ) خۆی کوشت، یان لە لایەن پیاوەکانی (جۆن کەنەدی) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA)یەوە کوژراوە.

دواتریش، ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز)ی ئەمریکی، نهێنییەکی تری بۆمبەکەی سینەمای ئەمریکی بڵاو کردەوە، کە لە میانەی کۆرسەکانی چارەسەرکردنی دەروونیدا، پزیشکەکەی لە سەر کاسێت تۆماری کردوە و بەم دواییانە بڵاو کرایەوە.

لەو کاسێتە تۆمارکراوانەدا، (مارلین مۆنرۆ) کۆمەڵێک نهێنی زۆری پێوەندییەکەی خۆی لەگەڵ (ڕۆبەرت کەنەدی) برای (جۆن کەنەدی) و (داواکاری گشتی ئەو کاتەی ئەمریکا) ئاشکرا کردوە، بە هەمان شێوە پێوەندییەکی خۆشەویستی و سۆزدارییان هەبوو.

بەپێی ڕاپۆرتەکەی ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز)، تۆمارکردنی ئەو دوو کاسێتە دەگەڕێتەوە بۆ چەند ڕۆژێک پێش دۆزینەوەی تەرمەکەی (مارلین مۆنرۆ) لە (5)ی ئۆگەستی ساڵی (1962) لە شوقەکەی خۆیدا لە لۆس ئەنجلس، کە بەپێی ڕاپۆرتی پزیشکی دادی، بە هۆی (ژەهراویکردن)ەوە گیانی لە دەستداوە و مردوە، لە کاتێکدا لێکۆڵینەوەکان دەڵێن (خۆی ژەهرخوارد کردوە و خۆی کوشتوە).

ڕۆژنامەکە ئاشکراشیکردوە کۆپییەکی دەستنووسی ئەو کاسێتە تۆمارکراوەی لە لایەن لێکۆڵەری پێشوو (جۆن مینەر) ی تەمەن (86) ساڵەوە پێی گەیشتوە و دەیسلەمێنێت (مارلین مۆنرۆ) قوربانیی پیلانگێڕییەک بوە، چونکە دڵنیایە لەوەی (مارلین مۆنرۆ) لەو کەسانە نەبوە کە ئارەزووی لە خۆکوشتن هەبوو بێت.

لە لایەکی ترەوە هەریەک لە (پیتەر گرای) و (بات بارهام) لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا بە ناونیشانی (بازدانی مردن)، چەند ڕووداوێکی ترسناکیان کۆ کردۆتەوە، کە بە جۆرێک لە جۆرەکان پێوەندییان بە ڕووداوی مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ)ی شاژنی وروژاندنەوە هەبێت و دەڵێن «مارلین مۆنرۆ کاریگەری و مەترسی لە سەر گۆڕەپانی سیاسی ئەمریکا هەبوو، تەنانەت دوای تێ پەڕبوونی چەندین ساڵیش بە سەر مردنەکەیدا لە ساڵی (1962)ەوە تا ئێستا، ئەو مەترسی و کاریگەرییەی هەر ماوە، ئەم کتێبە هەر یەک لە (جۆن کەنەدی) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA)، (ڕۆبەرت کەنەدی) برای و داواکاری گشتی ئەمریکا، پیاوانی خزمەتگوزاریی نهێنی لە دەزگای هەواڵگری ئەمریکا (cia)، تۆمەتبار دەکات بە پیلاندانان لە دژی (مارلین مۆنرۆ)ی شاژنی وروژاندن، بە هۆی ئەو ناکۆکییەی لە نێوانیاندا هەبوو، هەروەها دەیانویست ڕزگاریان بێت لە دەستی، بە تایبەتی دوای ئەوەی (مارلین) ڕایگەیاند کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕێک دەخات بۆ ئاشکراکردنی وردەکاری پێوەندییە سۆزدارییە ڕۆمانسییەکانی.

بەپێی هەندێک لە گێڕانەوەکان، لەو کاتەدا (ڕۆبەرت کەنەدی) چپاندوویەتی بە گوێی (جۆن کەنەدی) برای و سەرۆکی ئەمریکادا

و پێی گوتوه «ئەم بەیانییە (مارلین مۆنرۆ)مان دۆزییەوە کە لە ژوورەکەی خۆیدا خۆی کوشتبوو، (کەنەدی)ش لە وەڵامدا پێی گوتوە «شتێکی جوانم لە ناخمدا کوشت، خۆشەویستییەکەی بۆمن کوشتی». دواتر (کەنەدی) سەیری شوێنێکی دووری کردوە و گوتویەتی «حەزم دەکرد جووتیارێکی سادە بوومایە لە یەکێک لە ویلایەتەکانی ئەمریکا، نەک سەرۆک بوومایە و خۆشەویستەکانم توشی هیلاکی و ماندوێتی و بێزاریی بکردایە».

چونکە پێوەندییە سۆزداری و گەرموگوڕەکەی نێوان (کەنەدی و مارلین) بە جۆرێک ئاشکرا بوو، زۆرێک لە ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکا کاریان لە سەر دەکرد، بەڵام ئایا لەو کاتەدا کێ بوێری ئەوەی هەبوە لە سەر بابەتێکی لەو جۆرە ڕووبەڕووی سەرۆکی (USA) ببێتەوە؟ هاوکات (ڕۆبەرت کەنەدی) لە سەر ئەو ژنە زۆر جار گاڵتەی بە براکەی دەکرد و گوتویەتی کێشەکەیم چارەسەر کرد.

بەپێی ئەو تۆمارە دەنگییانەی لەم دواییانەدا بە گشتی و بە تایبەتی لە (سێپتەمبەر)ی ساڵی (2005)دا بڵاو کرانەوە، (مارلین مۆنرۆ) قوربانی تاوانێکی کوشتن بوو بە هۆی پێوەندییەکەیەوە لەگەڵ (ڕۆبەرت کەنەدی)..

بۆ یەکەم جار لە دوای بڵاو بوونەوەی ئەو تۆمارە دەنگییەی (مارلین مۆنرۆ)، کە چەند هەفتەیەک پێش مردنە گوماناوییەکەی لە سەر کاسێت تۆمارکراوە و هیچ کەسێکیش گوێی لێ نەبوە، بە هۆی ئەوەی لە شوێنێکی زۆر پارێزراو شاردرابۆوە، پەردە لە سەر دەمامکەکە لادراو ئاشکرابوو، لەبەر ئەوەی (مارلین) لەو تۆمارەدا، لە سەر دید و بۆچوون و تێگەیشتنی خۆی

هەڵسەنگاندنی بۆ ئەندامانی خانەوادەی (کەنەدی) کردوە، هەروەها لە گێڕانەوەی وردەکارییەکانی ژیانی خۆشیدا، ئاماژەی بەوەکردوە چەند جارێک هەوڵی تیرۆرکردنی دراوە.

لە لایەن (جۆن ماینەر)ی تەمەن (86 ساڵ)ەوە، کە نوێنەری داواکاری گشتی و دادگا بوو لە هەرێمی لۆس ئەنجلۆس و هەروەها یەکێکیش بوو لە ئامادەبوانی پرۆسەی توێکارییکردنی جەستەی (مارلین مۆنرۆ) لە ساڵی (1962)، مۆڵەتدرایە ڕۆژنامەی (لۆس ئەنجلس تایمز)ی ئەمریکی، بۆ بڵاو کردەوەی وردەکاری و ناوەڕۆکی ئەو تۆمارە دەنگییە مەترسیدارە.

ئاماژەکانی نێو تۆمارە دەنگییەکە بریتی بوون لە:.

- چیرۆکی خۆکوشتنی (مارلین)، کە وەک هەڵوێستێکی ڕەسمی ڕاگەیەندرا، هیچی تر نەبوو جگە لە داپۆشینی هۆکاری ڕاستەقینەی مردنەکەی، کە لە ڕێگەی دەرزییەکی بکوژەوە کوژرا.

- لەو ماوەیەدا کە کوژرا، (مارلین مۆنرۆ) بە هەموو شێوەیەک لە هەوڵدابوو بۆ کۆتایی هێنان بەو پێوەندییەی لەگەڵ (ڕۆبەرت)ی برای (جۆن فرانکلین کەنەدی) سەرۆکی ئەو کاتەی ئەمریکا هەیبوە، هەروەها دەرکردن و دوورخستنەوەیان لە ژیانی تایبەتی خۆی.

- لە ژیانی تایبەتیدا، هەندێک پێوەندی نارێکی هەبوو لەگەڵ (جوان کراوفۆرد)ی ئەستێرەی شاشەی ئەمریکی.

(ماینەر) پێکەوە لەگەڵ (دکتۆر ڕاڵف گرینسۆن)ی پزیشکی دەروونی و تایبەتی (مارلین مۆنرۆ)دا گوێیان لەو کاسێتە دەنگییانە دەگرت و دەڵێت لە کاتی گوێگرتنەکەدا تێبینی پیشەییانەی تۆمار دەکرد، هەروەها بەڵێنیشدا تا ئەو کاتەی دەمرێت، بە

هیچ شێوەیەک باسی نهێنییەکانی نێو ئەو کاسێتانە نەکات و لە ناو سنگیدا بیانهێڵێتەوە و لەگەڵ خۆیدا بیانباتە گۆڕەوە، دوای تێ پەڕبوونی چەند ساڵێک و دوای مردنی (گرینستۆن) کە وەک گومانلێکراوێکی دۆسییەی مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ) تەماشا دەکرا، (ماینەر) مۆڵەتی لە (هاوسەرەکەی گرینستۆن) وەرگرت، بۆ ئەوەی پشکنین و لێکۆڵینەوە لە سەر ئەوە بکات کە بیستوویەتی. لەو بارەیەوە (ماینەر) دەڵێت «هیچ هۆکارێک نییە بۆ ئەوەی ئەو ژنە خۆی بکوژێت، خۆکوشتن دواین شت بوو کە لەم ڕۆژانەی دوایدا (مارلین) بیری لێ کردبێتەوە». هەروەها « چەندین پلان و بەرنامەی دیاریکراو و ئاشکرای هەبوو بۆ ژیانی داهاتووی، بە تەواوی دەشی زانی چی دەوێت و هەوڵ بۆ چی دەدات».

بەڵام (جیمس باکۆن)ی تەمەن (91 ساڵ)، کە یەکێک بوو لە گۆشەنووسەکانی تایبەت بە (هۆڵیود) و هاوڕێیەکی نزیکی (مارلین مۆنرۆ) بوو، پێنج ڕۆژ پێش مردنەکەشی، سەردانێکی بۆ تۆمارکردبوو، دەڵێت «هیچ گۆشەگیرییەکی نەبوو، بەو هۆیەی لەو کاتەدا دەستگیرانێکی مەکسیکی هەبوو، پلانی ئەوەی دادەنا بچێت بۆ مەکسیک».

ڕەنگە بوونی ئەم پێوەندییە سۆزدارییە نوێیە، هۆکار بوو بێت بۆ ئەوەی (مارلین مۆنرۆ) حەز بکات (ڕۆبەرت کەنەدی) داواکاری گشتی ئەمریکا، لە ژیانی تایبەتی خۆی بکاتە دەرەوە و هەموو بیرەوەرییەکانیشی لە ناو خەیاڵیدا بسڕێتەوە، لە سەر ئەو بابەتە زۆر بە ڕاشکاوی لە کاسێتە تۆمارکراوەکەدا قسەی کردوە و دەڵێت «لە ژیانمان هیچ بوارێک بۆ ئەو نەماوە، هیچ بوێرییەکیشم نییە بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی ببمەوە و زیانی پێ

بگەیەنم، پێویستم بە کەسێکی تر هەیە بۆ ئەوەی ئەم قسانەی پێ بگەیەنێت، ئەوەی لە نێوانماندابوو کۆتایی هات، هەوڵێکی زۆرمدا بۆ ئەوەی جەنابی سەرۆک ئەم کارە جێبەجێ بکات، بەڵام سەرکەوتوونەبووم و نەمتوانی پێی بگەم».

(ڕۆبەرت کەنەدی) یەکێک بوو لە کارەکتەرە سەرەکییەکانی شانۆیی کوشتنە نامۆ و گوماناوییەکە، بەپێی تۆمارە پارێزراوەکانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا، لە چەند مانگی کۆتایی ژیانیدا، ماڵەکەی (مارلین مۆنرۆ) لە ژێر چاودێرییەکی زۆر چڕوپڕدابوو، کە ژیانی بەرەو ترسێکی زۆر ڕاپێچ دەکرد، چونکە بە هۆی پێوەندییە نزیکەکەیەوە لەگەڵ (جۆن ) و (ڕۆبەرت) کەنەدی، هەندێک زانیاری و نهێنی زۆر تایبەتی دەزانی.

لە لایەکی تریشەوە و بەپێی شاهیدی دانی هەندێک لە شاهیدحاڵەکان لە دوای چەند ساڵێک، (مارلین مۆنرۆ) و (ڕۆبەرت کەنەدی) لە پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی خۆی تێدا کوشتوە، گفتوگۆیەکی زۆر توندیان هەبوە، هەروەها سەعات (10)ی شەو، لەگەڵ (پیتەر لۆفۆرد)ی هاوڕێی نزیکیدا گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە، دوای چەند سەعاتێکیش لە ڕۆیشتنیان، (ئیونیس مۆرای) پاسەوانی ماڵەکەی (مارلین مۆنرۆ) ڕایگەیاند کە ئەستێرەکەی هۆلیود مردوە.

دوای تێ پەڕبوونی ئەو هەموو ساڵە، بەڵام تا ئێستاش (ماینەر) سوورە لە سەر ئەوەی دەبێت ئێستا توێکارییەکی نوێ بۆ جەستەی (مارلین مۆنرۆ) بکرێتەوە، بۆ دەستکەوتنی وەڵامی زۆرینەی ئەو پرسیارانەی دەکرێن و هیچ وەڵامێکی ڕاستییان نییە.

ئەگەر بێت و گریمانەی ئەوە ڕاست بێت کە مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ) بە هۆی لێدانی دەرزی لاملییەوە بێت نەک

لە ڕێگەی دەم یان دەرزییەکی دەمارییەوە، (ماینەر) دەڵێت «توێکارییەکە بە ئاشکراو بە وردی ئاماژەدەکات بەوەی کە هێورکەرەوەکانی (بربیتیوریت) بە ڕێژەیەکی زۆر و لە ڕێگەی ڕیخۆڵە ئەستوورەوە چۆتە ناو جەستەی (مارلین)ەوە نەک لە ڕێگەی دەمیەوە». هەروەها (ماینەر) دەڵێت شوێنەواری هیچ برینێک بە جەستەی (مارلین مۆنرۆ)وە دیار نەبوە.

لەبەر ئەوەشی نەفرەتییەکانی خانەوادەی (کەنەدی) یەکێکە لە دیارترین و ناودارترین دۆسییە کراوەکانی ئەمریکا، ماوەیەکی زۆر تێ ناپەڕێت و هەواڵ و زانیارییەکی نوێ بڵاو دەکرێتەوە، یان شتێکی نوێ لە سەر قوربانیانی نەفرەتی و کوژراوەکانیان ئاشکرا دەکرێت.

بۆ نموونە، لە مانگی ئازاری ساڵی (2006)دا، هەواڵێک بڵاو کرایەوە لە سەر ئەوەی دەسەڵاتدارانی ئەمریکا بڕیاریانداوە کە (سەرحان سەرحان)ی بکوژی (جۆن کەنەدی) لە ساڵی (1968)دا، لە زینداندا بمێنێتەوە و ئازاد کردنی مەرجداریشیان ڕەتکردۆتەوە، چونکە دڵنیان لەوەی تا ئێستا مەترسییە لە سەر کۆمەڵگە.

تەمەنی پیشەیی (مارلین مۆنرۆ) (16 ساڵ) بوو، بەرهەمەکەشی (29) فیلم بوو، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لە ئەفسانەکانی هونەر و جوانی و ژنێتی و لە هەمان کاتدا کێشە و دەردەسەریش.

(مارلین مۆنرۆ) لە (1)ی حوزەیرانی ساڵی (1926) لە دایک بوە، لە نەخۆشخانەی (لۆس ئەنجلس) بە ناوی (نۆرما جین) تۆمار کراوە، لە ئابی ساڵی (1962)دا کاتێک تەمەنی تەنها سی و شەش ساڵ بوە، گیانی لە دەست داو ماڵ ئاوایی کردوە،

ئێستاشی لەگەڵدا بێت یەکێکە لە هونەرمەندە دیار و ناسراوەکانی جیهان هەموو سەردەمەکاندا.

(گلادیس)ی دایکی، لە بنەچەدا سکۆتلەندییە، بەڵام (ئێدوارد مۆرتیسۆن)ی باوکی، نەرویجییە، پێش ئەوەی (مارلین) لە دایک بێت، (ئێدوارد)ی باوکی ماتۆڕێکی کڕی و خێزانەکەی بە جێ هێشت و ڕوویکردە (لۆس ئەنجلۆس)، (مارلین) تا ئەو کاتەشی گەورەبوو نەیدەزانی کێ باوکی ڕاستەقینەیەتی.

بە هۆی زۆری پێوەندییەکانی دایکییەوە، (مارلین) لە ڕووی سۆزدارییەوە کەسێکی شێواوبوو، بە تایبەتی کە هەژاری و خراپی باری داراییان هاوڕێیەکی هەمیشەیی ژیانی (مارلین) و دایکی بوو. ئەگەرچی (گلادیس)ی دایکی، کەسێکی سەرنج ڕاکێش بوو، لە ستۆدیۆی (rku)ی تایبەت بە فیلم کاری دەکرد، بەڵام بە هۆی نەخۆشییەکی مێشکەوە، هەموو ژیانی بە ڕێی چارەسەرکردن و سەردانی سەنتەرەکانی تایبەت بە چارەسەری مێشک بە ڕێ کردوە، بەو هۆیەشەوە (مارلین) بەشێکی زۆری کاتەکانی ژیانی لە (خانەی لە خۆ گرتن) و (شوێنی داڵدەدان) دا بە سەربردوە، لەبەر ئەوەش لە تەمەنێکی زوودا ڕووبەڕووی دەستدرێژی سێکسی بۆوە.

لە ساڵی (1934)دا نیشانە و هێماکانی (خەمۆکی مێشکی) لە (گلادیس)دا دەرکەوتن و ئاشکرابوون و لە (سەنتەرێکی چارەسەرکردنی شاری سانتامۆنیکا) خەوێندرا، بۆیە (گڕایس ماکی) هاوڕێی نزیکی دایکی، ئەرکی سەرپەرشتیکردن و بەخێوکردنی (مارلین)ی گرتە ئەستۆ، هەر ئەویش بوو کە حەز و ئارەزووی ناوبانگ و بوون بە ئەستێرەی لە دەروونی (مارلین) دا چاند و پێی گوت «دەتوانێت ببێتە ژنێکی گرینگ و کاریگەر، یاخود ئەستێرەیەکی دیاری سینەمای ئەمریکا».

(گرایس) یەکێک بوو لەو کەسانەی خۆشەویستییەکی زۆری بۆ (جین هارلۆ) هەبوو کە یەکێک بوو لە ژنە هونەرمەند و ئەستێرەکانی سالانی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو، بەو هۆیەشەوە (هارلۆ) بوە نموونەی بالا و زیندووی (مارلین).

(گرایس) لە سالی (1935)دا هاوسەرگیری کرد و بە هۆی خراپی دۆخی دارایی و ئابوورییەوە، نەیتوانی بەردەوام بێت لە سەرپەرشتیکردن و بەخێوکردنی (مارلین)، بۆیە لە نێوان (سێپتەمبەری سالی 1935 بۆ یۆلیۆی سالی 1937)، (مارلین)ی ناردە شوێنێکی تایبەت بە دالدەدانی مندالانی بێ دایک و باوک، بەلام (گرایس) بەردەوام بوو لە سەردانکردن و هەوالپرسینی (مارلین) و بردنی بۆ سینەما و کڕینی پۆشاک و دیاری بۆی.

لە بارەی ئەو ماوەیەی ژیانییەوە، (مارلین) دەلێت «هەموو دونیا لە چواردەوری مندا (مجتهم) بوو، هەستم دەکرد لە هەموو شتێک بچمە دەرەوە، بەلام دیاربوو خەونم دەبینی و یاریم دەکرد».

لە ناوەراستی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا، (مارلین) لە کارگەیەکی تایبەت بە دروستکردنی (پەڕەشووت) کاری دەکرد، بە هۆی جلوبەرگە نیمچە ڕووتەکەیەوە، سەرنجی زۆرینەی ئەو وێنەگر و ڕۆژنامەنووسانەی بە لای خۆیدا ڕادەکێشا، کە بۆ خستنەڕووی توانا و بەشداریکردنی ژنان لە پشتیوانییەکانی جەنگدا، سەردانی کارگەکەیان دەکرد.

لەو چوارچێوەیەشدا (مارلین) بە تەواوی سەرنجی (دیڤید کۆنۆفێر)ی بە لای خۆیدا ڕاکێشا و پێی وابوو خاوەنی ئەو جوانییە نموونەییەیە کە بە دوایدا دەگەڕا و یەکێک لە ئاژانسەکانیش گرێبەستیان لەگەڵ کرد و وێنەکەیان وەک (کچی بەرگی گۆڤار) بلاو کردەوە.

له بەهاری ساڵی (1945)دا (مارلین) بوە کەسێکی ناسراو، لە ساڵی (1946)دا، (بن لیۆن) کە کاری بۆ کۆمپانیای (فۆکس) دەکرد، تواناکانی (مارلین)ی ئاشکراکرد و دوای سەرکەوتنی لە تاقیکردنەوەی بەردەم کامێرادا، (کۆمپانیای فۆکس) گرێبەستێکی لەگەڵ (مارلین) ئیمزاکرد بۆ ماوەی شەش مانگ و  بە کرێی مانگانەی (75 دۆلار)، کە دواتر زیادکرا بۆ (125) دۆلار.

لەو گرێبەستەدا بە ناوی (مارلین مۆنرۆ) خۆی ناساند، (مۆنرۆ) بوە نازناوی خانەوادەی دایکی، (مارلین) بە هەموو شێوەیەک ئامادەبوو بۆ دەستکردن بە کارە هونەرییەکانی، لەبەر ئەوە کەوتە خوێندنەوە و فێربوونی کاری ژنە هونەرمەندە ئەفسانەکان، لە دیارترینیشیان (جین هارلۆ) و (لانا ترنەر)، لە یەکێک لە خوێندنگە هونەرییەکانیش لە بەشی هونەری شانۆ ناوی خۆی تۆمارکرد و دەستیکرد بە خوێندن، ئیتر لەو کاتەوە (نۆرما جین) بە (مارلین مۆنرۆ) ناسراو و گوێی بۆ ئەو ئامۆژگارییە گرت کە دەڵێت «هۆلیۆد ئەو شوێنەیە کە لە بەرانبەر یەک ماچ دا هەزار دۆلارت دەدەنێ».

لە ساڵی یەکەمی کارکردنیدا لەگەڵ کۆمپانیای (فۆکس)، (مارلین) هیچ ڕۆڵێکی نواندنی نەبوو، بەڵام ڕاهێنانی دەکرد لە سەر خوێندنەوەی شیعر و فێربوونی زمان و نواندن و هەموو شەو شتانەی تریش کە پێویستە بیانزانێت، لەگەڵ نوێکردنەوەی گرێبەستەکەیشدا و لە شەش مانگی دوەمیدا هەندێک ڕۆڵی سادە و لاوەکی لە چەند فیلمێکدا هەبوو.

لەو ماوەیەشدا چەند پێوەندییەکی لە ناو (هۆلیود)دا دروستکرد و توانی مارکیتینێکی باش بۆ خۆی بکات و ساڵی (1948) لەگەڵ کومپانیای (کۆلۆمبیا) دا گرێبەستێکی ئیمزاکرد لە بەرانبەر پێدانی ڕۆڵێک دا لە فیلمی (خانمانی جوق).

بەڵام کۆمپانیاکە گرێبەستی کارکردنی بۆ (مارلین مۆنرۆ) نوێ نەکردەوە، بۆیە لە ڕێگەی (جونی هید)ەوە کە یەکێک بوو لە گەورە بریکارەکانی (هۆلیود)، جارێکی تر (مارلین مۆنرۆ) گەڕایەوە بۆ کارکردن لە کۆمپانیای (فۆکس)، ئەگەرچی لە سەرەتادا (داریل ئێف. زانک)، سەرۆکی ستدیۆکانی کۆمپانیاکە لەو باوەڕەدا نەبوو (مارلین) ببێتە ئەستێرەیەکی هۆلیود، بەڵام دواتر بۆچوونەکەی گۆڕا.

ساڵی (1951) ساڵی دەرکەوتن و بە ئەستێرەبوونی (مارلین مۆنرۆ) بوو، جەماوەر بەو جۆرە خۆشیان دەویست کە کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان پێشکەشییان دەکرد و پیشانیان دەدا، لە ساڵی (1952)دا لە فیلمی (گرینگی بە لێدان مەدە)، ڕۆڵی بەخێوکاری ئەو منداڵانەی دەبینی کە ئاستی ژیرییان هاوسەنگ و تەواو نییە، هەر چەندە ڕەخنەگرانی سینەمایی گرینگییەکی ئەوتۆیان بە کارەکەی نەدا، بەڵام توانی کاریگەرییەکی باش لە سەر جەماوەرەکەی دروست بکات، بە تایبەتی بە هۆی ئەو جەستە و ڕوخسارە جوانەوە کە هەیبوو، جەماوەرەکەی زۆریان خۆش دەویست.

لە فیلمی (تاڤگەکانی نیاگارا)دا، نموونەیەکی هونەری و هێمایەکی جوانی تایبەت بە خۆی بونیادنا، دواتر لە فیلمێکی تردا بە ناونیشانی (پیاوە بەڕێزەکان کچە قژ زەردەکانیان پێ باشترە)، قۆناغی بوون بە ئەستێرەی (مارلین مۆنرۆ) بە تەواوی گەشایەوە و گەیشتە ترۆپک، ناو و دەست و قاچی لە قاڵبێکی چیمەنتۆدا لە بەردەم هۆڵی شانۆیی چینی و لە سەر شەقامی هۆڵیود دانراو بەوەش بە ڕەسمی بوە ئەستێرەیەکی هۆڵیود، ئەو شوێنەی ناوەکەی لێ دانرا، بە منداڵی (مارلین) لەگەڵ

دایکیدا سەردانی کردبوو، ئاواتی منداڵییەکەشی هاتەدی کە دەیگوت «زیاتر لە هەر شتێکی تر دەمەوێت ببمە ئەستێرەیەکی سینەمایی».

ئیتر (مارلین مۆنرۆ) بوە کارتێکی براوە، بە تایبەتی لەگەڵ ئەو سەرکەوتنەیدا کە لە فیلمی (چۆن هاوسەرگیری لەگەڵ ملیۆنێرێکدا دەکەیت) لە ساڵی (1953) دا بە دەستی هێنا، لەو فیلمەدا زۆرینەی ئەو ئەکتەرانەی ڕۆڵیان هەبوو، ڕووبەڕووی ڕەخنە و هەڵسەنگاندن بوونەوە، بەڵام (مارلین مۆنرۆ) توانی جەماوەر و بینەرێکی زۆر بە تایبەتی پیاوان بۆ خۆی مسۆگەر بکات و ڕابکێشێت.

هەر چەندە (ئەستێرە)ی (مارلین مۆنرۆ) تا دەهات هەڵدەکشا، بەڵام ئەوەش توشی جۆرێک لە بێ تاقەتی و بێزاری کردبوو، زۆرجار دەیگوت «ناوبانگ دەبێتە هۆی وروژاندن و زیادکردنی ئیرەیی، بـەڵام جۆرێک لە تایبەتمەندییەتت پێ دەبەخشێت، بەوەی خەڵک بەرەو ڕووت دێن و هەندێک قسەت بۆ دەکەن کە هەستوسۆزت بریندار ناکەن»، هەروەها دەشڵێت «ناوبانگ شتێکی هەڵگەڕاوەیە، زیان و سوود و باجی هەیە». زیادبوونی ئـەو کرێیەی (مارلین مۆنرۆ) لە بەرانبەر کارەکانیدا وەری دەگرت، هەروەها ئەو بڕە پارەیەی لە سەرەتای کارکردنییەوە تا کاتی مردنەکەی کۆی کردبۆوە، ئاماژەیەکی ڕوونە بۆ هەڵکشانی ئەستێرەی بەختی و پێشبڕکێی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنان بۆ ئەنجامدانی گرێبەست و کاری هاوبەش.

(ساڵی 1950 لە فیلمی جەنگەڵی ، 1050 دۆلار)، (ساڵی 1950 لە فیلمی هەموو شتێک سـەبـارەت بە حـەوا، 500 دۆلار)، (ساڵی 1952 لە فیلمی ئێمە هاوسەرگیرمان نەکردوە،

750 دۆلار)، (ساڵی 1953 لە فیلمی پیاوە بەڕێزەکان کچە قژ زەردەکان بە باشتر دەزانن، 1250 دۆلار)، (لە فیلمی هەندێک کەس دەیانەوێت گەرم بێت، 200 دۆلار، هەروەها لە سەدا 10ی داهاتی فیلمەکە کە چوار ملیۆن دیناربوو، (ساڵی 1961 لە فیلمی نەگونجاو 250 هەزار دۆلاری وەرگرت)، (ساڵی 1962 لە فیلمی هەندێک شت دەدرێت، کە کاری وێنەگرتنەکەی تەواو نەکرد بەڵام (100) هەزار دۆلاری لە سەر وەرگرت).

لە ساڵی (1949) (مارلین مۆنرۆ) لە بەرانبەر (50 دۆلار) دا، بە ڕووتی لە سەر لاپەڕەی ڕۆژنامەیەک دەرکەوت، سەبارەت بەو وێنەیەش گوتی (پێویستم بەوەبوو کرێی شوێنی مانەوەکەم بدەم و برسیم بوو، هەموو ئەوەی من کردوومە تەنها خەوتنم بوو لە سەر پارچەیەک قوماشی سور لە بەرانبەر شەپۆلێکی هـەوادا، گوناهی من ئەوە بوە پێویستم بە 50 دۆلار بوو بۆ ئۆتۆمبێلەکەم).

ئـەو وێنە ڕووتـەی (مارلین مۆنرۆ) لە لایـەن (تۆم کیلی) فۆتۆگرافەرەوە و گیراو لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو کرایەوە و لە ژێریدا نووسرابوو (خەونەکانی خاتوونە ئاڵتونییەکە)، هیچ کەسێکیش نەیدەزانی ئەوە (مارلین مۆنرۆ)یە، بەڵام لە ساڵی (1952)دا (بلاک میلەر) هەڕەشەی ئەوەی کرد کە ئەو ئابڕووچوونە بڵاو دەکاتەوە، بەڵام (مارلین) ژیرانە ئەو پیلانەی هەڵوەشاندەوە، ئـەوەش بە بـڵاو کـردنـەوەی لایـەنـە ڕاستییەکەی وێنەکە و کڕینەوەی مافی موڵکدارێتی وێنەکە بە (500 دۆلار).

ساڵی (1953) وێنەی (مارلین مـۆنـرۆ) لە سـەر بەرگی گۆڤاری (پلەی بۆی) دەرکەوت، ئەو دەرکەوتنەش وەک جۆرێک بوو لە نمایشکردنی ژنێتی و مێینەیی، کە (مارلین) نوێنەرایەتی

دەکرد و هەموو سیفاتەکانی تێدابوو، هەروەها ئەو مارکەیەشی کە کۆمپانیاکە دروستی کردبوو، لە ڕێگەی (مارلین)ەوە زیاتر ناسراو زیاتر بڵاو بۆوە. لەوبارەیەشەوە (مارلین) ڕای گەیاند» دەمەوێت هونەرمەند بم نەک حەزێکی سێکسی، نامەوێت بفرۆشرێم بە جەماوەر، خەڵک وەک ژن سەیرم دەکەن نەک وەک مرۆڤ، ئەوان من نابینن، بەڵام باوەڕە ناڕاستەکەی خۆیان دەبینن، سەرەڕای ئەوە، باوەڕیان بە خۆیان هێناوە کە بە تەنها من ناڕاستگۆترین کەسم».

(مارلین مۆنرۆ) سێ جار هاوسەرگیری کردوە، هاوسەرگیری یەکەمی ساڵی (1942) بوو لەگەڵ گەنجێکدا بە ناوی (جیم دوگریتی) کە پێنج ساڵ لەو گەورەتر بوو.

ساڵی (1952)، (مارلین مۆنرۆ) کە تەمەنی (37) ساڵ بوو، چاوی کەوت بە (جودی ماگۆ)ی تەمەن (25) ساڵ، (جودی ماگۆ) کە یاریزانی (بیسبۆڵ) بوو، وازی لە یاریکردن هێنا و تەنها سەرقاڵ بوو بە دیدار و سەردانکردن و بینینی (مارلین)ەوە کە ئەستێرەیەکی دیار و بە ناوبانگ بوو، لە (14)ی شوباتیشدا هاوسەرگیرییان کرد و هەواڵی هاوسەرگیرییەکەشیان، بوە مانشێتی سەرەکی هەموو ڕۆژنامە و گۆڤار و کەناڵە میدیاییەکان.

بەڵام (جودی ماگۆ) ئیرەییەکی زۆری هەبوو، بێزاربوو لەو جەماوەرە زۆرەی کە هاوسەرەکەی هەیبوو، زیاتر حەزی دەکرد (مارلین)ی هاوسەری تەنها ژنیماڵەوە بێت. تا دەهات کێشە و ناکۆکییەکانیان لە سەر ئەو بابەتە زیادی دەکرد، بە تایبەتی کە (مارلین) سووربوو لە سەر ئەنجام دانی گەشتێک بۆ کوریا، بە مەبەستی بە سەرکردنەوەی هێزەکانی وڵاتەکەی لەو ناوچەیە، ئەو گەشتە و ئەو بە سەرکردنەوەیە یەکێک بوو لە هۆکارەکانی

دەرکەوتن و گەشانەوەی زیاتری ئەستێرەی (مارلین) و زۆرینەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش وێنەی ئەو سەردانەیان بڵاو کردەوە و بایەخێکی زۆریشیان پێدا. بەڵام (جودی) هاوسەری لەو گەشتەیدا هاوڕێیەتی نەکرد، بە بیانووی ئەوەی ڕقی لە شوێنی قەرەباڵغە، بە هۆی بەردەوامی ناکۆکییەکانیشییانەوە لە تشرینی یەکەمی ساڵی (1954) دا، ( مارلین) و (جودی) جیا بوونەوە، لە سەرەتای ساڵی (1955)یشدا، (مارلین) و (ئارسەر میلەر)ی نووسەری شانۆیی یەکتریان ناسی و بە شێوەیەکی زۆر خێرا هاوسەرگیرییان کرد و ساڵی (1961)یش لە یەکتر جیا بوونەوە.

لە ساڵی (1958)دا (مارلین) بەشداری کرد لە فیلمی (هەندێک کەس پێیان باشە گەرم بێت) لەگەڵ هونەرمەندان (جاک لیمۆن) و (تۆنی کیرتیس)، بەڵام باری تەندروستی تا دەهات ناجێگر و خراپ دەبوو، بە هۆی بەردەوامبوونی لە بە کار هێنان و خواردنی هێورکەرەوەدا، بەو هۆیەشەوە زۆر جار لە کاتی وێنەگرتنەکان دوا دەکەوت یاخود ڕۆڵەکەی خۆی بیر دەچۆوە.

ساڵی (1962) (مارلین مۆنرۆ) دەستیکرد بە وێنەگرتن لە فیلمی (هەندێک شت دەدرێت)، هەندێک قسە و قسەڵۆکیش بڵاو بۆوە کە گوایە (مارلین) حەزی نەدەکرد چاوی بە ستافی فیلمەکە بکەوێت و بچێت بۆ (نیویۆرک)، بە مەبەستی بەشداریکردن لە جەژنی لە دایک بوونی (جۆن کەنەدی) سەرۆکی ئەو کاتەی (USA).

بە ڕاستیش تا دەهات باری تەندروستی خراپتر دەبوو، دواتریش پزیشکەکان شاهیدی ئەوەیان بۆ دا، جگە لەوەش گەشتەکەی بۆ (نیویۆرک) بە ڕەزامەندی کۆمپانیای (فۆکس

بۆ بەرهەمهێنانی فیلم) بوو، کۆمپانیاکەش لە دۆخێکی دارایی زۆر خراپدابوو، بە هۆی فیلمی (کیلۆباترا)وە کە (ئەلیزابێس تایلۆر) و (ڕیچارد بیرتن) ڕۆڵیان تێدا دەبینی، کەوتبۆ ژێر باری قەرزێکی زۆرەوە و بە ناچاری بڕیاریاندا بە ڕاگرتنی کارەکانی بەرهەمهێنانی فیلمەکەی (مارلین مۆنرۆ)، بە ئومێدی قەرەبووکردنەوەی زیانەکان لە لایەن کۆمپانیای دڵنیاییەوە بە هۆی نەخۆشکەوتنی (مارلین)ەوە.

لەو ماوەیەدا (مارلین مۆنرۆ) و (جودی ماگۆ)ی هاوسەری پێشووتری بە زۆری یەکتریان دەبینی و ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی دووبارە هاوسەرگیری بکەنەوە و تەناتەت (8ی ئابی 1962)شیان وەک ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەیان دەستنیشانکرد، ئەگەرچی کۆمپانیای (فۆکس) سەر لە نوێ گرێبەستی لەگەڵ (مارلین) کردەوە بۆ تەواوکردنی فیلمی (هەندێک شت دەدرێت) لەگەڵ مووچەیەکدا بە بڕی (250) هەزار دۆلار، بەڵام نە وێنەگرتن و بەرهەمهێنانی فیلمەکە تەواو کرا، نە هاوسەرگیرییەکەشیان کرد، بە هۆی مردنەکەی (مارلین مۆنرۆ)وە لە (4)ی ئابی (1962)، ئەو مردنەی تا ئێستاش بە گومانەوە سەیر دەکرێت و دەنگۆی ئەوەش هەیە چەند کەسێک دەستیان تێیدا هەبێت و لەو مردنەوە گلابێتن.

(مارلین مۆنرۆ) تا لە ژیاندا بوو، هەموو سەرنج و چاوەکانی بۆ خۆی ڕاکێشابوو، دوای مردنەکەشی هەموانی بە خۆیەوە سەرقاڵکرد و چەندین شیکردنەوە و سیناریۆی جیاواز بۆ مردنی (مارلینی ئەفسانە) دەکرا، چیرۆکە نوێیەکەی «ڕووداوەکانی دوو ساڵی کۆتایی لە ژیانی مارلین مۆنرۆ»ی چیرۆکنووس و دەروونناسی فەرەنسی (میشێل شنایدەر)، یەکەم هەوڵ بوو بۆ

سەر لە نوێ وێناکردنەوەی شێوەی ئەفسانە خۆشەویستەکەی هۆلیود لە ڕوانگەی شیکردنەوەی دەروونییەوە.

دیارترین ڕەگەزی سەرنج ڕاکێشەر لە چیرۆکەکەی (شنایدەر)دا، کە تێکەڵەیەکە لە خەیاڵ و ڕاستی، بریتییە لە زیندووکردنەوەی (مارلین) و (گرینسۆن)، ئەوەش لە ڕێگەی کەسایەتی ڕاستەقینە و ڕووداو و نامە و چاوپێکەوتن و تۆمارە دەنگییەکانەوە.

(شنایدەر) لەو چیرۆکە چێژبەخشەیدا کە لە لایەن (دەزگای فجوارای ئیسپانی)یەوە چاپ و بڵاو کرایەوە، بایەخێکی زۆری دابوو بەو دانیشتنی چارەسەرانەی (مارلین مۆنرۆ) کە لە (یەنایەری ساڵی 1960) بۆ (4ی ئۆگەستی ساڵی 1962)، لە سەر دەستی دیارترین پزیشکی دەروونی هۆلیۆد (ڕاڵف گرینسۆن) وەری دەگرت.

ئەو چیرۆکە کە بە زمانی ئیسپانی بڵاو کرایەوە و تەلەڤزیۆنی ئیسپانیاش بانگەشەیەکی باشی بۆ کرد، دەیەوێت پێوەندی ئەو پزیشکە بە مردنی (مارلین مۆنرۆ) بدۆزێتەوە، هەروەها دەشیەوێت بزانێت بۆچی زۆرینەی ژنە هونەرمەندە جوان و شۆخ و شەنگ و بە ناوبانگەکانی جیهان ئومێدیان بە مردن خواستوە.

لە چوارچێوەی چاپ و بڵاو کردنەوەی دەیان کتێبدا کە تایبەت بوون بە ژیان و بەرهەمەکانی (مارلین مۆنرۆ)، کتێبێکی نوێی خوشەکەزایەکی (لویس دیماجیۆ)ی هاوسەری پێشووی (مارلین) بە ناونیشانی (مارلین و جۆ و من) بڵاو کرایەوە و تێیدا بە شێوەیەکی ڕەسمی دەنگۆی خۆکوشتنی (مارلین مۆنرۆ)ی ڕەت کردەوە و تەئکیدیشیکردۆتەوە لەوەی (مارلین) لە میانەی

پێوەندییەکی تەلەفۆنیدا کوژراوە و لە کاتی قسەکردنەکەشیدا ناوی بکوژەکەی بەو کەسە گوتوە کە بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ دەکرد.

وەک نووسەری ئەو کتێبە دەڵێت، (مارلین) بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ (لویس دیماجیۆ)ی دایکی (جۆ) دەکرد، کاتێک دوو بکوژەکە چوونە سەر ماڵەکەی، (جۆن) لە کتێبەکەیدا باسی لەوەشکردوە لە کاتی تەلەفۆنەکەدا دایکی هەستی بە ترس و شڵەژانێکی زۆر کردوە و گوێی لە هاواروقیژەی (مارلین) بوە پێش ئەوەی بە تەواوی بی کوژن.

هەروەها (جۆن) بەم جۆرە وردەکاریی ئەو ڕووداوە دەگێڕێتەوە کە دایکی گوێی لێ بوە «مارلین لە ترسدا دەسکی تەلەفۆنەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە، بەڵام دوو بکوژەکە تەلەفۆنەکەیان دانەخستەوە»، دەشڵێت دایکی پێی گوتوە «گوێی لە هەموو بەشەکانی تاوانەکە بوە، لە چوونە ژوورەوەی بکوژەکان و بەرگرییەکانی (مارلین)ەوە تا بێ دەنگییەکەی کۆتایی، وەک ڕاگەیاندنی کوشتنی هونەرمەندێکی ناوبانگ ونبوو وابوو»، لە کاتێکدا بە ڕەسمی وا ڕاگەیەندرا کە «مارلین، بە هۆی زیاد بە کار هێنانی دەرمانی خەو و هێورکەرەوەوە گیانی لە دەستداوە».

نووسەری کتێبەکە، تێبینی ئەوەشی کردوە هەموو گێڕانەوەکانی دایکی هاوتەریبە لەگەڵ شوێنی تاوانەکە، وەک ئەوەی دەسکی تەلەفۆنەکە لە شوێنێکی دووری ئامێری تەلەفۆنەکە فڕێدرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا دایکی (جۆن) دەترسا لەوەی زانیاری بداتە پۆلیس و ناوی بکوژەکەی (مارلین) ئاشکرا بکات و بڵاوی بکاتەوە، بەڵام دواتر ئاشکرای کرد ئەو کەسەی

له پشت ئەو تاوانی کوشتنەوەیە ناوی (سام جیانکاکا)یە، کە یەکێکە لە مافیا تاوانکارەکان و یەکێکیش بوو لە خۆشەویست و سەرسامەکانی (مارلین مۆنرۆ).

هەروەها (ماری جین بۆب) باسی لەوەکردوە (ئالان فایی)، کە یەکێک بوو لە تەکنیک کارەکانی هۆلیود لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا، پێی گوتوە (جیانکاکا پیلانی بۆ کوشتنی مارلین مۆنرۆ داناوە). هەروەها گوتوشیەتی (جیانکاکا فەرمانی کردوە بە (زاغای) کە یەکێک بوو لە ئەندامە دیارەکانی باندە مافیاکەی و هاوڕێیەکی تری کە مارلین مۆنرۆ بکوژن و ئەو پەڕتووکەشی بۆ بهێنن کە تۆماری ڕۆژانەی تێدا نووسیوەتەوە).

ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێک لە چاودێریکردنی هاتوچۆ و کاری ڕۆتینییەکانی ئێوارانی، توانیان (مارلین) بکوژن، نووسەری ئەو کتێبە دەڵێت «مارلین پێکێک یان دوو پێکی دەخواردەوە و دواتر لە سەر جێگەی خەوەکەی ڕادەکشا و تا ئەو کاتەی خەوی لێ دەکەوت سەیری تەلەڤزیۆنی دەکرد».

(ئالان فایی) ئەوەشی درکاندوە بکوژەکان بڕیاریاندابوو چیرۆکی کوشتنەکە بە جۆرێک بێت وەک ڕووداوێکی خۆکوژیی دەربکەوێت، پێشتر کلیلی دەرگای ماڵەکەیان کۆپی کردبوو، بۆیە بە ئاسانی چوونە ژوورەوە و وەک پێشبینیان کردبوو لە سەر سیسەمەکە ڕاکشابوو.

(جۆن) لە سەر زاری (ئالان فایی)یەوە دەیگێڕێتەوە «پێش ئەوەی بکوژەکان هیچ شتێک بکەن، بە تەواوی (مارلین)یان کۆنترۆڵ کرد و دواتر (زاغای) دەرزییەکی ژەهراوی کردە کۆمییەوە، پێی وتبوون ئەو جۆرە لە ژەهراویکردن دەرناکەوێت و ئاشکرانابێت تەنها بە توێکاری جەستە نەبێت، بەپێی قسەکانی

(زاغـای)، (مارلین) چەند خوولەکێک بەرگری کردوە و دواتر هێوربۆتەوە و پاشان لە هەناسەدان کەوتوە و هەموو شتێکیش بە بێ دەنگی ئەنجام درا.

دۆزینـەوەی ئـەو پـەڕتووکـەی کە (مارلین) تێبینییەکانی ڕۆژانەی خۆی تێدا دەنووسی کاتێکی زۆری نەویست، چونکە لە سەر سیسەمی خەوەکەی دانرابوو، بکوژەکان ماوەیەکی زۆر لە ماڵەکەدا نەماونەتەوە و بە پەلە چوونەتە دەرەوە، دەرگای دەرەوەی ماڵەکەشیان داخستۆتەوە و هیچ بەڵگەیەکی تاوانەکەشیان لە دوای خۆیان بە جێ نەهێشت تا ئاماژەبێت بۆ چوونە سەر ماڵەکە.

جۆن هەموو ئەو دەنگۆیانەش ڕەت دەکاتەوە کە باس لە خۆکوشتنی (مارلین) دەکەن و دەڵێت، ئەو ئێوارەیەی (مارلین)ی تێدا مرد، پێکەوە نانی ئێوارەیان خواردوە و لایەنی مەعنەوی و دەروونیشی زۆر باش و بەرز بوو.

ئـەوەی لێرەدا جێی نیگەرانی و دڵتەنگی زۆری (جۆ) بوو ئەوەبوو کە (مارلین) ڕازی بوو بەوەی سەر لە نوێ هاوسەرگیری لەگەڵ بکاتەوە، بەڵام لەو ڕۆژەدا کە بڕیاربوو هاوسەرگیری بکەنەوە، تەرمەکەی (مارلین)ی تێدا بە خاک سپێردرا.

(جۆن) لە کتێبەکەیدا باسی لەوەشکردوە لەگەڵ (جۆ)ی برایدا تکایەکی زۆریان لە دایکی کردوە تا ناوی بکوژەکەی (مارلین) یان پێ بڵێت، بەڵام هەر ڕازی نەبوە بە بیانووی ئەوەی ئەگەر ناوەکەی ئاشکرا بکات، ئەوا ئەندامانی خێزانەکەی ڕووبەرووی هەڕەشەی کوشتن دەبنەوە.

هەروەها (دەزگای هەواڵگری ئەمریکا)ش، شکستی هێنا لەوەی (لویس) ناچار بکات تا ئەو شتانە باس بکات کە لە پێوەندییە

تەلەفۆنیەکەدا لەگەڵ (مارلین) باسیان کردوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی (نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمریکا) ژمارەی تەلەفۆنەکەی (لویس)یان لە سەر لیستی دوایین پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی (مارلین) دۆزییەوە.

(جۆن) دەڵێت، ئێستاش هەمان پرسیار دووبارە دەکەمەوە، بە دەر لە هەموو ئەو زانیارییانەی هەیە، ئایا تا ئێستاش خەڵک بڕوایان بەوە هەیە (مارلین) خۆی کوشتبێت؟ من دەزانم و بڕوای تەواوم هەیە بەوەی خۆی نەکوشتوە، بەڵکوو کوژراوە، من هیچ گومانێکم لە سەر ئەوە نییە.

# (14)

# مەلیك فارووق...
# خۆشەویستی بە كۆمەڵ
# حەزە سێكسییەكانیش بەش ناكات

مەلیک فارووقی میسر، وەک دوایین پادشای خانەوادەی (محەمەد عەلی پادشا)، لە ژیانیدا هەمیشە بە شوێن حەزو ئارەزووە سێکسییەکانییەوە بوو، تەنانەت هەندێک کەس دەڵێن بە هۆی ئەو ئارەزوویانەیەوە لە تەختی پادشایەتی لابرا.

(شا فارووق)، پێوەندییەکی سێکسی یاساغ و ڕێگەپێنەدراوی هەبوو لەگەڵ (شازادە فاتمە تۆسۆن)ی هاوسەری (میر حەسەن تۆسۆن)ی ئامۆزای، بە تایبەتی لە کۆشکەکەی خۆی لە سەر ڕووباری نیل.

دواتر چەند پێوەندییەکی تری سێکسی دروستکرد لەگەڵ (ئارین جونل) کە بێوەژنێکی جوو بوو، هەروەها (باربارا سکیلتۆن)ی بەریتانی و چەند ژنێکی تریش، بەڵام زیاتر ئەم دوو کەسە ناویان دەبراو زانراوبوون.

(ئەنتۆنی پۆلی)، خواردن و خەو و پشووی نەبوو، جگە لە گەڕان و سەردانکردنی یانەکانی شەوانە لە قاهیرە و ئەسکەندەرییە، بۆ ئەوەی ئەو ژنانە بدۆزێتەوە کە سیفاتەکانی (مەلیک فارووق)یان تێدایە و بیانبات بۆی، (ئەنتۆنی پۆلی) شوێنێک و کوچە و کۆڵانێکی میسر نەما، سەری پێدا نەکردبێت و نەگەڕابێت بۆ ئەو ژن و کچانەی (مەلیک فارووق) حەزی لێیان بوو، تەنانەت بە ماڵ و شوێنەکانی لەشفرۆشیشەوە، ئەمەش تەنها بۆ ڕازیکردن و دڵنەوایکردنی پادشا و هاوڕێکەی، ئەو ڕازیبوونەوەی هاوشێوەی پارچەیەک زێڕبوو لە بەرانبەر ڕازیبوونی پادشا لە سەر ئەو مێینانەی (پۆلی) دەیدۆزینەوە و بۆی دەبرد.

(مەلیک فارووق) حەزی دەکرد موڵکداریێتی هەموو جۆرە ژنێک بکات، هاوشێوەی کۆکردنەوە و هەڵگرتنی هەندێک

شت له شووشەی بە تاڵی کۆکاکۆلادا، وەک دراو و پارچەی شوێنەواریی دێرینی میسری و کارە هونەرییەکانی ئەورووپا، (مەلیک فارووق) ئارەزوویەکی توند و شێلگیرانەی هەبوو بۆ تاقیکردنەوەی هەموو کەسێک و هەموو شتێک، هەڵبەت ژنە سەماکارە ڕۆژهەلاتییەکانیش، بەشێک بوون لەو ژنانەی (مەلیک فارووق) خۆشی دەویستن و حەزی لێیان بوو (تەحیە کاریۆکا، سامیە جەمال، حکمەت فەهمی).

هەروەها هەندێک ژنی جووش هەبوون وەک (هیلین میسوری)، کە هاوڕێی نزیکی (مەلیک فارووق) بوون و زۆرینەی کاتەکان بە تەلەفۆن قسەیان دەکرد و تەنانەت هەندێک جاریش لە درەنگانێکی شەودا تەلەفۆنی بۆ دەکرد و داوای لێ دەکرد کە ئاهەنگێکی شەوانە و یاری قومار ڕێک بخات.

(ئەرین)ی جوو، یەکێکی تربوو لە دۆست و خۆشەویستەکانی (مەلیک فارووق)، کاتێک لێی جیا بۆوە تا هاوسەرگیری لەگەڵ ئەفسەرێکی سوپای بەریتانیادا بکات، (مەلیک فارووق) هەڕەشەی لە (ئارین) کرد کە جەنگێکی گەورە لە دژی جووەکان بەرپا دەکات ئەگەر لێی جیابێتەوە و هاوسەرگیری بکات.

ئەم ئاڵۆزییە بەردەوام بوو، تا بە ناسینی سەماکار و گۆرانیبێژی جوو، (لیلیان کۆهین) یان (کامیلیا)، (مەلیک فارووق) توانی بە تەواوی (ئارین) لە بیر بکات و خۆی بۆ پێوەندییە نوێیەکەی تەرخان بکات، کە لە کۆشک و تەلارەکانی تایبەت بە گۆرانی و سەمای فۆلکلۆری جوودا، سەمای بۆ (مەلیک فارووق) دەکرد و گۆرانی بۆ دەگوت.

حەز و چڵێسی ئارەزووەکانی (مەلیک فارووق)، سنووری وڵاتەکەی تێپەڕاند و لە میسرەوە گەیشتە ئەورووپا، بە تایبەتی

لەو گەشتە شاهانەیەیدا کە نزیکەی (13) هەفتەی خایاند و نزیکەی (شەست) کەسیش هاوڕێیەتی دەکرد، زۆرینەی کاتەکانی لە ناو یەخت و ئۆتۆمبێلی کادیلاک و سەر مێزی قومارخانەکان و بەتاڵکردنەوەی حەزە سێکسییەکانی بە سەر دەبرد.

جارێکیان (یستدرک) باسی لەوەکردوە (ئەو بوومەلەرزە سیاسییەی لامبسۆنی نێردراوی تایبەتی بەریتانیا بۆ میسر لە (4)ی فێبرایەردا توشی مەلیک فارووقی کرد)، هەروەها ئەو (ئابڕووچوونەی –نازلی- دایکی مەلیک فارووق بە هۆی ئەو پێوەندییە سێکسییەی لەگەڵ -ئەحمەد حەسانەین-ی مامۆستای دا هەی بوو)، جگە لەوەی کە (نەیتوانی هیچ منداڵێکی کوڕی ببێت تا ببێتە جێگرەوە و جێنشینی دەسەڵاتەکەی)، هۆکاربوون بۆ ئەوەی (مەلیک فارووق)، هیچ شتێکی بە لاوە گرینگ نەبێت و تەنها چێژوحەزەکانی خۆی نەبێت، هەروەها هەستکردنی بە لاوازیی تەختی پادشایەتییەکەی، هۆکاربوو بۆ نائومێدبوونی و بێ هیوایی لەوەی کە سبەینێ ڕووی دەدا.

(لیلیان کۆهین)ی هونەرمەندی جوو، بوە بە ناوبانگترین و دیارترین خۆشەویستەکانی (مەلیک فارووق)، ئەوەش بە هۆی ناوبانگە سینەماییەکەی و جوانییە سەرنج ڕاکشەکەیەوە، بەڵام ئەوەی گرینگە باس بکرێت کۆتاییە کارەساتبارەکەی بوو، کە پەنجەی تاوان بۆ (مەلیک فارووق) ڕابکێشرێت وەک ئەگەری ئەنجام دانی تاوانی کوشتنەکە.

لێرەدا کەمێک هەڵوەستە دەکەین و قسەی زیاتر لە سەر (لیلیان) دەکەین..

ئایا (لیلیان) یاخود (کامیلیا) کێیە بە تـەواوی؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە تا ئێستاش لە ناو میسرو وڵاتانی عەرەبی و

تەنانەت ئیسرائیلیشدا هەر دەکرێت و بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێن، بەڵام تا ئێستا هیچ کەسێک نەیتوانیوە وەڵامێکی دروست و تەواوەتی بۆ ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو هونەرمەندەی لە ژیانیدا ڕووبەڕووی چەندین قسەوقسەڵۆک و باس کردن بۆوە، مردنەکەشی بە هەمان شێوە بوە هۆی مشتومڕێکی زۆر و کۆمەڵێک قسەی دژ بە یەکی بە دوای خۆیدا هێنا، ڕووداوی گیان لە دەست دانی (لیلیان) بە هۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەیەوە، بوە هۆی دروستبوونی گومانێکی زۆر بەوەی ئەو ڕووداوە دەستکرد و پیلان بۆ دارێژراو بوە و مەبەستیش لێی لە ناوبردنی یەک جارەکی بوە بۆ یەکلاییکردنەوە و پاکتاوکردنی ململانێکان.

بەم جۆرە کۆمەڵێک ئاماژە و هێمای سەرسوڕمان، ڕووبەڕووی ئەو شۆخ و شەنگەی سەردەمەکەی خۆی بۆوە، ئیتر لە ژیانیدا بوو بێت یاخود بە هۆی مردنە نادیار و گوماناوییەکەیەوە بێت، بە هەمان شێوەش هێمای پرسیار و گومان، بە سەر شووناس و ناسنامەی بکوژەکەیەوە هەیە.

ئەو ژنە جووە، توانی سنوورەکانی کۆمەڵگەی میسری و عەرەبی تێک بشکێنێت و بگاتە لوتکە و بچێتە ناو کۆشکەکانی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتداریێتی ئەو وڵاتەوە، جگە لەوەش لە یەک کاتدا پێوەندییەکی ڕۆمانسی و سێکسی لەگەڵ (مەلیک فارووق) و ژمارەیەک لە کەسە دیارەکانی نێو کۆمەڵگەی میسری و وڵاتانی عەرەبیدا دروست بکات، ناوەکەشی پەیوەستکراوە بە چەند چیرۆکێکی سیخوڕی و هەواڵگری بۆ ئیسرائیل و کارکردن بۆ دەزگا هەواڵگرییەکەی (ئیسرائیل)، ئەمە جگە لەوەی هەر ڕۆژە، ڕۆژنامە و میدیاکانی میسر و وڵاتانی عەرەبی نهێنی و

لەو گەشتە شاهانەیەیدا کە نزیکەی (13) هەفتەی خایاند و نزیکەی (شەست) کەسیش هاوڕێیەتی دەکرد، زۆرینەی کاتەکانی لە ناو یەخت و ئۆتۆمبێلی کادیلاک و سەر مێزی قومارخانەکان و بەتاڵکردنەوەی حەزە سێکسییەکانی بە سەر دەبرد.

جارێکیان (یستدرک) باسی لەوەکردوە (ئەو بوومەلەرزە سیاسییەی لامبسۆنی نێردراوی تایبەتی بەریتانیا بۆ میسر لە (4)ی فێبرایەردا توشی مەلیک فارووقی کرد)، هەروەها ئەو (ئابڕووچوونەی -نازلی- دایکی مەلیک فارووق بە هۆی ئەو پێوەندییە سێکسییەی لەگەڵ -ئەحمەد حەسانەین-ی مامۆستای دا هەی بوو)، جگە لەوەی کە (نەیتوانی هیچ منداڵێکی کوڕی ببێت تا ببێتە جێگرەوە و جێنشینی دەسەلاتەکەی)، هۆکاربوون بۆ ئەوەی (مەلیک فارووق)، هیچ شتێکی بە لاوە گرینگ نەبێت و تەنها چێژوحەزەکانی خۆی نەبێت، هەروەها هەستکردنی بە لاوازیی تەختی پادشایەتییەکەی، هۆکاربوو بۆ نائومێدبوونی و بێ هیوایی لەوەی کە سبەینێ ڕووی دەدا.

(لیلیان کۆهین)ی هونەرمەندی جوو، بوە بە ناوبانگترین و دیارترین خۆشەویستەکانی (مەلیک فارووق)، ئەوەش بە هۆی ناوبانگە سینەماییەکەی و جوانییە سەرنج ڕاکشەکەیەوە، بەلام ئەوەی گرینگە باس بکرێت کۆتاییە کارەساتبارەکەی بوو، کە پەنجەی تاوان بۆ (مەلیک فارووق) ڕابکێشرێت وەک ئەگەری ئەنجام دانی تاوانی کوشتنەکە.

لێرەدا کەمێک هەڵوەستە دەکەین و قسەی زیاتر لە سەر (لیلیان) دەکەین..

ئایا (لیلیان) یاخود (کامیلیا) کێیە بە تـەواوی؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە تا ئێستاش لە ناو میسرو ولاتانی عەرەبی و

تەنانەت ئیسرائیلیشدا هەر دەکرێت و بە دوای وەڵامەکەیدا دەگەڕێن، بەڵام تا ئێستا هیچ کەسێک نەیتوانیوە وەڵامێکی دروست و تەواوەتی بۆ ئەو پرسیارە بدۆزێتەوە، بەڵام ئەو هونەرمەندەی لە ژیانیدا ڕووبەڕووی چەندین قسەوقسەڵۆک و باس کردن بۆوە، مردنەکەشی بە هەمان شێوە بوە هۆی مشتومڕێکی زۆر و کۆمەڵێک قسەی دژ بە یەکی بە دوای خۆیدا هێنا، ڕووداوی گیان لە دەست دانی (لیلیان) بە هۆی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەیەوە، بوە هۆی دروستبوونی گومانێکی زۆر بەوەی ئەو ڕووداوە دەستکرد و پیلان بۆ دارێژراو بوە و مەبەستیش لێی لە ناوبردنی یەک جارەکی بوە بۆ یەکلاییکردنەوە و پاکتاوکردنی ململانێکان.

بەم جۆرە کۆمەڵێک ئاماژە و هێمای سەرسوڕمان، ڕووبەڕووی ئەو شۆخ و شەنگەی سەردەمەکەی خۆی بۆوە، ئیتر لە ژیانیدا بوو بێت یاخود بە هۆی مردنە نادیار و گوماناوییەکەیەوە بێت، بە هەمان شێوەش هێمای پرسیار و گومان، بە سەر شووناس و ناسنامەی بکوژەکەیەوە هەیە.

ئەو ژنە جووە، توانی سنوورەکانی کۆمەڵگەی میسری و عەرەبی تێک بشکێنێت و بگاتە لوتکە و بچێتە ناو کۆشکەکانی فەرمانڕەوایەتی و دەسەڵاتداریێتی ئەو وڵاتەوە، جگە لەوەش لە یەک کاتدا پێوەندییەکی ڕۆمانسی و سێکسی لەگەڵ (مەلیک فارووق) و ژمارەیەک لە کەسە دیارەکانی نێو کۆمەڵگەی میسری و وڵاتانی عەرەبیدا دروست بکات، ناوەکەشی پەیوەستکراوە بە چەند چیرۆکێکی سیخوڕی و هەواڵگری بۆ ئیسرائیل و کارکردن بۆ دەزگا هەواڵگرییەکەی (ئیسرائیل)، ئەمە جگە لەوەی هەر ڕۆژە، ڕۆژنامە و میدیاکانی میسر و وڵاتانی عەرەبی نهێنی و

زانیارییەکی نویێ لە سەر ئەو ژنە ئاشکراو بڵاو دەکەنەوە و ڕەفتار و هەڵس و کەوت و پێوەندییە نامۆ و نادیارەکانی، بۆتە مایەی قسەوباس و مشتومڕێکی زۆری میدیاکان و ڕای گشتی.

کارەکە هەر بە مەوە نەوەستاو لێرەدا کۆتایی نەهاتوە، بەڵکوو ژیانی (لیلیان) کرایە، درامایەکی عەرەبی و لە کاتی نمایشکردنی و دوای نمایشکردنیشیدا، بوە هۆی دروستبوونی کۆمەڵێک مشتومڕ و گفتوگۆی زۆر توند و دژ بە یەک، بە جۆرێک زۆرێک لە شاهیدحاڵەکانی سەردەمەکەی خۆی کە لە ژیاندا مابوون، توشی سەرسوڕمان بوون، بەوەی زۆرێک لە ڕووداوەکانی ناو دراماکە، پێچەوانەی ژیانی ڕاستەقینەی (لیلیان) ەوە بوو، هەروەها بەشێکیش لە ڕاستی و بەڵگە و شاهیدییەکان گۆڕدرابوون و دەستکاریی کرابوون.

(لیلیان) یاخود (کامیلیا) ئەو شۆخ و شەنگە جووە بوو، کە پێش سووتان و کەوتنە خوارەوەی لە فڕۆکەیەکی ئەمریکیدا، توانی سینەمای میسری داگیربکات و وەک پادشایەکی جوانی و وروژاندن و بزواندن هیچ ڕکابەرێکی نەبێت، بەڵام ئایا (لیلیان) سیخوڕبوو بە سەر (مەلیک فارووق)ەوە؟ ئایا مۆساد، (لیلیان) ی دامەزراندوە بۆ ئەوەی بچێتە ناو کۆشکی پادشایەتی میسر و کاری سیخوڕی بۆ ئیسرائیل بکات؟ ئایا ڕووداوی گیان لە دەستدانەکەی لە ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەدا، پیلانێکی داڕێژراوبوو لە لایەن دەزگایەکی نەناسراو یان بیانییەوە؟

(لیلیان)، ئەو یۆنانییە جووەی بە خێرایی هەورە بروسکە و لە ماوەی تەنها پێنج ساڵدا بوە ئەستێرەیەکی درەوشاوە، بە هەمان شێوەش لە چەند ساتێکی کەمدا بە تەواوی سووتا، ئەوەش بە

هۆی ڕووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەی (ئەستێرەی میریلاند) دوای سی دەقیقە لە هەڵفڕینی لە فڕۆکەخانەی قاهیرەوە بەرەو ڕۆما.

(لیلیان) لە کۆتایی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا بە تەواوی دەرکەوت و بوە ئەفسانەیەکی سینەما، بە هەمان شێوەش لە تەمەنی (25)ساڵیدا و لە لوتکەی پێوەندییە ڕۆمانسییەکەیدا لەگەڵ (مەلیک فاروق)، شەوی (31)ی ئابی ساڵی (1950) داو لە ڕووداوێکی کارەساتباردا وەک ڕووناکیی و تیشکێکی سووتا و بە خێرایی بەرەو ئاسمان هەڵکشا.

ئەگەرچی زۆرینە شتێکی ئەوتۆ لە بارەی (لیلیان)ەوە نازانن یان نایناسن تەنها لە ڕێگەی فیلمە کۆنە ڕەش و سپییەکانییەوە نەبێت، بەڵام لە سەردەمی خۆیدا، نموونەیەکی تەواوەتی مێینەیی و سەرنج ڕاکێشی و سەرسوڕمان بوە لای دەوڵەمەند و هونەرمەندە دیار و ناسراوەکان.

ڕووداوی مردنە نامۆکەی (لیلیان)، هاوشێوەی ژیانەکەی، پڕە لە قسەوقسەڵۆک و پڕوپاگەندە، باس لەوەش دەکرێت (پاسەوانی ئاسنین) پیلاندارێژەری ئەو ڕووداوە بوە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی ڕزگاریان بێت لە دەستی و کۆتایی بە پێوەندییەکەی بهێنرێت لەگەڵ (پادشا)ی میسردا.

هەروەها هەندێک جار باس لەوەش دەکرێت دەزگای هەواڵگری جووەکان (پێش دامەزراندنی مۆساد)، ئەو بۆمبەیان لە ناو یەکێک لە جانتاکانی فڕۆکە ئەمریکییەکەدا داناوە، بۆ لە ناوبردنی تەواوەتی (لیلیان)، ئەمەش دوای دۆسییەی چەکەکان و ترسی ئاشکرابوونی ئەرکە نهێنییەکەی لە کۆشکی پادشایەتی میسردا.

بەڵام ڕووداوی فڕۆکەی (ئەستێرەی میریلاند) و گرگرتن و سووتانی لە ئاسماندا، تا ئێستا بە نادیاری و گوماناوی ماوەتەوە، ئەو لێکۆڵینەوە ڕۆتینیانەشی لە کاتی خۆیداکران، نەیانتوانی هۆکاری تێکشکان و سووتانی ئەو فڕۆکەیە لە سەعات (2)ی بەرەبەیاندا ئاشکرا بکەن و بەو هۆیەشەوە دۆسییەی لێکۆڵینەوەکە بە تەواوی داخرا.

پێش ڕووداوەکە (لیلیان) و (مەلیک فارووق)، بڕیاریاندابوو لە (دۆفیل) یەک ببین و لە (چێشتخانەی مەکسیم) نانی نیوەڕۆ بخۆن، هەر لەبەر ئەوەش (لیلیان) دەچوو بۆ (ڕۆما) و لەوێشەوە بۆ (دۆفیل) کە هاوینەهەوارێکی فەرەنسی بوو.

(لیلیان) لە کۆتا ساتەکاندا بلیتی گەشتی ژمارە (903)ی فڕۆکەی (ئەستێرەی میریلاند)ی بڕی کە لە درەنگانێکی شەودا لە مۆمبایەوە گەیشت و دواتریش دەچوە (ڕۆما)، لەوپەڕی ئاسوودەیی و دڵخۆشیدا بوو بە تایبەتی کە (مەلیک فارووق) پەلەی ئەوەی لێ دەکرد بە خێرایی بە ڕێ بکەوێت و بگاتە لای.

هەر لەبەر ئەوەش، (کامیلیا) تایورایەکی فستقی و ئەو پێڵاوە ڕەنگ سەوزەی کردەپێ، کە (مەلیک فارووق) حەزی لێ دەکرد و داوای لێ کرد پێش ئەوەی سواری فڕۆکەکە بێت وێنەیەکی پێوە بگرێت.

(کامیلیا) یەکێک بوو لە (48) سەرنشینەکەی ناو فڕۆکەکە، زۆر دڵخۆش و ئاسودەبوو، لە دڵەوە پێ دەکەنی و ماڵئاوایی لەو کەسانە دەکرد کە بە ڕێیان دەکرد، بێ ئاگا لەوەی قەدەر لەو گەشتی مردنەدا چی بۆ هەڵگرتوە و چی بۆ ئامادە کردوە.

تەنها نیو سەعات دوای هەڵسانی فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانەی قاهیرە، لە ئاسمانی شاری (دلنجات)دا بە شێوەیەکی کتوپڕ ئاگر

لە فڕۆکەکە کەوتەوە و بزووێنەرەکانی ئاگریان گرت و سووتان، فڕۆکەکە لە ئاسماندا بوە پارچەیەک خەڵوز، جەستە و تەرمە سووتاوەکانیش، لە بیابانێکی نزیک گوندی (دەست)دا پەرت و بڵاو بوونەوە و هێندەی تر تێکچوون و شێوان.

دوای پچڕانی پێوەندی فڕۆکەکە لەگەڵ هەر دوو فڕۆکەخانەی (قاهیرە) و فڕۆکەخانەی (نیقۆسیا) و تا سەعات پێنجی بەیانی چارەنووسی فڕۆکەکە بە نادیاری مایەوە و فڕۆکەخانەی (ڕۆما) ش تەئکیدی دەکردەوە لەوەی هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ فڕۆکەی (ئەستێرەی میریلاند)دا ئەنجام نەداوە، لەم کاتەشدا (مەلیک فاروق) لە (دۆفیل) بە تامەزرۆییەوە چاوەڕێی گەیشتن و دەرکەوتنی (لیلیان)ی خۆشەویستی دەکرد.

(کامیلیا)، ناوە ڕاستەقینەکەی (لیلیان کۆهین)ە، جووە و لە کونسوڵخانەی یۆنان لە ئەسکەندەرییە تۆماری لە دایک بوونی بۆ دەرکراوە، کچی (ڤیکتۆر کۆهین)ە، کە یەکێک بوو لە فرۆشیارەکانی بۆرسەی یۆنانی و جووەکان، دایکیشی ناوی (ئۆلگا)یە و مەسیحییەکی کاسۆلیکییە.

دایکی (لیلیان) لە (کڵێسای سانتا کاترین) بە بێ ئاگاداری (باوکی)، لێی جیا بۆتەوە، لەو کاتەوە (ڤیکتۆر) ماڵەکەی جێ هێشتوە، بەو هۆیەشەوە (لیلیان) باوکی خۆی نەبینیوە، (ئۆلگا) ی دایکی، هەموو ژیانی خۆی تەرخانکرد بۆ بەخێوکردن و خزمەتکردنی کچەکەی، لەو پێناوەشدا لە نێوان (قوبرس) و (ئەسکەندەریە)دا هاتوچۆی دەکرد.

کاتێک (لیلیان) تەمەنی گەیشتە شانزە ساڵ، دایکی لە خوێندنگە دەریکرد بۆ ئەوەی کارێک بکات، لەو کاتەدا (لیلیان) خاوەنی تایبەتمەندییەکی زۆری ژنانە بوو، بەڵام هیچ کەسێک

نەیدەبینی و هۆگری هیچ کەسێکیش نەبوو، دایکی بۆ هەموو شوێنێک لەگەڵیدا دەچوو.

(لیلیان) بە ڕێکەوت لە چێشتخانەی (ئۆبرەج بلو) لە سەر کەناری دەریـا، (ئەحمەد سالم)ی دەرهێنەری ناسی، کە ئەو کاتە بەوە ناسرابوو خۆشەویستی ژنانی سەردەمەکەی خۆی مسۆگەر کردبوو، لە هۆتێل (وێندسۆر) کە ئەوکاتە یەکێک بوو لە هۆتێلە دیار و بە ناوبانگەکان لە شاری ئەسکەندەرییە، (ئەحمەد سالم) و (لیلیان) یەکترییان بینی و گفتوگۆیانکرد لە سەر ئەوەی (لیلیان) لە بواری سینەمادا کاربکات، بەڵام (ئۆلگا)ی دایکی، هۆشداریدایە کچەکەی بەوەی لەو دەرهێنەرە نزیک نەبێتەوە، بە هۆی ئەو پێوەندی و سەرکێشیانەی لەگەڵ (ئەسمەهان) ی گۆرانیبێژ و چەند ژنێکی تردا هەیبوو، بەڵام (لیلیان) نەک گوێی بە هەڕەشەکانی دایکی نەدا، بەڵکوو هەڕەشەی ئەوەیکرد خۆی دەکوژێت ئەگەر ڕێگری لێ بکات و دواتریش کەوتە داوی خۆشەویستییەکەیەوە و عاشقی بوو.

دواتر (لیلیان)، (سەید لوزی)ناسی، کە پیاوێکی دەوڵەمەند و سەرمایەدار بوو، خاوەنی کارگەکانی ئاوریشم بوو لە قاهیرە، (لوزی) دەرگـای ژیانێکی شایستە و پڕ لە خۆشگوزەرانی بە ڕووی (لیلیان)دا کـردەوە، کاتێک دەچوونە (یانەی میسری) سەرنجی ئامادەبوانی بۆ خۆی ڕادەکێشا و لە ناو دەست و باوەشی (لوزی)دا نازی دەکرد و خۆی دەلاواندەوە.

(ئەنتۆن پۆل) کە سکرتێری تایبەتی (مەلیک فارووق) بوو، بە بەردەوامی دەچوە (یانەی میسری) کە یانەیەکی شەوانەی بە ناوبانگی شـاری قاهیرە بـوو، بە مەبەستی دۆزینـەوە و پەیداکردنی خانم و ژنانی جوان بۆ کۆشکەکەی پادشای میسر،

کاتێکیش چاویکەوتە سەر (لیلیان) و یەکسەر پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد لە بواری سینەمادا دەیخاتە سەر کار و نەیویست ئەو نێچیرە گرانبەهایە لە دەست بدات، کە دواتر و وەک هەمیشە دەی کردە دیارییەکی بە نرخ بۆ (فاررووق)ی هاوڕێی و پادشای میسر.

(پولی) هەوڵێکی زۆریدا تا (لیلیان) بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، لەو پێناوەشدا داوای یارمەتی لە (یوسف وەهبی) هونەرمەندی بە ناوبانگ کرد، تا ڕۆڵێکی سەرەکی و پاڵەوانی فیلمێک بداتە (لیلیان) و لە بەرانبەریشدا (پۆلی) و (کۆشکی پادشایەتی)، خەرجی و تێچووی ڕیکلامەکانی فیلمەکە لە ئەستۆ دەگرێت.

لێرەوە، (یوسف وەهبی) بایەخێکی زۆریدا بە (لیلیان) و نازناوی (کامیلیا)ی بۆ هەڵبژارد، بەو بیانوەی ژیانی (لیلیان) هاوشێوەی چیرۆکی (غادە کامیلیا) بوو، کە یەکێک بوو لە چیرۆکە جیهانییە ناسراوەکان، لە ساڵی (1947)یشدا بە ڕۆڵێکی سەرەکی بەشدار بوو لە فیلمی (دەمامکی سوور)دا، ئەوەش بوە سوپرایزی ئەو وەرزەی سینەما.

بەم جۆرە و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، (لیلیان) تا دەهات ناو و ناوبانگی زیاتری پەیدا دەکرد و فیلمەکانیشی زۆرتربوون، بوو بە یەکێک لە ئەستێرە وروژێنەرەکانی سینەما، بە هۆی جوانییە ئەفسانەیی و سەرنج ڕاکێشەرەکەیەوە و توانی ببێتە پێشەنگی هەموو ئەستێرەکانی تر.

بەم پێیە، لە ساڵی (1947)ەوە، هەم کاروانی کاری سینەمایی و نواندنی (لیلیان) دەستی پێکرد، هەم بوە یەکێک لە زنجیرەی دۆست و خۆشەویستەکانی (مەلیک فاررووق).

## کۆتایی

بەم جۆرە بینیمان، ژیان و تەمەنی (مەلیک فاررووق) ئەگەرچی تەمەنێکی زۆر کەمی هەبوو لە (45) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، بەڵام پڕبوو لەو شتانەی هەر چیرۆکنووسێک خەونی پێوەدەبینی وەک ڕووداوە درامییەکان و سەرنج ڕاکێشی و مرۆڤایەتی و ڕۆمانسی و پیلانگێڕی، هەروەها بۆشمان دەرکەوت بە هۆی چێژ و ئارەزووە سێکسییەکانی هەریەک لە (مەلیک فوئاد)ی باوکی (مەلیک فارووق) و (شاژنە نازلی) دایکی (مەلیک فارووق) و خودی (مەلیک فاررووق)ەوە، نەک بە تەنها مێژووی (خانەوادەی محەمەد عەلی)، بەڵکوو مێژووی میسریش ڕووبەڕووی گۆڕانکارییەکی زۆر بۆوە.

وەک دەگوترێت، نەدەبوایە (مەلیک فوئاد) هاوسەرگیری لەگەڵ (نازلی شەریف سەبری)دا بکات، چونکە ئەوی خۆش نەدەویست، بەڵکوو کەسێکی تری خۆش دەویست، تەنانەت لە ڕۆژی هاوسەرگیرییەکەشیاندا (نازلی) هەڵات و چوە لای خۆشەویستەکەی، بەڵام (مەلیک فوئاد) گوێی بە پێگە شاهانەییەکەی خۆی نەداو کەوتە داوی حەزە سێکسییەکەیەوە و هاوسەرگیری لەگەڵ (نازلی) کرد و لە ژوورێکی کۆشکەکەیدا زیندانی کرد و مامەڵەیەکی زۆر توند و دڵڕەقانەی لەگەڵدا دەکرد، کە دواتر کاردانەوەی زۆر خراپی لە سەر هەڵس و کەوت و بیرکردنەوە و کەسایەتی (مەلیک فارووق)ی کوڕیان دروستکرد، بەو هۆیەشەوە بێ بەری بوو لە ژیان و هاوڕێیەتی منداڵانەی هاوتەمەنەکانی خۆی، کە دونیایەکی زۆر جوان بوو، بەڵام (مەلیک فارووق) لێی بێ بەری بوو.

تا ئەو کاتەی (مەلیک فوئاد) نەمرد، (نازلی) نەیتوانی لە ژوورەکەی بێتە دەرەوە، لە هاتنە دەرەوەشیدا بە هیچ شێوەیەک

ڕەچاوی ئەوەی نەکرد هاوسەرەکەی مردوە و هەروەها دایکی ئەو کوڕەشە کە دەبێتە (پادشای میسر)، بەڵکوو کەوتە شوێن حەزە سێکسییەکەی و عەشقەکەی کە یەکێک بوو لە فەرمانبەرەکانی بەردەست هاوسەرەکەی بە ناوی (ئەحمەد حەسەنەین پاشا)، پێوەندییەکەی نێوان (نازلی) و (ئەحمەد حەسەنەین)یش ئەو کاتە دروستبوو کە (نازلی) بە سەردانێک چوو بۆ (لەندەن)، (مەلیک فوئاد)یش، (ئەحمەد)ی لەگەڵدا نارد تا چاودێری بکات و ڕێگری هەندێک کار و هەندێک جێگەی لێ بکات.

(نازلی) بە جۆرێک حەزی بۆ (ئەحمەد) دەجوولا، چوە لای (مەلیک فارووق)ی کوڕی و پێی گوت کە هاوسەرگیری لەگەڵ (ئەحمەد حەسەنەین پادشا) دا دەکات.

(مەلیک فارووق)ی پادشای میسریش، دریغی لە تێرکردنی حەزوئارەزووە سێکسییەکانی خۆی نەکرد، بە تایبەتی دوای ئەوەی هەمووشتێکی خۆی تەسلیمی ئەو چوار ئیتالییە کرد و بوە هاوڕێیان، کە لە کۆشکەکەدا وەک (کارەبایی، سەرتاش، بەخێوکەری سەگ، فەرمانبەر) کاریان دەکرد.

(مەلیک فارووق)، بە تەواوی پێگەکەی خۆی لە بیرکردبوو، ببوە هاوڕێی زۆر نزیکی ئەو چوار کەسە، پێکەوە دەچوونە قاوەخانە و یانەکانی شەوانە، دواتریش بە هۆی ئەو پێوەندییە سێکسیانە و ئاهەنگە شەوانانەی (پۆلی) بۆی ڕێک دەخست، بە تەواوی لە (شاژنە فەریدە)ی هاوسەری دوور کەوتەوە و ڕقێکی زۆری بەرانبەر پەیدا کرد، چونکە تەنها منداڵی کچی دەبوو، هیچ کوڕێکیشی نەبوو کە (فارووق) خەونی پێوەدەبینی تا ببێتە جێگرەوەی تەختی پادشایەتی.

بەم جۆرە کارەساتاوییە خانەوادەی (مەلیک محەمەد عەلی) و (مەلیک فارووق) کۆتاییان هات و نەبوونە خاوەنی کوڕێک بۆ ئەوەی ببێتە میراتگری تەختی پادشایەتی، ئەگەرچی (مەلیک فارووق) خەونی وابوو لە (شاژنە ناریمان)ی هاوسەری دوەمی کوڕێکی ببێت، بەڵام بە هۆی بەرپابوونی شۆڕشی یۆلیۆوە ئەو خەونەشی نەهاتەدی، لەو کاتەشدا کوڕەکەی کە تەنها تەمەنی حەوت مانگ بوو لەگەڵ دایکیدا کۆشکی جێهێشت و دەسەڵات و تەخت و وڵاتیان لە دەستدا.

ئەوەی لەگەڵی ژیابێت یان کاری لەگەڵ کردبێت یاخود کتێب و ژیاننامەی (ناپلیۆن پۆناپارت)ی خوێندبێتەوە، کەوتۆتە ژێر کاریگەرییەکانی (پۆناپارت)ەوە، ژیانی پڕبوو لە هەڵوێست و بارودۆخی زۆر دژ بە یەک، وەک چوونە سەر تەختی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا لە (3)ی دیسەمبەری ساڵی (1804)دا، جەنگ و کردەوە و جموجۆڵە سەربازییەکان و حەز و سەرکێشییەکانی بۆ ژنان، دوورخستنەوە و مردنی لە دوورگەی (سانت هیلین)، بەم پێیە دەتوانین بڵێین (گۆتە) لە سەر هەق بوە کاتێک لە ساڵی (1808)دا گوتبووی (تا شتی زیاتر لە سەر ناپلیۆن بزانین، ئەوا زیاتر لەبەر چاومان دا گەورەتر دەبێت).

ئەو ئیمپراتۆرە قاچ کورتەی (فەرەنسا) بوە سەرچاوەی ئیلهامبەخشی چەندین شاکاریی هونەری و ڕۆشنبیری و کەلتووری، هەر وەک ئەو کتێبانەشی لە سەری نووسراون، یەکێکن لە کتێبە ناودارەکانی مێژوو، پڕفرۆشترینیشن لە سەر ئاستی دەزگاکانی چاپ و بڵاو کردنەوەی ئەورووپا.

لە کاتی مردنییەوە لە ساڵی (1821) تا ئێستا زیاتر لە (50) هەزار کتێبی لە سەر نووسراوە، کە هەندێکییان لە دەرەوەی سنوورەکانی ئیمپراتۆیەتەکەی بوون، ڕەنگە جێی سەرنج بێت بەوەی هەڵس و کەوت و شێتێتییەکانی (ناپلیۆن)، توانی شورای گەورەی چین تێ بپەڕێنێت و کاریگەری لە سەر نووسەرانی ڕۆژهەڵاتی دوور دروست بکات، بە جۆرێک لە ساڵی (1837) دا، یەکەم کتێب لە سەر ژیانی ئەو فەرماندە فەرەنسییە بە زمانی چینی چاپ و بڵاو کرایەوە.

هەروەها (ناپلیۆن) ناسرابوو بە چێژ و ئەو قسانەی توانای داگیرکردنی دڵ و دەرونیان هەیە، بە جۆرێک زۆرینەی خەڵک

دەیانپرسی، ئایا ناپلیۆن لە کاتێکدا ژیانی پڕە لە بەرپرسیارێتی و عەیبە، چۆن کاتی هەیە بیبەخشێت بەو جۆرە لە قسەکردن کە کاریگەری لە سەر دڵ و دەروون دروست دەکات.

مێژوونووسان کات و بایەخی زیاتریان بەخشیوەتە عەشق و نامە خۆشەویستییەکانی ناپلیۆن، ئەو نامانە زۆر دوورن لە ژیان و کەشوهەوای سیاسی و قەیران و دۆخە ناخۆشەکان، بۆ ئەوەی لەگەڵ ناپلیۆندا کەشێکی جوان و خۆشت هەبێت بۆ ژیان، چونکە (ناپلیۆن)ی ئیمپراتۆری جەنگ و ئیمپراتۆری خۆشەویستی، کەسایەتییەکە کە شایستەی ئەوەیە شتی زیاتری لە بارەوە بزانیت و بخوێنیتەوە. ئایا ناپلیۆنی عاشق، ئەو سەرکردە گەورەیەی فەرماندەیی سوپا و هێزێکی سەرکەوتووی کردوە و فەرمانڕەوایەتی نیوەی ئەورووپای کردوە و ژیانی ڕۆمانسی و سۆزداریی بە تێکشاوی دەست پێکرد، بە چ جۆرێک ڕەفتاری کردوە و هەڵس و کەوتی کردوە؟

(ناپلیۆن) بۆ یەکەم جار لە ڕێگەی یەکێک لە کچە هەوەسبازەکانەوە ئاشنای سێکس بوو، دواتر و لە کاتێکدا هێشتا کەمێک لە تەمەنی منداڵی زیاتربوو بیری لە هاوسەرگیری کردەوە و یەکەم کچیش کە خۆشیویست ناوی (ئیما) بوو، بەڵام ئەو بایەخی پێ نەدا و هیچ باکێکیشی نەبوو بەو نامە ئاگرینانەی لە بارەی عەشقەکەیەوە بۆی دەنووسی. دوای (ئیما)، (ناپلیۆن) کەوتە داوی عەشق و خۆشویستی خاتوو (دیزیری کلاری)ییەوە، بە گەرموگوڕی و هەست و سۆزییەوە نامەی بۆ دەنارد و ئومێدێکی زۆری هەبوو کە هاوسەرگیری لەگەڵ بکات.

ئەوەش زانراوە کە (ناپلیۆن) چۆن دەیتوانی دڵ و مەیلی زۆرترین ژن بە لای خۆیدا ڕابکێشێت، وەک (جۆزیفین) کە هێشتا ئەفسەرێکی بچووک بوو کاریگەری لە سەر دروستکرد،

(ماری لویز)ی شازادەی نەمسا، کە دواتر هاوسەرگیرییان کرد و کوڕێکیان بوو و بوە شازادەی جێنشینی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا، هەروەها چەندین ژنی تریش، کە بۆ ماوەیەک دڵیان داگیرکردوە، لەوانەش (ماری ڤالیسکا)ی کۆنتیسەی پۆڵندا، کە توانی باوەڕ بە (ناپلیۆن) بهێنێت بەوەی توانای منداڵبوونی هەیە و دواتر منداڵێکی ناشەرعی لێ بوو.

ئەمەش هانیدا بۆ ئەوەی لە (جۆزیفین) جیا ببێتەوە و لە (ماری لویز) نزیک ببێتەوە، نابێت لێرەدا (دیزیرە کلاریە) مان بیر بچێت، کە دواتر بوە (شاژنی سوید)، بە شێوەیەکی ڕەسمی پێوەندی لەگەڵ براکەی (ناپلیۆن)دا هەبوو، پاشان پێوەندییەکی سێکسی و سۆزداری لە نێوان (ناپلیۆن) و (دیزیرە)دا دروستبوو، هەروەها پێوەندیشی لەگەڵ (پۆلین فۆریس)یشدا هەبوو کە بە (کیلۆ پاترا) وەسف دەکرا، لەبەر ئەوەی تا ئەو کاتەی (ناپلیۆن) لە میسر بوو، هەمیشە پێکەوەبوون.

یەکێکی تر لە دۆستەکانی (ناپلیۆن) هونەرمەندێکی زۆر جوان بوو بە ناوی (مادۆموازیل جۆرج)، (ناپلیۆن) بۆ ماوەیەکی زۆر کەم حەزی لێی بوو، لەو ماوەیەشدا (گوڵ یەخە)یەکی لە شێوی تیرێکی ڕەنگاورەنگی لە ئەڵماس دروستکراوی پێشکەش کرد، کە بە بەردی پیرۆز ناوی خۆی لە سەر نووسرابوو.

هەر کەسێکیش ئەگەر حەز بکات یان بیەوێت زانیاریی لە سەر ئەو دیارییانە هەبێت، کە (ناپلیۆن) بەخشیونی بە خۆشەویست و دۆستەکانی، ئەوا دەبێت سەردانی ئەو پیشانگا تایبەتە بکات لە (خانەی شومیە) لە مۆزەخانە تایبەتەکەی گۆڕەپانی فاندۆم و گالیسکەی ئەسپەکەی، کە لێی نووسراوە (ناپلیۆنی عاشق: ئاڵتوونەکانی ئیمپراتۆریەتی دل).

(ناپلیۆن) لە سەرەتاکانی تەمەنیدا و لەو کاتەدا، کە ئەستێرەی بەختی ڕووە و ئاسمانی ئازایەتی و بوێری هەڵدەکشا، کچی

بازرگانێکی ئاوریشمی لە مارسیلیا ناسی، بە هۆی ئازایەتی و چاونەترسییەکەیەوە، حکوومەت بڕیاریدا ڕاژەکەی بگوازێتەوە بۆ پاریس، ئەویش فەرمانی کرد بە شۆفێری گالیسکەکەی بیباتە ماڵی ئەو کچە، تا لە هۆکار و فەرمانی ڕۆیشتنەکەی ئاگاداری بکات، کاتێکیش چۆتەلای، بڕێک پارەی بە قەرز لێ وەرگرتوە و بەڵێنیشی پێ داوە بەردەوام بێت لە خۆشویستنی.

بەڵام لە پاریس، بۆی دەرکەوت (جۆزفین) چ کاریگەرییەکی لە سەر ئەفسەرەکان هەیە و بڕیاریدا بۆ ئەوەی (تاج)ەکە بە دەست بهێنێت دەبێت پێوەندی لەگەڵ (جۆزفین) هەبێت، کاتێکیش (ناپلیۆن) هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ خۆشەویستەکەی پێشووتریدا نەماو هیچ نامەیەکیشی بۆ ڕەوانە نەدەکرد، خۆشەویستەکەی چوە پاریس بۆ ئەوەی هەم هەواڵی بزانێت و هەمیش چاوی پێی بکەوێت، بەڵام ڕێگەی پێ نەدرا بچێتە یانەکەوە، ئەگەر هاوڕێیەتی ئەفسەرێک نەکات، بۆیە لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا هاوڕێیەکی (ناپلیۆن)ی بینی کە ئەفسەربوو هەموو شتێکیشی لە بارەوە دەزانی، ئەو ئەفسەرە خۆشەویستەکەی (ناپلیۆن)ی لەگەڵ خۆیدا بردە یانەکە و پێی گوت (ناپلیۆن لە پێناوی بە دەستهێنانی ئارەزووەکانیدا دڵی خستۆتە ژێر پێکانییەوە).

کاتێکیش لە یانەکە (ناپلیۆن و جۆزیفین)ی پێکەوە بینی، بە نیگایەکی پڕ لە ماندوێتی و بێزاری و خەمبارییەوە سەیری کردن و بەخێرایی چوە دەرەوەی یانەکە، (ناپلیۆن) ئاماژەی بۆ هاوڕێکەی کرد و داوای لێکرد کە هاوڕێیەتی خۆشەویستەکەی بکات و دەستی لێ بەرنەدات، هاوڕێکەشی داواکەی (ناپلیۆن) ی پەسەندکرد و پێکەوە ڕۆیشتن، بەڵام لە ڕێگەدا ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی هاوسەرگیری بکەن، (ناپلیۆن)یش، جگە لەوەی

پیرۆزبایی لێ کردن، هاوکات ئامادەی ئاهەنگ و ڕێورەسمی هاوسەرگیرییەکەشیان بوو، وەک نەریتێکیش، چەند دیارییەکی پێشکەشکردن، کە نرخ و بەهاکەی چەندین هێندەی ئەو پارەیەبوو پێشتر بە قەرز لە خۆشەویستەکەی وەرگرتبوو.

ئەستێرەی چانس و بەختی (ناپلیۆن) تا دەهات بەرز و گەشاوەتر دەبوو، تا گەیشتە ئەوەی ببێتە ئیمپراتۆری فەرەنسا، تاجی ئیمپراتوریەتەکەی لە دەستی پاپا وەرگرت و بە دەستی خۆی لە سەرینا و گوتی «خۆم هێناومەتە ئێرە، نەک تۆ».

لەو ماوەیەشدا (پادشای سوید) کۆچی دواییکرد، بەڵام هیچ جێگرەوە و جێنشینێکی نەبوو، لە پێناوی ئەوەشدا کە هیچ شەڕ و ئاژاوە و ناکۆکی و ئاژاوەیەک لە نێوان خانەوادە خانەدان و ڕەسەنەکانی ئەو وڵاتەدا دروست نەبێت، بڕیاردرا یەکێک لە ژەنەراڵەکانی ناپلیۆن بەو مەرجەی دەست و داوێن پاک بێت بۆ ئەو کارە ڕابسپێررێت و ببێتە هاوسەری خۆشەویستەکەی ناپلیۆن، پێشتریش ئینگلیز هەمان کاریان کرد و داوایان لە میری ئەڵمانیا کرد، کە فەرمانڕەوایەتییان بکات.

دوای ئەوەی داواکارییەکەی خرایە بەردەست، (ناپلیۆن) ڕەزامەندی دەربڕی، بەو مەرجەی سوید ببێتە هاوپەیمانی فەرەنسا، بەڵام ژەنەراڵەکەی فەرەنسا ئەو داوایەی ڕەت کردەوە تەنانەت ئەگەر لە بەرژەوەندی گەلی سویدیشدا بێت، لە بەرانبەردا (ناپلیۆن) بەو ژەنەراڵەی گوت «تەنانەت لە پێناوی پادشاکەشتدا دەستبەرداری بیروباوەڕەکەت مەبە، تۆ لە من گەورەتریت»، بەو جۆرە ژەنەراڵەکە بە ئەرکە شاهانەییەکە ڕازی بوو.

(ناپلیۆن) چەندین خۆشەویست و پێوەندی سێکسی هەبوو، بەجۆرێک گومانی زۆری لە یاریدەدەرەکەی یاخود سکرتێرە

تایبەتەکەی هەبوو، کە ناوی (پۆل باراس) بوو، بەوەی دوان لە عاشق و خۆشەویستەکانی لێ بڕفێنێت، تا بە ناچاری هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێکیاندا کرد بە ناوی (ماری ڕۆز دی بوهارنیس)، کە دواتر (ناپلیۆن) ناوینا (جۆزیفین) لەبەر ئەوەی حەزی بە ناوەکەی خۆی نەدەکرد.

(جۆزیفین) بە تەمەن لە (ناپلیۆن) گەورەتربوو بەجۆرێک تەمەنی دووگیانی و منداڵبوونی تێپەڕاندبوو، بەڵام (ناپلیۆن) ئەوەی نەدەزانی، هەروەها زۆرشتی تریش هەبوون لە ژیانی (جۆزیفین)دا کە (ناپلیۆن) نەی دەزانین و ئاگاداریان نەبوو.

کاتێک (ناپلیۆن) سەرقاڵی ئۆپراسیۆن و هەڵمەتە سەربازییەکانی بوو، (جۆزیفین) دوورییەکەی (ناپلیۆن)ی بە دەرفەت دەزانی بۆ سازکردن یان بەشداریکردن لە هەندێک ئاهەنگی تایبەتدا کە ژمارەیەکی زۆری خۆشەویست و عاشقەکان ئامادەی دەبوون، ئەو کارەی (جۆزیفین) هەموو پاریس دەیزانی، تەنها (ناپلیۆن) نەبێت کە سەرقاڵی جەنگ و پێشڕەوی بوو لە بەرەکانی دەرەوەی وڵاتەکەی.

(ناپلیۆن) بە بەردەوامیی نامەی سۆزدارییانەی بۆ (جۆزیفین) دەنارد و تکای لێ دەکرد کە سەردانی بکات، بەڵام هەمیشە (جۆزیفین) خۆی لەو سەردانە دەدزییەوە و تەنانەت جارێکییان پێی گوت کە دوو گیانە، بۆ ئەوەی چیتر داوای لێ نەکات بچێت بۆ لای، بەڵام دوای گەڕانەوەی لە جەنگی ئیتالیا، (ناپلیۆن) توشی نائومێدی بوو کاتێک (جۆزیفین)ی هاوسەری پێی گوت کە منداڵەکەی لەبار چوە.

بەم جۆرە (جۆزیفین) گەورەیی (ناپلیۆن)ی تێکشکاند، سەرەڕای ئەوەی هەمیشە هاوسەرەکەشی لە خشتە دەبرد، بەڵام

وای پیشاندەدا هاوسەرەکەی خۆشدەویت و هەموو ئەرکێکی ژن و میردایەتی بۆ جێبەجێ دەکات.

(ناپلیۆن) لە پێناوی ئەوەی هاوسەرەکەی خۆی لە بیر بکات، لە میسر پێوەندی لەگەڵ ژنێکی تردا دروستکرد، کە لە لایەن سەربازەکانەوە بە (کیلۆپاترای ڕۆژهەلات) ناودەبرا، (ناپلیۆن) هاوسەری ئەو ژنەی ڕەوانەی (ئەسکەندەرییە) کرد، بۆ ئەوەی هیچ ڕێگرییەکیان نەبێت و بەخواستی خۆیان یەکتر ببینن، بەلام کاتێک هاوسەری ژنەکە گەڕایەوە و بە پێوەندییەکەی نێوانیانی زانی، توشی کێشەی گەورەبوو لەگەڵ (ناپلیۆن)دا و لە هاوسەرە خیانەتکارەکەشی جیا بۆوە، بەلام (ناپلیۆن) هاوسەگیری لەگەڵدا نەکرد، لەبەر ئەوەی نەیدەویست لە (جۆزیفین) جیا بێتەوە، هەروەها دەشترسا لەوەی منداڵی لە ( کیلۆپاترا) هەبێت.

کاتێک ناپلیۆن لە ساڵی (1799)دا گەڕایەوە بۆ فەرەنسا و (جۆزیفین)ی هاوسەری نەدۆزییەوە، لە ژێر فشاری زۆری خانەوادەکەیدا لێی جیا بۆوە، هەر چەندە داوای لێبووردنی زۆریشی لێ کرد، بەلام بە هۆی فشاری کوڕەکانییەوە، توانی ناپلیۆن ڕازی بکات و بگەڕێنەوە بۆ لای یەک.

وەک ئەو پەندەی دەڵێت «گوناهە خوارەکانی سەگ ڕێک ناکرێتەوە»، دوای دوورخستنەوەی (ناپلیۆن) بۆ دوورگەی (سانت هیلانە)، جارێکی تر (جۆزیفین) گەڕایەوە بۆ هەڵسوکەوتی پێشووتری و پێوەندی لەگەڵ چەندین پیاوی تردا دروستکردەوە.

(فودای)، خۆشەویستێکی تری (ناپلیۆن) بوو، یەکێک بوو لە هاوەڵەکانی (جۆزیفین)، (ناپلیۆن) لە ڕووی سۆزدارییەوە زۆر هۆگری بووبوو، بەلام لێشی دوورکەوتەوە و بایەخی پێ نەدەدا، چونکە خەرجییەکی زۆری هەبوو لەبەر ئەوەی یاری قوماری دەکرد.

له مانگی ئایاری ساڵی (2006) دا، ئابڕووچوونێکی گرانبەها، له بەریتانیا تەقییەوە و پاڵەوانەکەشی (جۆن بریسکۆت) بوو، که جێگری (تۆنی بلێر)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیا بوو، ئەو ئابڕووچوونەش پێوەندییە سێکسییەکەی نێوان (جۆن بریسکۆت)ی جێگری سەرۆک وەزیرانی پێشووتری بەریتانیا و (تریسی تیمبڵ)ی سکرتێری بوو، که دواتر بەوە تۆمەتباری کرد، بەخراپی ئەو پێوەندییەی بە کار هێناوە و ناو و ناوبانگی لەکەدار کردوە و نهێنی پێوەندییەکەیانی ئاشکرا کردوە.

(تریسی تیمبڵ) له چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی (میل ئۆن سەندای)، وردەکاریی پێوەندییە نوێ و گەرموگوڕەکەی خۆی و (بریسکۆت)ی ئاشکرا کرد، هەروەها باسیشی لەوەکردوە چۆن سێکسیان کردوە، لە نووسینگە حکومییەکەی خۆی دوای ڕێورەسمی ساڵیادی جەنگی عیراق، هەروەها له یەکێک له هۆتێلەکانی لەندەنی پایتەختی بەریتانیا له کاتێکدا (پۆلین) ی هاوسەری (بریسکۆت) له بەشێکی تری هۆتێلەکە چاوەڕێی دەکردن.(تریسی) بە ڕۆژنامەکەشی ڕاگەیاندوە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک لەگەڵ (بریسکۆت)دا سێکسیان کردوە، بۆ نموونە له نووسینگە تایبەتەکەی (بریسکۆت) کاتێک فەرمانبەرەکانی تری نووسینگەکە له بەشێکی تری نووسینگەکەدا کاریان دەکرد ئەمان خەریکی سێکس بوون، هەروەها شوقە تایبەتییەکەی (بریسکۆت) له لەندەن، که له لایەن باجدەرانەوە خەرجییەکانی دابین دەکرا، جێگەیەکی تر بوو بۆ پێوەندییە سێکسییەکەی جێگری سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا و سکرتێرە تایبەتییەکەی.

هەروەها باسی لەوەشکردوە، بەشێکی زۆری کارەکانی دەخستە شەوەوە، بۆ ئەوەی شەوێکی گەرموگوڕ و چێژبەخش

لەگەڵ (بریسکۆت)دا بە ڕێ بکەن.

ڕۆژنامەی (مەیل ئین سەندای) چاوپێکەوتنێکی وێنەیی لەگەڵ (تریسی تیمبڵ)دا سازکرد و بە سەر هەموو کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکاندا دابەشی کرد، بۆ ئەوەی بە هەموان ئەو بابەتە زیاتر بووروژێنن و ڕێکاری پێویستی لە بەرانبەردا بگیرێتە بەر.

لەو چاوپێکەوتنەشدا (تریسی) بە پۆشاکێکی زۆر ڕەسمییەوە دەرکەوت، بەپێچەوانەی ئەو وێنەیەی کە بە تەنوورەیەکی کورت یان پانتۆڵێکی چەرمی ڕەنگ سوورەوە دەرکەوتوە کاتێک لە بۆنەیەکی ڕەسمیدا لە ناو وەزارەت، لەگەڵ وەزیردا سەما دەکات.

لەو چاوپێکەوتنەدا، (تریسی) بە گریانەوە باسی لەوەشکردوە هیچ کاتێک چاوەڕێی ئەوەی نەکردوە چیرۆکەکەی بەو جۆرە کۆتایی بێت و ترسی زۆریشی هەبوە لە داهاتووی کار و پیشەکەی.

لەو بارەیەوە (ماکس کلیفۆرد)، کە لە بواری پێوەندییە گشتییەکاندا کار دەکات و پسپۆڕی کڕین و فرۆشتنی (چیرۆکە سەرنج ڕاکێش و کاریگەرەکانە بە ڕۆژنامەکان)، دەڵێت «تریسی (100) هەزار جونەیهی ئیستەرلینی (150 هەزار یۆرۆ)ی وەرگرتوە لە بەرانبەر فرۆشتن و بڵاو کردنەوەی چیرۆکە نهێنییەکەی بە ڕۆژنامەی (مەیل ئین سەندای)، هەروەها (زە ئۆبزێڤەر)یش پارەکەی زیاد کردوە بۆ (250) هەزار جونەیهی ئیستەرلینی (400 هەزار یۆرۆ)، بەڵام (بریسکۆت) هەموو ئەو چیرۆکانەی ڕەت کردەوە و بێ بنەما وەسفیکردن، تەئکیدیشیکردەوە ئامانجی (تریس) لە بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە قسە و چیرۆکانە تەنها دەستکەوت و بەرژەوەندی دارایییە.

(جۆن بریسکۆت)ی جێگری (تۆنی بلێر) سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیا، بە توندی هەموو ئەو قسەو دەنگۆ و قسەڵۆکانەی

بڵاو كردەوە كە لە سەر زاری خۆشەویستە كۆنەكەیەوە بڵاو كرانەوە و هەموویانی بە ناڕاست و هەڵبەستراو لە قەڵەم دا، هەروەها تۆمەتباریشی كرد بەوەی لە پێناوی بە دەستهێنانی بڕێک پارەی زۆردا، ناوبانگی ئەمی شێواندوە، هەڕەشەی ئەوەشی كرد هەموو چیرۆكە ڕۆژنامەوانییەكانی دەداتە لیژنەی تایبەت بە سكاڵا لە دژی ڕۆژنامەكان.

دواتر (بریسكۆت)ی تەمەن (67 ساڵ)، دانی بەوەدانا كە پێوەندییەكی سێكسی لەگەڵ (تریسی) تەمەن (43 ساڵ)دا هەبوە و لەو ئاهەنگەوە دەستی پێكرد، كە نووسینگەكەی بە بۆنەی جەژنی ساڵی نوێوە سازی كرد و پێوەندییەكەشیان دوو ساڵی خایاند.

(بریسكۆت) بە ڕۆژنامەیەكی ناوخۆیی وڵاتەكەی ڕاگەیاندوە، ماوەیەكە پێوەندییەكەی لەگەڵ (تریسی)دا كۆتایی هاتوە و بە دووررودرێژیش ئەم بابەتەی لەگەڵ (پۆلین)ی هاوسەریدا باس كردوە و بە بیستنی چیرۆكەكە توشی شۆک بوە، (بریسكۆت) گوتیشی دەمەوێت كاری زۆر جوانتر بكەم ئەگەر لەگەڵ (پۆلین)ی هاوسەرم دا بەردەوام بین لەوەی پێكەوە بژین.

لە لایەكی تریشەوە (داوننگ ستریت) نووسینگەی تایبەتی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لەو بارەیەوە ڕایگەیاند: ئەو جۆرە پێوەندییانە شتی تایبەتی كەسەكانن و پشتیوانی لە (بریسكۆت) دەكەین.دوای ئەوەی بە شێوەیەكی نامۆ و سەرسوڕماناویی كێشەكە چارەسەركرا، (بریسكۆت) سەبارەت بەو پێوەندییە بە ڕۆژنامەی (ئینێدی پێندت)ی بەریتانی ڕاگەیاند» ئەو چەند ڕۆژە كەمەی ڕابردوو، ماوەی بیركردنەوە و هەڵسەنگاندن بوو بۆ ئەو كارەی كردوومە، پەند و وانەی زۆر باش لەو ئابڕووچوونەوە فێربووم، بە ڕاستی زۆر گەمژە بووم».

حکوومەتی ئیسرائیل بڕیاریدا بە گەڕاندنەوەی باڵیۆزی وڵاتەکەی لە سلڤادۆر، دوای ئەوەی بە سەرخۆشی و ڕووتی و دەستبەستراوی دۆزرایەوە، ئەویش بوە یەکێک لەو لێپرسراوە باڵایانەی ئیسرائیل کە توشی ئابڕووچوونی سێکسی و دارایی و سیاسی بوون، جگە لە (مۆشیە کاتساف)ی سەرۆکی پێشووتری ئیسرائیل، لای خۆشیەوە (زیهیفیت بن هیل)ی وتەبێژی حکوومەتی ئیسرائیل، تەئیکیدی کردەوە بڕیاری گەڕاندنەوەی باڵیۆزی ئیسرائیل لە وڵاتی سلڤادۆر ڕاستە و جێبەجێ کراوە.

بەپێی هەواڵێکی میدیاکانی ئیسرائیل، ڕۆژی (1ی فێبرایەری ساڵی 2008)، پۆلیسی سلڤادۆر (ڕافائێل)ی باڵیۆزی ئیسرائیلی لە سلڤادۆر بە ڕووتی لە گۆڕەپانی ماڵەکەی خۆیدا دۆزییەوە، بەپێی زانیارییەکانی پۆلیس و میدیاکانی ئیسرائیل، لە کاتی دۆزینەوەیدا، (ڕافائێل) سەرخۆش بوە، هەروەها دەستی بەستراوەتەوە و تۆپێکیش لە دەمیدا بوە و بەستراوە، جگە لەوەش هەندێک شتومەکی سێکسی پێوەبوو.

پۆلیس سەرەتا لە هەوڵدابوە بۆ ڕزگارکردنی ئەو پیاوە، بەڵام دواتر بۆی دەرکەوتوە کە باڵیۆزەکەی ئیسرائیلە، (بن هلیل)ی وتەبێژی حکوومەتی ئیسرائیلیش، وێڕای پشتراستکردنەوەی ڕووداوەکانی ناو ڕاپۆرتەکانی پۆلیسی سلڤادۆر، گوتیشی هەر چەندە باڵیۆزەکەیان هیچ یاسایەکی لەو وڵاتە پێشێل نەکردوە، بەڵام بڕیاردراوە بگەڕێندرێتەوە بۆ ئیسرائیل، بیرمان نەچێت ئێمە باسی هەڵس و کەوتێک دەکەین کە شایستەی دیبلۆماتکارێک نییە.

وتەبێژی حکوومەتی ئیسرائیل ئاشکراشی کرد باڵیۆزەکەیان هیچ سکاڵایەکی لە سەر هەڵس و کەوت و کارەکەی پۆلیسی سلڤادۆر تۆمار نەکردوە، ئەمەش بەو مانایەیە ئەو ئابڕووچوونە سێکسییە ڕاستە و ڕوویداوە.

(ڕافائیل)، شەش مانگ پێش ئەو ڕووداوە، وەک باڵیۆزی ئیسرائیل لە سلڤادۆر دەستبەکار بوە، پێشتریش چەند ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی دیبلۆماسی جیاوازی لە چەند ناوچە و وڵاتێکی تر پێ سپێردراوە.

ئەوەش یەکەم جار نییە، دیبلۆماتکارانی ئیسرائیلی توشی ئابڕووچوونی سێکسی دەبن، لە ساڵی (2000)دا، باڵیۆزی ئیسرائیل لە فەرەنسا، لە ڕووداوێکی نادیاردا و لە یەکێک لە هۆتێلەکانی پاریس گیانی لە دەستدا و وەزارەتی دەرەوەی ئیسرائیلیش ڕەتی کردەوە هیچ لێدوان و زانیارییەک لەوبارەیەوە بڵاو بکاتەوە، بەڵام میدیاکانی ئیسرائیل باسیان لەوەدەکرد ئەو باڵیۆزەی گیانی لە دەستداوە ژنێکی لەگەڵدا بوە کە هاوسەرەکەی خۆی نەبوە.

ساڵی (5005)، حکوومەتی ئیسرائیل ڕەتی کردەوە، دیبلۆماتکارێکی وڵاتەکەی وەک باڵیۆز لە ئوستралیا دابمەزرێنێت، چونکە لە بەرازیل وێنەی ژنێکی بەرازیلی بە ڕووتی لە سەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو کردەوە، لە کاتێکدا بە ئەرکێکی ڕەسمی چووبوە ئەو وڵاتەوە.

لە ساڵی (2007)یشدا حکوومەتی ئیسرائیل ناچاربوو باڵیۆزێکی نوێ لە ئوستralیا دابمەزرێنێت، چونکە (نفتالی تامیر)ی باڵیۆزی پێشووتری ئیسرائیل لە ئوستralیا ڕایگەیاندبوو (ئیسرائیل و ئوستralیا) وەک خوشکی یەکتر وان، لەبەر ئەوەی هەر دوو دەوڵەتەکە کەوتوونەتە کیشوەری ئاسیاوە، بەڵام گەلەکانیان هیچ سیفاتێکی ئاسیاییان نییە، واتا پێستیان زەرد نییە و چاویشیان بچووک نییە.

جێی ئاماژەیە پێشتریش (مەنحایم مزوز)ی داواکاری پێشووتری ئیسرائیل، داوای لە (موشیە کاتساف)ی سەرۆکی

پێشووتری ئیسرائیل کرد بە شێوەیەکی کاتی هیچ ئەرکێکی سەرۆکایەتی پیادە نەکات، تا کۆتایی هاتنی لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە تۆمەتبارکردنی بە دەستدرێژیکردنە سەر یەکێک لە سکرتێرەکانی و گێچەڵکردنی سێکسی بە چەند فەرمانبەرێکی تری نووسینگەکەی.

ئەو ڕاسپاردەیەی داواکاریی گشتی ئیسرایل، لە سەر داواکاریی یەکێک لە پارێزەرەکان بوە، کە پێشکەشی دادگای باڵای ئیسرائیلی کردبوو، ئەو پارێزەرە داوای کردوە (موشیە کاتساف)ی سەرۆکی ئیسرائیل لە پۆستەکەی دووربخرێتەوە، ئەگەر دامەزراوە ڕەسمییەکان بیسەلمێنن بەڵگەی تەواو هەیە لە سەر دەستدرێژی و گێچەڵی سێکسی (کاتساف) بەرانبەر بە سکرتێر و فەرمانبەرەکانی نووسینگەکەی.

ئابڕووچوونەکەی ئەم باڵیۆزەی ئیسرائیل، بوو بە بەشێک لە دۆسیەی تایبەت بە ئابڕووچوونە سێکسی و دارایی و سیاسییەکانی ئیسرائیل، وەک (ئیهود ئۆڵمەرت) سەرۆک وەزیری پێشووی ئیسرائیل، (دان حالتوس) سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئیسرائیل، (حاییم ڕامۆن) وەزیری دادی ئیسرائیل.

واديـاره ئـابڕووچـوونـه سێكسييه‌كان، زۆرتـريـن كێشه بۆ سه‌ركرده‌كانی ئه‌مريكا، كه له سه‌رۆكی ئه‌مريكاوه ده‌ستی پێكردوه و گه‌يشتۆته حاكمی ويلايه‌ته‌كان و ئه‌ندامانی هه‌ر دوو ئه‌نجوومه‌نی پيران و نوێنه‌ران.

(ئه‌ليوت سپيته‌رز)ی حاكمی ويلايه‌تی نيويۆرک، يه‌كێكی تره له‌و كه‌سانه‌ی ناوی له‌و ليسته‌ی سه‌ركرده ئه‌مريكييه‌كاندا هه‌يه كه توشی ئابڕووچوونی سێكسی بوه، به‌و هۆيه‌شه‌وه له پۆست و پێگه سياسييه‌كه‌ی لابراو داهـاتووی سياسيشی له ده‌ستدا، وابڕياربوو ببێته كانديدی سه‌رۆكايه‌تی ئه‌مريكا له هه‌ڵبژاردنه‌كه‌ی ساڵی (2012)دا.

له ڕاستيدا هيچ كاردانه‌وه‌يه‌كمان نابێت كاتێک گوێبيستی ئابڕووچونێكی سێكسی گرانبه‌های يه‌كێک له سياسه‌تمه‌دانی ڕۆژئاوا ده‌بين، كاتێک كه كرياره له تۆڕێكی له شفرۆشی، خه‌ريكی زينايه له‌گه‌ڵ له‌شفرۆش و سۆزانييه‌كاندا كه له ته‌مه‌نی كچه‌كه‌ی خۆيدان ياخود بچووكتريشن، ياخود ده‌ركه‌وتـوه كه نه‌سازی سێكسييه، گێچه‌ڵی سێكسی به‌و كچانه كردوه كه هيچ كه‌سێک نييه سه‌رپه‌رشتييان بكات، يان گێچه‌ڵی به يه‌كێک له فه‌رمانبه‌ره‌كانی خۆی كردوه، هه‌ندێک جار هيوای ئه‌وه‌ی خواستوه ببێته هه‌ڵم و نه‌مێنێت، له ترسی ئه‌وه‌ی نهێنييه‌كه‌ی ئاشكرا ببێت و هه‌موان به كرده‌وه‌كه‌ی بزانن، ياخود بيه‌وێت به هه‌ر جۆرێک بێت له‌و دۆخه خۆی ده‌رباز بكات كه بوه هۆی له ده‌ستدانی داهاتووی سياسی و ئه‌گه‌ری گه‌يشتن به‌و پێگه و ده‌سه‌ڵاته‌ی كه خه‌ونی پێوه‌ده‌بينی و ڕێگه‌ی بۆ نه‌ياره‌كانی چۆڵكرد، به‌ڵام له ساتێكدا هيچ فريشته‌يه‌ک بوونی نه‌ما و شه‌يتان تێيدا باڵاده‌ست بوو، هه‌موو ئه‌و شتانه‌ی له ناوبرد، كه به درێژايی چه‌ندين ساڵ بونيادی نابوو، ئه‌و ڕابردوه‌ی

هەیبوو وەک پەڕێکی بەردەم ڕەشابا فڕی و بوونی نەما.

هەر ئەمەش بە ڕاستی ڕوویدا، کاتێک لە مانگی مارسی ساڵی (2008)،دا (ئەلیوت سپیتەرز)ی حاکمی ویلایەتی نیویۆرک، لە ناو ئابڕووچوونێکی سێکسی قەبووڵ نەکراودا دەستی لە کار کێشایەوە، تۆمارێکی دەنگی (سپیتەرز)، ئەو داوەبوو کە پیاوێکی بەڕێز و بە ڕەوشتی تێ کەوت، ئەو کارە لە تۆمارکردنی دەنگی کڕیارێکی ناو یانەکانی ئەباتیرە دەستی پێکرد، کە داوای کارێکی ڕێگە پێ نەدراو و نادڵنیای دەکرد، ئەویش (بە کار نەهێنانی کۆندۆم بوە)، یانەی ئەباتیرە، تۆڕێکی لەشفرۆشی ئاست بەرزە، کە (سپیتەرز) حسابی تایبەتی تێیدا هەبوو، هەروەها دایکی ئەو ژنەشی لێ بوو کە دواتر پێوەندی لەگەڵ دروست کرد و لە نیویۆرکەوە چوو بۆ واشنتۆن.

لێکۆڵینەوەکانی پۆلیس، تەئکیدیکردەوە لە سەر ئەوەی کە حاکمی ویلایەتی نیویۆرک پێوەندی سێکسی لەگەڵ یەکێک لەو ژنانەی سەر شەقامەکانی شەوانەدا هەیە کە لە سەعاتێکدا نزیکەی (هەزار دۆلار) پەیدا دەکات، (سپیتەرز)یش نزیکەی (80) هەزار دۆلاری لەو ژنەدا خەرج کردوە.

دەستگیرکردنی (سپیتەرز)ی تەمەن (48) ساڵ، بە ڕەزامەندی دەسەڵاتی فیدراڵی ئەمریکا بوو، لە میانەی پرۆسەیەکی گوێگرتن لە پێوەندییە تەلەفۆنییەکانی، کە لانی کەم ڕۆژانی (12 و 13)ی فێبرایەر ڕۆژانە شەش جار قسەی لەگەڵ کردوە و شوێنێکی لە هۆتێل (مای فلاوەر) لە واشنتۆن ڕێکخستبوو بۆ ئەوەی یەکتری تێدا ببین .

ئابڕووچوونەکانی حاکمی ویلایەتی نیویۆرک کە لەگەڵ لەشفرۆشێکی یانەی (ئەمپیرۆر کلۆب فی ئی بی) تێوەگلابوو بەردەوامی هەبوو، بابەتەکە تەنها بەوەوە نەوەستا کە

(سپیتەرز) پۆستەکەی لە دەستدا، بە هۆی بە کار هێنانییەوە لە خزمەتگوزارییەکانی ئەو یانەیەدا کە زیاتر لە (50) لەشفرۆش لە بەرزترین ئاستی تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی پیاوانی کار و سیاسەتمەدارانی پێشەنگدا کاریان تێدا دەکرد.

بەڵکوو ڕۆژنامەی (نیوز ئۆف زە ۆرد)ی بەریتانی چەند زانیاری و وردەکارییەکی نوێی بڵاو کردەوە، کە بوە هۆی ئاشکراکردنی ناوی چەندین کەسایەتی سیاسی و سەرمایەداری گەورە، کە یەکێکن لە پێشەنگ و میوانە لە پێشەکانی لقەکانی تری ئەو یانەیە لە شارەکانی تری ئەمریکا و لەندەن و پاریس و زیورخ دا. کاتێک چیرۆکی ئەو تۆڕە لەشفرۆشییەی پێوەندی بەو یانەیەوە هەبوو ئاشکرابوو، کە نهێنی پێوەندییەکەی (سپیتەرز)ی حاکمی نیویۆرکی تەمەن (48) ساڵ و (ئەشلی ئەسکەندەر دۆبری) لەشفرۆشی تەمەن (22) ساڵ و چەند لەشفرۆشێکی تر دا وەک بۆمب تەقییەوە، بەوەی لە بەرانبەر بە دەستهێنانی خزمەتگوزارییە سێکسییەکانیان و لە ماوەی (10) ساڵی پێشووتردا زیاتر لە (40) هەزار جونەیهی ئیستەرلینی تێدا خەرج کردبوو.

ڕۆژنامەکە ئاماژەی بە ناوی خاوەنکار و ملیاردێرکی عەرەبی کردوە کە هەمیشە ناوەکەی لە گۆڤاری (فۆربس) دا وەک یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی جیهان بڵاو دەکرێتەوە، بەوەی بە بەردەوامی سەردانی لقی لەندەنی ئەو یانەیەی کردوە و پێوەندی سێکسی لەگەڵ لەشفرۆشێکی لیتوانیدا هەبوە بە ناوی (زانا).

ئەو لەشفرۆشە بە ڕۆژنامەکەشی ڕاگەیاندوە، پێوەندی سێکسی لەگەڵ کەسێکی بەریتانیدا هەبوە کە زۆر دەوڵەمەند بوە و بە (بریکاری ژمارە 6) ناسرابوو، بەپێی لێکۆڵینەوەکانی پێشتریش دەرکەوت (بریکاری ژمارە 6)ی زنجیرەی لەشفرۆشی،

(دۆق ویستمینستەر جیراڵد کافندیش گرۆزفینەر)ە، کە یەکێکە لەو ملیاردێرانەی ساڵانە لە لایەن گۆڤاری (فۆربس)ەوە وەک یەکێک لە دەوڵەمەندەکانی جیهان هەژمار دەکرێت و سەروەت و سامانەکەی نزیکەی (6.6) ملیار جونەیهی ئیستەرلینییە.

ژمارەیەکی تریش لەو کەسانەی گۆڤاری (فۆربس) وەک دەوڵەمەند و سەرمایەدارانی جیهان بڵاویان دەکاتەوە، ناویان لەو لیستەدابوو کە تێوەگلابوون لە تۆڕە لەشفرۆشییەکەی یانە ئەمریکییە ناودارەکەوە، هەروەها ڕۆژنامەکانی بەریتانیا ئاماژەیان بەوەکرد ژمارەیەک لە ئەندامانی پێشووی حکوومەتی بەریتانیا و نوێنەرانی ئەنجوومەنی گشتی و دادوەرەکان و ئەستێرەکانی سینەما و گۆرانیبێژە ناودارەکان و یاریزانە ناسراوەکانی تۆپی پێ، بەرکەوتن و پێوەندییان لەگەڵ ئەو تۆڕە جیهانییە لەشفرۆشییەدا هەبوە.

(زانا)ی لەشفرۆش بە ڕۆژنامەکەشی ڕاگەیاندوە هیچ کاتێک پێوەندی بە کڕیارەکانییەوە نەکردوە، «بەڵام دواتر ئامۆژگارییان کردم پێوەندی بەو کەسانەوە بکەم ناویان لە لیستی دەوڵەمەندەکانی جیهاندا هەیە، کە گۆڤاری فۆربس بڵاوی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی پێوەندی سێکسییان لەگەڵ دروست بکەم و لە بەرانبەریشدا بڕێک پارەی زۆر وەربگرم». هەروەها پێشی وابوو بەشێکی زۆری کڕیارەکانی خۆی و لەشفرۆشەکانی تری ناو یانەکە، لە پایتەختە گرینگەکانی ئەورووپاوە سەردانیان دەکردن. بەپێی ڕاپۆرتێکی ڕۆژنامەکانی بەریتانیا، پێدەچێت لیستی ناوی ئەو کەسانەی سەردانی ئەو یانەیە و لقەکانی تری یانەکەیان کردوە، لەبەر دەست نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی (USA)دا بێت، کە لێکۆڵینەوەی لە ئابڕووچوونەکەی (حاکمی ویلایەتی نیویۆرک)یش کرد.

ئەو لەشفرۆشانەی لە تۆڕی یانەکانی (ئەمپیرۆز کلۆپ فی ئی بی) ئەمریکی کاریان دەکرد، بە شێوەیەکی گشتی، لە هۆتێلە گرانبەها و پێنج ئەستێرەکان، یاخود ڤێلا و خانووی کرێارە ئەرستۆکراتەکان لە پایتەختەکانی ئەورووپا، کرێارەکانیان دەبینی و سێکسیان دەکرد، هەمیشەش گرانترین و جوانترین ئەو پۆشاکانەیان دەکڕی و دەپۆشی کە لە پیشانگا جیهانییەکاندا بۆ نمایشی جلوبەرگ پیشان دەدراو دەفرۆشران.

هەر پەیوەست بە دۆسیەی ئابڕووچونەکەی (سپینەرز)، (جۆرج فۆکس)ی هاوڕێی و هاوبەشی لە هەڵمەتەکانی بانگەشەی هەڵبژاردندا بۆ حاکمی ویلایەتی نیویۆرک، ڕاگەیەندراوێکی بڵاو کردەوە و تێیدا نیگەرانی و ناڕەزایی دەربڕیبوو لە بەرانبەر ئەوەی (سپینەرز) ناوی ئەوی لە پێوەندییە سێکسییەکانیدا بە کار هێناوە و کردوویەتییە بەشێک لە ئابڕووچوونە سێکسییەکانی.

(جۆرج فۆکس)، باسی لەوەشکردوە توشی نائومێدی و خەمۆکی و دڵتەنگییەکی زۆر بۆتەوە، کاتێک گوێی لە ڕاپۆرتەکەی (سپینەرز) بوە و ناوی ئەوی لە یانەکە بە کار هێناوە، بۆ بە دەستهێنانی خزمەتگوزاری سێکسی.

هەروەها دەشڵێت ئاشکرابوونی ناوەکەی لە دۆسیەی ئابڕووچوونەکەی (سپینەرز)دا، شتێکی چاوەڕواننەکراو بوە و توشی بێ هیواییەکی زۆری کردوە.

کۆمپانیایەکی پێوەندییە گشتییەکانیش بە نوێنەرایەتی (فۆکس) ڕاگەیەندراوێکی بڵاو کردەوە و تێیدا ئاماژەی بەوەکردوە «بە هیچ شێوەیەک بەڕێز فۆکس پێوەندی بەو کارە ناشرینەی سپینەرزی حاکمی ویلایەتی نیویۆرکەوە نییە، جگە لەوەی بە شێوەیەکی ڕێگەپێنەدراو و نەشیا و ناوەکەی بە کار هێنراوە»،

هەروەها باسی لەوەشکردوە «فۆکس، حاکمی ویلایەتی نیویۆرک بە هاوڕێیەکی نزیکی خۆی دەزانێت و نیگەران و بێ تاقەتە لەو شتانەی بیستویەتی و زانیوێتی». دوایین بەشی ئەم ئابڕووچوونە، دەستلەکارکێشانەوەی (ئەلیوت سپیتزەر) بوو لە پۆستی حاکمی ویلایەتی نیویۆرک، ئەوەش دوای هەڕەشەی لە سەر کار لابردن و ئەو فشارە میدیاییە زۆرەی لە سەری دروستبوو، بە هۆی تێوەگلانی لەو ئابڕووچوونە ڕەوشتییەدا.

(سپیتەرز) لە لێدوانێکی بۆ ڕۆژنامەنووسان کە (هاوسەرەکە) شی بە تەنیشتییەوە بوو، ڕای گەیاند «بە درێژایی ئەو ماوەیەی لە کەرتی گشتییدا کار و خزمەتی کردوە، هەمیشە بڕوای وابوە دەبێت هەموو کەسێک بەرپرسیارێتی هەڵس و کەوتەکانی خۆی لە ئەستۆبگرێت، ئیتر لە هەر پێگە و دەسەڵاتێکدا بێت». لەو لێدوانەیدا کە ڕوخساریشی چەند پەڵەیەکی پێوە بوو، گوتی «بۆخۆشم لەوە کەمتر قەبووڵ ناکەم، لەبەر ئەوەش لە ڕۆژی دووشەمەوە دەستلەکارکێشانەوەم لە پۆستی حاکمی ویلایەتی نیویۆرک پێشکەش دەکەم، چونکە نامەوێت بە هۆی کار و هەڵە تایبەتییەکانی منەوە، ئیش و کاری هاولاتییان پەکیان بکەوێت و ڕابوەستێت».

دوای بڵاو بوونەوەی دەنگۆ و وردەکاری ئابڕووچوونەکەی و داواکاریی کۆمارییەکان بۆ دەستلەکارکێشانەوەی لە پۆستەکەی، (سپیتەرز) کە باوکی سێ کچ بوو، بە ئاشکرا داوای لێبووردنی کرد لەوەی نە بە دوور نە بە نزیک باسی لە دەستلەکارکێشانەوەکەی نەکردوە، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی سوورنییە لە سەر بەجێهێشتنی پۆستەکەی.

لەو لێدوانەیدا کە (سیلدا وۆڵف)ی هاوسەری لە تەنیشتییەوە وەستابوو، (سپیتەرز) گوتی»ئەمڕۆ دەمەوێت لە سەر بابەتێکی زۆر

تایبەتی قسە بکەم، بە جۆرێک هەڵسوکەتم کرد هەموو پابەندی و پێوەندییەکم بە خێزانەکەمەوە پێشێلکرد و هەست بە گوناه و هەڵەی گەورە دەکەم، یەکەم جار و پێش هەموو شتێک داوای لێبووردن لە خێزانەکەم دەکەم، دواتر داوای لێبووردن لە جەماوەر دەکەم کە بەڵێنی دۆخێکی باشترم پێ دابوون. پێم وانییە داڕشتن و دانانی سیاسەتێکی دوور مەودا پێوەندییان بە کەسەکانەوە هەبێت، بەڵکوو پێوەندی بە بیرۆکە و کارکردنەوە هەیە لە پێناوی چاکە و خێری خەڵکدا هەیە، هەروەها پێوەندی بەوەوە هەیە کە چ شتێک باشترە بۆ ویلایەتی نیویۆرک، هەست بە نائومێدی و بێ هیوایی دەکەم، بۆ پاشگەزبوونەوە و بێ بەڵێنیم بەو پێوەرانەی بۆ خۆمم دانابوون».

هەندێک لە شارەزایان و سیاسەتمەداران پێیان وایە، ئابڕووچوونەکە بە شێوەیەکی زۆر خێرا بڵاو بۆوە و چوە سەرەوە، بەڵام بە هێواشی هاتە خوارەوە، ئەوەش چانسی (سپیتەرز)ی تەمەن (48) ساڵ بوو، کە لە لوتکەی فەرمانڕەوایی و حاکمێتی یەکێک لە گرینگترین ویلایەتەکانی ئەمریکایە، دابەزی بۆ نازناوی (کڕیاری ژمارە 9)، ئەو نازناوەش ئەندامانی تۆڕە لەشفرۆشییەکە بۆ وەسفکردنی (سپیتەرز) بە کاریان دەهێنا.

شکستەکەی (سپیتەرز) و دەستبەردابوونی پۆستەکەی، جۆرێک لە نائومێدی لای هاوڕێکانی دروستکرد، بەوەی ئەوان چاوەڕێی داهاتوویەکی سیاسی گەشیان لێ دەکرد، چونکە بە ڕێژەی (70%)ی دەنگەکان توانی هەڵبژاردن بباتەوە و ببێتە حاکمی ویلایەتی نیویۆرک، ڕەنگە یەکەم جوو بوایە ببێتە جێگری سەرۆکی ئەمریکا، یاخود یەکەم سەرۆکی جووی (USA)، دوای کۆتایی هاتنی ماوەی پۆستەکەی وەک حاکمی ویلایەتی نیویۆرک، کە یەکێکە لە گرینگترین ویلایەتەکانی ئەمریکا.

ئامادەبوانی ڕێورەسمی بە خاکسپاردنی تەرمی (فرانسوا میتران)ی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا، سەرسامبوون و دەیانویست بزانن ئەو ژنە ڕەش پۆشە کێیە، کە کڵاوێکی ڕەش و چاویلکەیەکی ئەستوری ڕەشی لە چاودایە و لەگەڵ کچە قژ زەردە غەمبارەکەیدا، هاوڕێیەتی (دانیاڵ میتران)ی هاوسەری کۆچکردوەکە دەکەن.

بەڵام، ئامادەبوان و ڕێورەسمەکەش بە تەواوی هەڵگەڕانەوە و توشی شۆک بوون، کاتێک زانییان ئەو ژنە ڕەشپۆشە خۆشەویستی سەرۆکی کۆچکردوو بوە، ئەو کچە قژ زەردەشی کە لەگەڵیدا بوە، کچە ناشەرعییەکەیانە، کە بەرهەمی خیانەتی هاوسەرگیری پیاوی یەکەمی فەرەنسا بوو.

بە ڕاستی ئەوە پاریسە، دایکی شتە شاز و سەرسوڕهێنەرەکانی دونیا، هاوسەر و خۆشەویستی یەک پیاو پێکەوە ڕێدەکەن، وەک ئەوەی ڕێککەوتبن و گەیشتبنە ئەو ئەنجامەی تازە لە دوای مردنی (فرانسوا) کێشە و ناکۆکی و ململانێی نێوانیان هیچ سوودێکی نییە بۆ کەسییان.

دواتر، فەرەنسا و هەموو جیهان توشی شۆکێکی تر بوون، کاتێک (کریستینا فۆرسن)ی ڕۆژنامەنووسی سویدی، کتێبێکی بە ناونیشانی (فرانسوا پێی گوتم) بڵاو کردەوە، مەبەستی (فرانسوا میتران)ی سەرۆکی کۆچکردووی فەرەنسا بوو، لاپەڕە و ناوەڕۆک و وێنەکانی ناو کتێبەکە، نهێنی گەورەتری تێدابوو، هەڵگری چیرۆکی خۆشەویستی و خیانەتێکی تری هاوسەرێتی فرانسوا میتران بوو.

هەر زوو ڕۆژنامە گەورە و کاریگەرەکانی فەرەنسا و جیهان، چەندین چاوپێکەوتن و ڕاپۆرتی ڕۆژنامەوانییان لەگەڵ

(کریستینا فۆرسن) سازکرد، له سەر ئەو پێوەندییەی بۆ ماوەی (17) ساڵ لەگەڵ (فرانسوا میتران) هەی بوو.

ڕۆژنامەی (فرانس سوار) ڕایگەیاند «(ڕافین)، ئەو کوڕە جوانە تەمەن هەشت ساڵەی لەگەڵ (کریستینا)ی دایکیدا دەژیا، (کوڕی ناشەرعی)، (فرانسوا میتران)ی کۆچکردوە»، بەڵام (کریستینا) ڕەتی کردەوە هیچ زانیارییەک له سەر باوکی منداڵەکەی به هاوکارانی پیشەکەی بدات، هەروەها به توڕەییشەوە خۆی له پرسیارەکە دزییەوە و گوتی «مارفن به تەنها کوڕی منه، ڕێگه به هیچ کەسێک نادەم ناوی باوکی بزانێت، ڕێگه نادەم هیچ کەسێک دەستدرێژی بکاته سەر ئەو بەشه زۆر تایبەتەی ژیانی خۆم».

(کریستینا) باسی له چیرۆکی یەکەم دیدار و چاوپێکەوتنی نێوان خۆی و (فرانسوا)ی کرد له ساڵی (1979)، کاتێک (ئۆڵف پاڵمێ)ی سەرۆک وەزیرانی کۆچکردووی سوید، به یەکی ناساندن و گوتی «کریستینا ڕۆژنامەنووسێکی گەنج و به توانایه و دەیەوێت چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ بکەیت»، لەو کاتەدا تەمەنی (فرانسوا) دوو هێندەی تەمەنی (کریستینا) بوو، بەڵام ئەو جیاوازییه گەورەیەی تەمەنی نێوانیان نەبوە ڕێگر له بەردەم پێوەندییەکەیاندا، لەوبارەیەوە (کریستینا) دەڵێت «لەو کاتانەدا ناو و تەمەن و پێگه و دەسەلات له بیر دەکرێت، هیچ شتێک بوونی نامێنێت جگه لەو هەستوسۆز و چێژ و خۆشییەی به دەستی دەهێنیت».

(کریستینا)، هیچ هەستی به شەرم نەکرد کاتێک ڕۆژنامەکانی فەرەنسا بەوە وەسفیانکرد که چەقۆیەکە له سەر دڵی خانەوادەی سەرۆک میتران، بەڵام خۆی له وەڵامدا گوتی، نەک هەر خانەوادە،

بەڵکوو هەموو چوار دەور و نێوەندە سیاسییەکەش».

(کریستینا) گوتیشی «هیچ شتێکی چوار دەوری ئەو خانەوادەیە ناتوانێت هێرشم بکەنەسەر و هەوڵی سڕینەوەم بدەن، ئەوەی من هەمە ئەوان نیانە، با بە هێواشی لە بەردەمم لابچن و بڕۆنە دواوە، باش بزانن، بە لای (فرانسوا)وە من ئەو ئازادیی و هەناسە و هەوایە بووم کە لە دووری زیندانە زێڕینەکەی و ژیانە ڕۆتینییە دووبارەکەیدا هەڵی دەمژی، من توانیم ئەو ژیانە پڕ لە مەلەلەی تێکبشکێنم کە پێش ناسینی من تێیدا دەژیا، لە ناخی خۆمدا شێوازێکی بیرکردنەوەی جێگیریم بەرانبەر بە فرانسوا دۆزییەوە، کە پێشتر لە سەری ڕانەهاتبوو.

(کریستینا)، لە کتێبەکەی و دواتریش لە چاوپێکەوتنەکانیدا، شتی نوێی لە بارەی (فرانسوا) وە باس دەکرد، کە پێشتر هیچ کەسێک نەیدەزانی و درکیان پێ نەدەکرد، لە ناو جەنگەڵێکدا خانوویەکی تایبەتییان هەبوو، بۆ ئەوەی دوور لە چاوی کۆمەڵگە و خێزان و ڕۆژنامە و پاسەوانەکان، بە ئازادی یەکتری تێدا ببینن، لە دارستانەکانیشدا زۆر دوور دەکەوتنەوە لە پاسەوانە تایبەتییەکان.

کەواتە بە پووختییەکەی، پێوەندی نێوان (کریستینا و میتران) لە هیچ شتێکی کەم نەبوو جگە لەو نووسراوە ڕەسمییەی پێوەندی نێوان ئەو دوو کەسە دەکاتە پێوەندییەکی پاک و ڕەسمی و شەرعی، هەروەها (ڕافان)ی کوڕیشییان دەبوە کوڕێکی شەرعی و بەڕێزی ناو کۆمەڵگە، بەڵام ئەو کارەیان نەکرد و ئەو نووسراوەیان نەکرد.

زۆرینەش دەزانن کە (فرانسوا میتران)ی سەرۆکی کۆچکردووی فەرەنسا، لە دەرەوەی پێوەندییە خێزانییەکەی،

چەند دۆست و پێوەندییەکی تری خۆشەویستی و سێکسی هەبوو، یەکێکیان (ئان بینگوت)ە، بەرهەمی ئەو پێوەندییەش لە دایک بوونی (مازارین) بوو لە ساڵی (1974)، کە تا ساڵی (1994) بە نهێنی مایەوە و لە چاوی میدیاکان دوور خرابۆوە، بەڵام لەو ساڵەدا باوکی، بە هۆی خراپبوونی باری تەندروستی و هەروەها نزیکبوونەوەشی لە خانەنشین بوون و بەرگەنەگرتنی فشاری میدیاکانەوە، ئاشکرایکرد، ناسنامەکەی (مازارین) بە ناوی (مازارین ماری بینگوت)ەوە تۆمارکرابوو، بەڵام لە ساڵی (2005) دا نازناوی (میتران)ی باوکی بۆ سەر ناسنامەکەی زیادکرا.

کتێبێکی تریش لە سەر ژیان و هەندێک نهێنی (فرانسوا میتران) بە ناونیشانی (گفتوگۆکەرێکی نایاب) بڵاو کرایەوە، کە لە لایەن (دانیل گامبا)ی پاسەوانی تایبەتی (سەرۆک میتران) ەوە ئامادەکرابوو، (گامبا) بە درێژایی (14ساڵ) پاسەوانی تایبەتی (فرانسوا میتران) بوو، باسی هەندێک لە پێوەندییە ڕۆمانسییەکانی (سەرۆک میتران) و کێشەکانی لەگەڵ (دانیاڵ میتران)ی هاوسەری و ئابڕووچوونەکانی نێو کۆشکی ئەلیزێی کردوە.

)دانێل گامبا) دەڵێت «هیچ کاتێک سەرۆک میتران دوودڵ نەبوو لەوەی پەلاماری ئەو ئافرەتە بدات کە سەرنجی ڕادەکێشێت، تەنانەت لە ئاهەنگ و بۆنە ڕەسمییەکانیشدا، جارێکیشییان پێی گوتم ئافرەت و ژنان دەکرێن بە چوار بەشەوە (....) دەشیزانی هیچ ژنێک بانگهێشتێکی سەرۆک بۆ ئێوارە خوانێک ڕەت ناکاتەوە، یەکەم دیداری هەر قوربانییەک بە بانگهێشتکردنی ئێوارەی بۆ کۆشکی ئەلیزێ کۆتایی دەهات، کە تا بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر نەیدەتوانی بچێتە دەرەوە».

(گامبا) باسی لەوەشکردوە (فرانسوا میتران) زیاد لە هەر کەسێکی ناو خێزانەکەی و شتێکی تر هۆگری سەگەکەی بوو بە ناوی (بەلتیک)، ڕۆژێکیش بە هۆی کرانەوەی دەرگای دەرەوەی کۆشکەکە، سەگەکە دیارنەماو ون بوو، ئەوەش (فرانسوا)ی زۆر تورەکرد و  بە یەک جار چوار پاسەوانی دەرکرد.

هەروەها (گامبا) باسی لە دەردەسەرییەکانیشی کردوە بە دەست (مازارین)ی کچە ناشەرعییەکەی سەرۆکەوە، بەوەی چۆن لە سەر پاسکیل پاڵی پێوەناوە و لە بەردەم هاوڕێکانیدا خلیسکێنەیان کردوە بۆ ئەوەی پێی بکەنن.

(ليندۆن جۆنسۆن)ی سەرۆکە قێزەونەکەی ئەمریکا (8) سکرتێرەی تایبەتی هەبوو، کە لەگەڵ (5)یاندا و لە ناو دڵی کۆشکی سپیدا پێوەندییەکی سێکسی هاوشێوەی پێوەندی ژن و مێردانەی هەبوو، لە گەرمە و قەرەباڵغی ئاهەنگەکاندا، چاوی بۆ ژن و کچی جوان دەگێڕا، هەر کەسێکیش سەرنجی ڕابکێشایە، ئەوا یاریدەدەرەکانی دەنارد تا بۆی بهێنن، هەڵبەت ئارەزووی سەرۆکیش ڕەت کردنەوەی نەبوو.

ڕۆژێکییان (لیدی بیرد)ی هاوسەری (جۆنسۆن)، دەرگای ژوورە هێلکەییەکەی کۆشکی سپی کـردەوە، کـە تێیدا پێشوازی لەو سـەرۆک و سەرکردانەی جیهان دەکـرا کە دەچوونە ئەمریکا، (لیدی) بینی کە (جۆنسۆن)ی هاوسەری و یەکێک لە سکرتێرەکانی، کارێکی ئابڕووبەرانە دەکەن، دوای شەڕ و دەمەقاڵێیەکی گەورەی ژن و مێردانە، (جۆنسۆن) پاسەوانە تایبەتییەکانی بانگ کرد و پێی گوتن دەبێت ئێوە شتێک بکەن، بەڵام یەکێک لە پاسەوانەکان زۆر بە بوێرییەوە وەڵامـی دایـەوە «ئێمە هیچ هەڵەیەکمان نەکردوە، ئەوە بە تەنها کێشەی تۆیە».

سەرەڕای ئەو ئابڕووچوونە، بەڵام (جۆنسۆن)ی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا دەستبەرداری هەڵسوکەوتە نەشیاوەکانی نەبوو، تەنها وەک خۆ پارێزییەک فەرمانی بە پاسەوانەکانی کرد ئامێرێکی (ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت) لە (ئەسانسۆرەکە)دا بنێن، بۆ ئەوەی جارێکی تر هاوسەرەکەی بە خیانەتێکی تری هاوسەرییەوە نەیگرێت، بـەوەش هـەر یـەک لە پاسەوانەکان (لیدی) هاوسەری سەرۆکیان ببینیایە کە بچێت بۆ نووسینگە هێلکەییەکە، ئەوا دەستی دەنا بە زەنگی ئاگادارکردنەوەدا، بۆ

ئەوەی (سەرۆکی ئەمریکا) بزانێت کە هاوسەرەکەی بەڕێوەیە بۆ لای و خۆی ئامادە بکات.

چەند چیرۆکێکی تریش لێرەولەوێ باس دەکرێن، سەبارەت بە بوونی پێوەندی تری ڕۆمانسی و سێکسی (جۆنسۆن) لەگەڵ ڕۆژنامەنووسە ژنەکان و هەندێک لەو کچانەی کە یاریدەدەرەکانی بۆیان دەبرد، جارێکیان (جۆنسۆن) سێ کچی لە کێڵگەیەکی تەکساسەوە هێنا و سووربوو لە سەر ئەوەی لە کۆشکی سپی هەرسێکییان دابمەزرێن بۆ ئەوەی لە ژێر ئاماژە و خواستەکانیدابن.

ساڵی (1994) (لی زی سوا) کە پزیشکێکی چینی بوو لە (USA)، کتێبێکی گرینگی بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (ژیانی بەربەری ماوی مەزن).

(لی) پزیشکی تایبەتی سەرکردە (ماو تسی تۆنگ) بوو، کە فەرمانڕەوایەکی ڕەهای یەکێک لە بەهێزترین دەوڵەتانی جیهان بوو، (ماو) کۆمۆنیستێکی توندڕەو بوو، ڕەتکردنەوەی فەرمانەکانی قەبووڵ نەدەکرد، هەروەها نەدەبوایە حەزو ئارەزووە سێکسییەکانی ڕەت بکرێتەوە، لە سێکسدا وەک گورگێکی هار وابوو هیچ کات تێربوونی نەبوو، هاوشێوەی گۆڕانی گۆرەوی و پێڵاوەکانی ژنان و کچانی دۆستی دەگۆڕی، یاریدەدەرەکانی ئاهەنگی چێژبەخشیان بۆ ساز دەکرد و سەدان ژن و کچی بچووکیان بانگهێشت دەکرد، بۆ ئەوەی حەزی چوە سەر کامیان، چێژی لێ وەربگرێت و سێکسی لەگەڵ دا بکات.

ئەو پزیشکە چینییە لە کتێبەکەیدا دەڵێت «ماو، باوەڕی وابوو سێکس تاکە ڕێگە و تاکە ئامرازە بۆ جوانکردنی ژیان، بەڵام هەندێک لاوازیی سێکیشی هەبوو، دەشیویست ئەو گرێیەی بۆی دروستبوە بیگوازێتەوە بۆ زۆرترین ژن و کچی چین، تا شانازی بە نەخۆشییە سێکسییەکەیانەوە بکەن کاتێک لە ژووری نووستنەکەی (ماو) دەهاتنە دەرەوە، ئەمەش تاکە ئاماژە بوو کە ئەو ژنە بە ڕاستی لەگەڵ ئەو سەرکردەیەی چیندا خەوتوە و سێکسی کردوە.

هەروەها لەم ماوەیەی دوایدا (کیوکیزیۆلۆنگ)ی نووسەری چینی، چیرۆکێکی نوێی بە ناونیشانی (سەماکارەکەی ماو) چاپ و بڵاو کردەوە، تێیدا باسی لە وردەکاری هەندێک لایەنی ژیانی (ماو تسی تۆنگ) کردوە.

ئەو چیرۆکنووسە ئەوەی ئاشکرا کردوە (ماو) زۆر حەزی لە سەماکردن بوە، هەروەها ژنە بچووکەکانیشی خۆش دەویست و چەندین سەعات لەگەڵیاندا دەمایەوە، سەمای دەکرد، مەلەی دەکرد، گوێی لە موزیک دەگرت، بە تەواوی دەیویست وەک فەرمانڕەواکانی پێشوو بژی.

ئەو نووسەرە چەند جارێک باسی لەوەکردوە سەرۆک (ماو تسی تۆنگ) عاشقی سەماکردن بوە، هەر کاتێکیش بچوایە بۆ شاری شەنگەهای، حەزیدەکرد (شانگ یونگوان)ی ژنە هونەرمەند و شاژنی تەلەڤزیۆنی چین لە پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا هاوڕێیەتی بکات.

ئەو ژنە هونەرمەندە لە سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی ڕۆشنبیردا خۆی کوشت، شۆڕشەکە لە لایەن (ماو تسی تۆنگ) ەوە هەڵگیرسێنرا، بە مەبەستی لە ناوبردن و دوور خستنەوەی ئەوانەی بە (تابووری پێنجەمی ناو حیزب) ناوی دەبردن، شۆڕشە ڕۆشنبیرییەکەی ماو، کاریگەری لە سەر زۆرینەی ئەو وڵاتە دروستکرد، کە ئامانجی سەرەکی نوێکردنەوە و ڕامالینی شتەکۆنەکان بوو وەک (بیروباوەڕە کۆنەکان)، (ڕۆشنبیرییە کۆنەکان)، (دابونەریتە کۆنەکان).

دوای ئەوەی (شانگ یونگوان) خۆی کوشت، (کیان)ی کچیشی لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا گیانی لە دەستدا، بە تەنها کچێکی لە پاش بەجێما بە ناوی (جیاو)، ئەم کچە لە سەرەتادا نەبوە جێی سەرنجی دەسەڵاتدارانی چین، چونکە دەستی لە کارە سادەکەی کێشایەوە، بۆ ئەوەی لە شووقەیەکی گرانبەهادا بژی، کە تەنها شایستەی خاوەن سەرمایە گەورەکانە.

(جیاو) سەردانی وێنەکێشێکی پیری بە ناوی (کزی) دەکرد، کە توانیبووی لە کاریگەرییەکانی (شۆڕشی ڕۆشنبیری)

چین ڕزگاری بێت، تا ئەو کاتەش هەندێک لەو شتە کۆنانەی پاراستبوو کە حەزی پێیان بوو، هەروەها لە (ئەتیلیە)ش کە کاریی لێ دەکرد، پێشوازی لەو کەسانە دەکرد کە لە هۆنگ کۆنگ و تایوان و وڵاتانی تری ئەورووپاوە سەردانیان دەکرد.

دەسەڵاتدارانی چین ترسیان لەوە هەبوو (جیاو) پێوەندی لەگەڵ سیخوڕە بیانییەکاندا هەبێت، هەروەها دەشترسان لەوەی هەندێک بەڵگەی لابێت کە ژیانی سێکسی (ماو تسی تۆنگ) ڕووبەڕووی ئابڕووچون بکاتەوە، بۆیە هەمیشە بە دوایەوەبوون.

(کیوکیزیۆلۆنگ)ی نووسەری چینی، لە کتێبەکەیدا ئیدانەی (شۆڕشی ڕۆشنبیری) کردوە، بەوەی کاریگەری خراپی لە سەر زۆرینەی لایەنەکانی ژیانی ئەو وڵاتە دروستکردوە، ئەوەش بە هۆی دەستگیرکردن و لە ناوبردنی کادرە گرینگەکانی ناو حیزب و ڕۆشنبیران و زانا شارەزا و بە نرخەکان.

(کیو)یش، یەکێک بوو لە قوربانیانی (شۆڕشی ڕۆشنبیری)، بەوەی باوکی کە خاوەنی کارگەیەکی بچووکبوو، بە خیانەتکار و کۆنەپەرست تۆمەتبار کرا و دەستگیرکرا، لە زیندانیشدا توشی نەخۆشی بوو، کاتێکیش کوڕەکەی سەردانی کرد، بینی کە لە دۆخێکی زۆر خراپدایە، بۆیە ناچاربوو چەند سەعاتێک بە پێوە بمێنێتەوە، ئەو کتێبانەش لە سەر سنگی دانرابوون، کە ئیدانەی تاوان و کردەوە تاوانکارییەکانی دەکرد.

لەم چەند ساڵەی کۆتاییدا، بەڵگەیەکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاشکرای کرد، (ماو تسی تۆنگ)ی سەرکردەی مەزنی گەلی چین، لە ساڵی (1973)دا، پێشنیارێکی داوەتە (هێنری کەیسنجەر)ی وەزیری دەرەوەی ئەو کاتەی ئەمریکا، کە (10) ملیۆن ژنی چینی ڕەوانەی (USA) بکات.

بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، (ماو) وەک دیاری باسی ئەو ناردنەی نەکردوە، بەڵکوو وەک جۆرێک لە بازرگانی نێوان هەر دوو وڵات ئەو پێشنیارەی بۆ میوانە ئەمریکییەکەی کردبوو کە لە (پەکین) بوو، گوتیشی» خۆتان دەزانن چین وڵاتێکی زۆر هەژارە، هیچ شتێکمان لێ زیاد نییە، تەنها ژنان نەبێت، بۆیە ئەگەر ئێوە هەندێکتان دەوێت ئێمە دەتوانین دەیان هەزارتان بۆ بنێرین، ئایا ژنە چینییەکانی ئێمەتان دەوێت؟ دەتوانین (10) ملیۆن ژنی چینیتان بۆ ڕەوانە بکەین». (کەیسنجەر)یش، پێکەنینی بەو پێشنیارە نامۆیە هات و گوتی بیری لێ دەکەینەوە. ئاشکرابوون و بڵاو کردنەوەی ئەم بەڵگەنامەیە لەم ساڵانەی دواییدا، بوە هۆی تووڕەکردنی زۆربەی چینییەکان.

(ماو تسی تۆنگ) لە (20ی دیسەمبەری ساڵی 1893) لە خێزانێکی جووتیار لە گوندی شاوشان لە هەرێمی هونان لە دایک بوە، هەر لە منداڵییەوە سەرقاڵی کاری کشتوکاڵی بوو، لە کارەکەی و خوێندنەکەشیدا سەرکەوتووبوو، هەروەها توانی کۆرسی زمانی چینی و کۆنفۆشیۆس و کاری نووسەرە کلاسیکییەکانی چین بخوێنێت، گرینگی و بایەخێکی زۆریدەدا بە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە مێژووی شۆڕشەکانی جووتیاراندا. بە پێی سروشتی خۆی کەسێکی یاخی و سەرکێش بوو، لە تەمەنی (10) ساڵیدا و لە دژی مامەڵەی خراپی مامۆستاکەی و لە ترسی کاردانەوەی توندی باوکی لە ماڵی باوکی هەڵات.

لە تەمەنی (14) ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکدا کرد کە چوار ساڵ لە خۆی گەورەتربوو، لە (18) ساڵیشدا ڕووی کردە شاری (تشانگ شا) و بەشداری کرد لە تاقیکردنەوەی تایبەت بە وەرگرتن لە پەیمانگای سیانگ هیانگ و لەو تاقیکردنەوەیەشدا سەرکەوتووبوو.

قۆناغی یەکەمی ژیانی (ماو تسی تۆنگ) لە نێوان (-1911 1912) دەستی پێکرد، کاتێک شۆڕشی چین بوە هۆی ڕووخاندنی حکوومەتی (ئەلمانچۆ) و دەرکەوتنی کۆماری چین.

لە ئۆکتۆبەری ساڵی (1911)دا پێوەندی کرد بە سوپای شۆڕشگێڕانەوە کە پشتیوانی لە دۆسییەی کۆماری چین و (چن یات چن)ی سەرۆکی دەکرد و لە فێبرایەری ساڵی (1912)دا خزمەتی سەربازی تەواو کرد.

دواتر، پێوەندی کرد بە پەیمانگایەکی تایبەت بە بازرگانییەوە کە خوێندن تێیدا بە زمانی ئینگلیزی بوو، بەڵام نەیتوانی لەگەڵ ئەو سیستمی خوێندنەدا بگونجێت و دوای یەک مانگ وازی لە پەیمانگا هێنا، بەو جۆرەش ئەو ساڵی خوێندنەی بە خوێندنەوەی چەند شاکارێکی مەزنی جیهانییەوە بە ڕێکرد، وەک (ڕۆسۆ، مۆنتسکیۆ، ئادەم سمیس، جۆرج ستیوارت میل، داروینسن، سپنسەر).

ساڵی (1913) پێوەندی کرد بە پەیمانگای باڵای مامۆستایانەوە و تا ساڵی (1918) بەردەوام بوو، لەو ماوەیەشدا بە چالاکییەکان و بەشدارییەکانی بواری خەباتی خوێندکاری ناسرابوو، لە ساڵی (1917) لە یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەو کاتەدا، بانگەوازێکی بۆ لاوان بڵاو کردەوە بەوەی کە هاوبۆچوون و هاوڕای ئەون، پێکەوە ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی دروستبکەن و دواتر ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (کۆمەڵەی هاوڵاتییە نوێیەکان).

لە سەرەتادا تەنها سێ کەس بە دەنگ داواو بانگەوازەکەیەوە چوون، یەکێکییان (لی لیسیان) بوو، لەو کاتەدا (ماو تسی تۆنگ) تەمەنی (24 ساڵ) بوو، باوەڕی زۆری بە دیموکراتییەتی لیبراڵی هەبوو، دژایەتی نەیارەکانی دەکرد کە لایەنگری سیستمی سەربازی و ئیمپریالیزمیان دەکرد.

له ساڵی (1918)دا ڕووی کرده شاری پەکین و بۆ ماوەیەک لە کتێبخانەی گشتی پەکین بوو بە فەرمانبەر، دواتر چوە شاری (شەنگەهای) و لەوێ چەند کەسێکی مارکسی ناسی و باوەڕی بە مارکسیزم پەیداکرد، یەکێک بوو لە بەشداربوانی بزووتنەوەی لاوان لە دژی ئیمپریالیزم ساڵی (1919)دا  کە بە (بزووتنەوەی 4ی مایۆ) ناسرابوو.

دواتر گەڕایەوە بۆ هەرێمی (هونان)، کە تێیدا پێگەیشت و کۆمەڵەیەکی نوێی دروستکرد بە ناوی (لە پێناوی هونانێکی هاوچەرخ و سەربەخۆ)دا.

شیوعییەکانی چین و پارتی نیشتمانی ئەو وڵاتە هاوپەیمانێتییەکیان پێک هێنا لە پێناوی یەکخستنەوەی چیندا، بەڵام بە هۆی بێ متمانەیی نێوان شیوعییەکان و (تشیانگ کای شیک)ی سەرکردەی پارتی نیشتمانی چین، بوە هۆی هەڵایسانی جەنگ و ناکۆکی لە نێوان ئەو دوو گروپەدا، ساڵی (1928) (ماو تسی تۆنگ) و ژمارەیەکی تری سەرکردە شیوعییەکان سەرکردەی چەند گروپێکییان دەکرد بەرەو پارێزگای جیانکس، لە ساڵی (1931)دا ئەو پارێزگایە بوە ئامانجی سەرەکی و لە پێشینەی (تشیانگ کای شیک)، بۆ ئەوەش زنجیرەیەک لە سزای لە سێدارەدانی شیوعییەکانی ئەو پارێزگایە ئەنجام درا، کە بوە کۆتایی هاتنی تەواوەتی شیوعییەت.

ساڵی (1934) و لە ڕێپێوانێکدا کە بە درێژترین ڕێپێوان ناسراوە و درێژییەکەی (9.700) کیلۆمەتر بوو و دوای ساڵێک کۆتایی هات، (ماو تسی تۆنگ) سەرۆکایەتی شیوعییەکانی دەکرد بەرەو پارێزگای (شانکسی- شنسی)، دواتر گوند و ناوچەکانی تری نزیک ئەو پارێزگایە لە ژێر سەرکردایەتی (ماو) دا یەکییان گرت.

دوای داگیرکردنی (مەنشوریا) لە لایەن هێزەکانی ژاپۆنەوە لە ساڵی (1931)دا، ژاپۆن جەنگێکی گەورە و هەمەلایەنەی لە دژی چین بەرپا کرد، بەو هۆیەشەوە شیوعییەکان و پارتی نیشتمانی فەرمانڕەوای چین، جارێکی تر هاوپەیمانێتییەکیان پێک هێنایەوە بۆ ئەوەی پێکەوە ڕووبەڕووی هەڕەشە و مەترسییە دەرەکییەکان ببنەوە، ئەو هاوپەیمانێتییەش تا کۆتایی هاتنی جەنگی دوەمی جیهانی لە ساڵی (1945) بەردەوام بوو.

کاتێکیش لە لایەن سوپای ژاپۆنەوە، هێزەکانی سوپای حکوومەتی نیشتمانی چین بەرەو ناوەوەی خاکی چین پاشەکشەیان پێکرا، (ماو تسی تۆنگ)، سەرکردایەتی جەنگێکی پارتیزانی دەکرد بۆ ئازادکردنی وڵات و بڵاو کردنەوەی بیری شیوعییەت.

لە ساڵی (1945)دا، شیوعییەکان توانیان ناوچەیەکی فراوانی چین کۆنترۆڵ بکەن کە دانیشتوانەکەی نزیکەی (100) ملیۆن کەس بوو، ساڵێک دواتریش جەنگێکی فراوان لە نێوان شیوعییەکان و حکوومەتی نیشتمانی چین لە مەنشوریا بەرپابوو، لە ئاکامی ئەو جەنگەدا و لە ئۆکتۆبەری ساڵی (1949)دا شیوعییەکان توانیان هەموو چین کۆنترۆڵ بکەن و (نیشتمانی)ییەکانیش بەرەو تایوان هەڵاتن.

(ماو تسی تۆنگ) توانی لە ماوەیەکی زۆر کەم دا هەموو چین یەکبخاتەوە و کۆمەڵگەیەکی توندوتۆڵی بونیادنا، بە جۆرێک زۆرینەی چاودێرانی دۆخی چین، یەکخستنەوە و توندوتۆڵکردنەوەی ئەو وڵاتەیان بە ئەستەم دەزانی.

دوای ئەوەشی دەسەڵاتی وڵاتەکەی گرتە دەست، هاوپەیمانێتییەکی باشی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت پێک هێنا، کە

یارمەتیدەربوو بۆ بەهێزکردنی سوپای چین، کاتێک لە جەنگی کۆریادا (-1950 1953) پشتیوانیان لە کۆریای باکوور دەکرد.

لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، (ماو) دەستی کرد بە جێبەجێکردنی بەرنامەی فراوانکردن و گەشەپێدانی سیستمی کشتوکاڵی و بەرهەمهێنانی پیشەسازیی، بەڵام پرۆگرامی هەنگاونانی گەورە بەرەو پێشەوە کە لە ساڵی (1958)دا ڕاگەیەندرا، توشی شکست بوو.

لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، کێشەو ناکۆکی لە نێوان چین و یەکێتی سۆڤیەتدا دروستبوو، ئەمەش بوە پاڵنەری سەرەکی بۆ ئەوەی (ماو) پرۆگرامی ئەتۆمی چین جێبەجێ بکات.

لە ساڵی (1959)دا (ماو تسی تۆنگ) وازی لە پۆستی سەرۆکایەتی چین هێنا و خۆی تەرخانکرد بۆ سەرکردایەتیکردنی دەوڵەت و حیزبی شیوعی چین، دوای کێشە و ناکۆکییەکانی چین و یەکێتی سۆڤیەت، (ماو تسی تۆنگ) بوە تاکە شیکەرەوە بۆ تێگەیشتن لە مارکس و لینین و ستالین، باوەڕی وابوو دەبێت گەلە هەژارەکان شۆڕش لە دژی گەلە دەوڵەمەندەکان بەرپا بکەن، هەروەک هەڵوێستەکانی یەکێتی سۆڤیەتی بۆ نزیک بوونەوە لە (USA)ی ئیدانە کرد.

لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، چین توشی چەند هەڵبەزودابەزێکی دیبلۆماسی بوو، (ماو) پێشنیاری کرد سیاسەتی شۆڕشی ڕۆشنبیری جێبەجێ بکرێت، ئەوەش وەک وەڵامدانەوەیەک بۆ ئەو کەسانەی داوای چاکسازییان دەکرد لە پێناو پارێزگاریکردن لە هەست و ڕۆحی شۆڕشگێڕانە، لە ساڵانی حەفتاکانیشدا، هێور هێور چین پێوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوادا ئاسایی دەکردەوە.

(ماو تسی تۆنگ)، دوای ململانێیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشیدا کۆچی دوایی کرد، دوای مردنەکەشی سەرکردەکانی چین سەر لە نوێ پێداچوونەوەیان بە سیاسەت و بیرکردنەوەکانیدا کرد و تەرکیزیان خستە سەر لایەنی کەسایەتییەکەی، ڕووشیانکردە (USA) و ژاپۆن و دەوڵەتانی ئەورووپا، بۆ ئەوەی یارمەتییان بدەن لە پەرەپێدانی پیشەسازی و کشتوکاڵ و زانست و بەهێزکردنی هێزە چەکدارەکانی چیندا، ئەو ئامانجانەش بە (چوار نوێکراوەکە) ناسرابوو.

بابەتی تێوەگلانی پادشایەکی عاشق لە هەر شتێکدا کە هەواو هەوەس و ئارەزووەکانی تێر بکات، شتێکی زۆر ئاسان بوو، بەڵام بە هیچ شێوەیەک نەبوە خاوەنی هزر و توانا و ئەزموونێکی باش لە فەرمانڕەواییکردن و بڕیاردانێکی لۆژیکیانە و خاوەن ئیرادەدا.

(مەدام دی بۆمبارۆ) ناوی (جان ئەتوانێت بواسۆن) بوو، منداڵێکی جوان و سەرنج ڕاکێش بوو، جارێکیان ژنێکی فاڵچی و دەستگرەوە پێی گوت بە هۆی جوانییەکەیەوە لە داهاتوودا دەبێتە کەسێکی گرینگ لە فەرەنسا، هاوشێوەی (شاژنەکان)، بۆیە دەبێت پارێزگاریی لە جوانییە سەرنج ڕاکێشەکە بکات.

(جان) نەوەی یەکێک لە خێزانە مام ناوەندەکان، لەو سەردەمەی ئەودا، واتا سەدەی هەژدە، هەستی ژندۆستی و زیرەکییەکانی، هۆکاربوون بۆ زیادبوون و بەرزبوونەوەی پێگە و دەسەڵاتی ژنان.

ئەوەی گرینگ بوو، دایکی (جان) هەستی بە جوانییە تایبەتییەکەی کچەکەی دەکرد و بوە پشتیوان و هاندەرێکی تەواو بۆ خواست و بەهرە و ئارەزووەکانی، لەو چوارچێوەیەشدا فێری خوێندن و خوێندنەوەی کرد، فێری کرد، ڕۆشنبیری کرد، ڕاهێنانی پێ دەکرد لە سەر فێربوونی سەماو گۆرانی گوتن و موزیک و وێنەکێشان. لەبەر ئەوەشی هەر لە منداڵییەوە بەو بیروبۆچوون و شێوازە گەورەکرا و پڕبوو لە هەستکردن بەو جوانییەی هەیبوو، تەناتەت لە دوای ئەوەشی هاوسەرگیری لەگەڵ یەکێک لە خانەدانەکاندا کرد، دەیزانی چۆن بیربکاتەوە و هەموو ژنێتی خۆی بخاتە خزمەتی ئەوەی چۆن پادشا بخاتە داوی خۆیەوە.

پلانەکەشی ئـەوەبـوو، لـە دارستانەکانی (سـینـار)داو بە ئەنقەست گالیسکەکەی لە بـەردەم کـاروانـی ڕاوکـردنـەکـەی (لویسی پانزەیەم) ڕاگرت، بە پێکەنین و نیگایەک بۆ پادشای فەرەنسا، توانی هەستی پادشا بجوڵێنێت و هیوای ئـەوەی خواست جارێکی تر ئەو کیژۆڵە جوانە ببینێتەوە، ئەو بینینە بە ئەنقەستەش، جارێکی تر لە ئاهەنگێکی خانەی شارەوانی پاریسدا دووبارە بۆوە و یەکییان بینییەوە، بەڵام ئەم جارە زۆر پیلان بۆ داڕێژراوتربوو لە جاری یەکەم.

لـەو سـەردەمـەدا، خۆشـەویسـت و دۆسـتـەکـانـی پـادشـا، ڕۆڵێکی گرینگییان لە پرۆسەی سیاسیدا هەبوو، چونکە هەم بۆچوونەکانیان گوێی لێ دەگیـرا، هـەم داواکارییەکانیشان وەک خۆی جێبەجێ دەکرا، تەنانەت هەندێک جار لە خودی شاژنەکانیش زیاتر و لە پێشتربوون، بەوەی ئەوان هێندەیان بە سە کە شانازی ئـەوەیـان پێ براببوو هـەم خۆیان و هەم منداڵەکانیشیان هەڵگری نازناوی پادشایەتی بوون.

یەکەم دۆست و خۆشەویستی پادشا، (بمبادۆر) یان (دۆقە شاتوورو) بـوو، کە بە داخ و حەسرەتێکی زۆرەوە لە ساڵی (1745)دا کۆچی دوایی کرد، دواتر (لویسی پانزەیەم) نازناوی (مەرکیزە دی بمبادۆر) یان (کۆنت دی بمبادۆر)ی بەخشییە خۆشەویست و دۆستە نوێیەکەی، ئیتر (مەرکیزە دی بمبادۆر) ئەو کەسەبوو کە بڕیارەکانی دەردەکـرد، لە ساڵی (1744) ەوە، واتا لەو کاتەوەی کە بوە خۆشەویست و دۆستی پادشا، (مەرکیزە دی بمبادۆر) توانی جێ پەنجەی خۆی لە سەر بونیاد و بیرکردنەوە و ڕەفتاری کەسێتی (پادشا) بە جێ بهێڵێت، بە هۆی کەسێتییە زۆردارانـە و تاکڕەوییەکەی (مەرکیزە دی بمبادۆر) لە نزیکی پادشا، تێوەگلانی فەرەنسا لە شەڕێکی

حەوت ساڵەدا (1756 - 1763) شتێکی نامۆ و چاوەڕواننەکراو نەبوو، (مەرکیزە دی بمبادۆر) توانی باوەڕ بە پادشا بهێنێت، کە دەستبەرداری ڕاوێژکار و شارەزاکانی دیوانی پادشایەتی ببێت و خۆی ببێتە تاکە ڕاوێژکار و کەسی نزیکی پادشا.

بۆیە دەکرێت بگوترێت (پادشا) خۆی تەرخانکرد، بۆ گوێگرتن لە دەنگە پڕ لە ئاشوب و ئاژاوەگێڕییەکەی و وەڵامدانەوە و جێبەجێکردنی خواست و ئارەزووەکانی و هەواو هەوەسە سۆزدارییەکەی.

(لویسی پانزەیەم) پادشای فەرەنسا، لە یەکێک لە نامەکانیدا، کە ئاڕاستەی دۆستەکەی کردوە دەڵێت

« لە پادشاوە بۆ مەرکیزەی ئازیز

ڤێرسای لە (23ی ئەپریلی 1745)

ئازیزەکەم:

گومان و دڵەڕاوکێکەت لە شوێنی خۆیدا نەبوون..

ئەو بابەتەی کە بوە هۆی ئەوەی نەتوانم بتبینم، پێوەندی بە کچی مامەکەمەوە نەبوو، چۆن شتێکی وا بە بیر و خەیاڵت دا هات...

بەڵکوو هۆکاری سەرەکی پەشیمانبوونەوە لە چاوپێکەوتن و دیدارەکەمان، ئەو کۆبوونەوە بە پەلە و لە ناکاوە بوو کە تایبەت بوو بە دۆخی کۆشک و دیاریکردنی دەسەڵاتی وەزیرەکان...

داوات لێ دەکەم بە پەلە بگەڕێیتەوە بۆ ناو کۆشک، ئێوارەی سبەینێ سەعات (11) دەتبینم...

هیچ بیانوویەکت لێ قەبووڵ ناکەم و دەبێت ئەم فەرمانە پادشایەتییە جێبەجێ بکەی»

**دڵسۆزت**
**لویس**

(مەرکیزە دی بمبادۆر) لە یەکێک لە نامەکانیدا بۆ (لویسی پانزەیەم) پادشای فەرەنسا، کە لە (10)ی ئەپریلی (1747)دا لە ڕۆماوە بۆی نووسیوە و بۆی ناردوە دەڵێت

« خۆشەویستەکەم... پادشاکەم..

باوەڕناکەم هەست بەوە بکەی چەندە تامەزرۆ دەبم بۆت، هەر کاتێک ئازاری دووریيت تاقی دەکەمەوە، هەست بە نامۆیی و تەنهایی دەکەم لەم ژیانەدا...

بەم جۆرە من نامۆیەکی بێ دەسەڵات و بێ چارەم.... بە بێ هیچ ددان بەخۆدا گرتنێک چاوەڕێم بگەڕێمەوە بۆ لات....

لێرە هەموو شتێک جوانە، بەڵام من ئەو جوانییە نابینم، چونکە تۆ دووری لێم...»»

لە بەشێکی تری هەمان نامەدا دەشڵێت

«خاوەن شکۆ داوات لێ دەکەم فەرمان بکەیت تا تەواوی پاشماوەی پارەی نەفەقاتەکەم بۆ بخەنە سەر حسابی بانکی ڕۆما، چونکە دەمەوێت پێش ئەوەی بگەڕێمەوە، لە ئیتاليا هەندێک دیاری بکڕم، ئەو پارەیەی پێم بوو هەموویم خەرج کرد و هیچی ترم پێ نەماوە»

دەمتوانی تۆ بێزار نەکەم، ئەگەر ئەمین سندوقی کۆشک داواکارییەکەی جێبەجێ بکردمایە، سێ مانگ پێشتر داوام لێ کرد ئەو پارەیەی لە حسابەکەی مندا هەیە، بیخاتە سەر هەژمارە بانکییەکەم بۆ بانکی ڕۆما، بەڵام هیچی بۆ نەکردم، هەروەک ناچاریشیکردم جەنابی خاوەن شکۆ لەم بابەتە ئاگاداربکەمەوە».

هیوادارم دوورکەوتنەوەم لە کۆشک مانگێک زیاتر نەخایەنێت و دواتر بگەڕێمەوە بۆ فەرەنسای خۆشەویست و بۆ لای پادشا خۆشەویستەکەم...

بە نیازی دیدار ئەی بە نرخترین مرۆڤ لە ناو دڵمدا

**مەرکیزە**

لە کاتێکدا، مەرکیزە لەگەڵ (ئاڵکونت ئۆرۆری) هاورێیدا کاتی بە ڕێ دەکرد، (لویسی پانزەیەم) لە ڕۆژی (5)ی مایۆی ساڵی (1748)دا نامەیەکی تری بۆ ڕەوانەکرد، هێشتا (مەرکیزە) لە ڕۆما بوو.

«خانمەکەم مەرکیزە

دڵخۆشم بەوەی لە ڕۆما دڵخۆش و شادمانیت، بەڵام ئەو هەواڵانەم پێ ناخۆشە کە پێم دەگات لە بارەی هاتن و چوونت بۆ یانەکانی شەوانە، هەروەها ئەو دەنگۆ و پڕوپاگەندانەی لە بارەی پێوەندی تۆ و (کۆنت)ەوە پێم دەگات و ناتوانم بڕوایان پێ بکەم.

داوات لێ دەکەم کە پێوەندی بە کونسوڵی فەرەنساوە بکەیت لە ڕۆما، کە فەرمانێکی شاهانەی پێیە بۆت بە مەبەستی گەڕانەوت بۆ پاریس، هەروەها ڕاشم سپاردوە داواکاری و پێداویستییەکانت دابین بکات و خەرجی سەفەر و پێداویستییەکانی گەڕانەوەی خۆت و دەستوپێوەندەکەت لە ئەستۆ بگرێت.

بە ئومێدی ئەوەم لە ماوەیەکی زۆر نزیکدا بتبینمەوە...

لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستی ڕاستگۆیانەم دا بۆت...

**لویسی پانزەیەم**

دوای گەڕانەوەی (مەرکیزە) بۆ پاریس، (لویسی پانزەیەم) هەموو ئەو شتانەی لە بیر کرد کە ڕوویاندابوو، وەک جاران هەستوسۆزی خۆشەویستی لە نێوانیاندا دەستی پێکردەوە و سەر لە نوێ (مەرکیزە) دەستی لە کاروباری فەرمانڕەوایی فەرەنسا وەردەدایەوە.

لویسی پانزەیەم لە (27)ی مارسی (1749) نامەیەکی بۆ مەرکیزە نووسیوە و تێیدا دەڵێت

« ئەمڕۆ بڕیارێک دەرچوە بە دامەزراندنی (پۆل کاتبای یەکەم) لە کۆشکی پادشایەتی، بۆ جێبەجێکردنی خواست و داواکارییەکانت، هەروەها بڕیارێکی تریش دەرچوە بۆ زیادکردنی مووچەی (جوسلین)، سەرەڕای نارەزاییەکانی (شاژنە ماری لیزکزنکا)ی کچی پادشای پۆلۆنیا کە لە ساڵی (1725)دا هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، کاتێک تەمەنی نەگەیشتبوە (20) ساڵ و بە نیازبوو لە ئەرک و خزمەت دووری بخاتەوە.

ئەم ئارەزووە بچووکانەت بێزارم دەکات، خۆشەویستەکەم ئیتر دەتوانیت پێوەندی بە وەزیرەوە بکەیت تا بۆت جێبەجێ بکات، لێرە بە دواوە وەزیرم ڕاسپاردوە هەموو ئەو داواکاری و خواستانەت جێبەجێ بکات کە شایستەی جێبەجێکردنن. لەبەر ئەوە، ئیتر پێویست ناکات هیچ داواکارییەکی لەم جۆرە ئیتر لە من بکەی تا بۆت جێبەجێ بکەم».

بە شیکردنەوەی ئەم نامەیە، دەردەکەوێت کە:

(مەرکیزە) هەموو دەسەڵاتێکی لە (لویسی پانزەیەم) پادشای فەرەنسا وەرگرتوە و خۆی بۆتە فەرمانڕاوی ڕاستەقینەی فەرەنسا، بە درێژایی ئەو بیست ساڵەی کە لە (کۆشکی ڤێرسای) لەگەڵ پادشادا ژیاوە، تا کاتی مردنەکەی لە ساڵی (1763)دا.

سێ ساڵ دواتریش، چیرۆکەکەی بە جۆرێکی تر دووبارەبۆوە، کاتێک لە ساڵی (1766)دا (لویسی پانزەیەم) کە ئەو کاتە تەمەنی گەیشتبوە (56) ساڵ، کەوتە داوی عەشق و خۆشەویستی ژنێکی ترەوە بە ناوی (جان فۆبرینییە)ی خۆشەویستی (کۆنت جان دی باری)، (کۆنت) وازی لە (کۆشکی ڤێرسای) هێنا، لەبەر ئەوەی

(پادشا لویسی پانزەیەم) خۆشەویستەکەی ڕفاندوە بۆ ئەوەی ببێتە کەنیزەک و دۆستی و لە کۆشکێکی جوان و بچووک دا لە (کۆمبیبان) نیشتەجێی کردبوو .

دوای مردنی شاژنە (ماری لیز کزنکا) لە یۆنیۆی (1768) دا، (لویسی پانزەیەم)، خۆشەویستە نوێیەکەی گواستەوە و بەشێوەیەکی ڕووکەشیانە هاوسەرگیری لەگەڵ (کۆنت گلیۆم دی باری) پێکرد، کە خزمی (جان دی باری) خۆشەویستی پێشووی بوو، دوای ئەو هاوسەرگیرییە ڕووکەشە، (لویسی پانزەیەم)، (کۆنت گلیۆم)ی زاوای نارد بۆ شاری تۆلۆز و پۆست و پێگە و دەسەڵاتێکی باڵاشی پێ بەخشی، لە پێناوی ئەوەی لە پاریس کەشێکی گونجاو و لەبار و خۆش بۆ خۆی و خۆشەویستە نوێیەکەی فەراهەم بکات.

تا ئەو کاتەشی (جان فۆبرینییە) لە کۆشکی (کۆمبیبان) بوو، (پادشا لویسی پانزەیەم)، بە بەردەوامی نامەی بۆ دەنارد و تێیدا هەست و تامەزرۆیی خۆی بۆ دەردەبڕی بەوەی ئومێدی وایە بە زووترین کات بێتە نزیکی و لە کۆشکی ڤێرسای نیشتەجێ ببێت.

لە یەکێک لە نامەکانیشیدا کەلە (17)ی فیبرایەری ساڵی (1767)دا، (لویس) بۆ (جان)ی ناردوە دەڵێت «چەند حەزم دەکرد وەک هەر کەسێکی ئاسایی فەرەنسی، هەر کاتێک بمویستایە بێمە دەرەوە و لە سەر شەقام و ڕێگە گشتییەکان ڕێ بکەم و بە ئارەزووی خۆم هەڵسوکەوت بکەم..

ئای (جان)، ئەم تەختی پادشایەتییە چەند هیلاککەرە، پێش ئەوەی تۆ بناسم نائومێدی و بەدبەختی لە دڵمدا برینێکی گەورەیان دروستکردبوو، خەم نینۆکە تیژەکانی لە دەروونم

چەقاندبوو، بەڵام دوای ناسینی تۆ، هەموو خەمەکانم ڕەوینەوە، ئێش و ئازاری دڵیشم دوور کەوتنەوە.

جان، ئەو کاتەو ئێستاش، تۆ ئەو نورەی کە هەستوسۆز و خانەکانی دڵی پادشا ڕووناک دەکەیتەوە...

هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم

**دڵسۆزت .. لویس**

لێرەدا پێویستە ئاماژە بە دوو بابەت بکرێت کە (مەرکیزە) بە کاری هێنان بۆ ئەوەی لە دەرگای پشتەوە، بچێتە ناو مێژووەوە و بۆ هەمیشە ناوی بمێنێتەوە، یەکەمییان کێشانی وێنەیەکی تایبەتی خۆی بوو لە لایەن شێوەکاری بە ناوبانگ (فرانسوا بوشیە) کە نازناوی (مەدام دی بۆمبادۆر)یشی بۆ هەڵبژارد.

(فرانسوا)ی شێوەکار، لە کێشانی تابلۆکەیدا، هەموو هەوڵێکیدا بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە لایەنە ژنانە و جوانییەکانی (مەرکیزە) پیشان بدات و بەرجەستەی بکات، وەک دانیشتنێکی ئاسوودە، ڕەنگێکی پڕ لە ژیان بۆ عەزییەکی نایابی خانەدانانە و ئەو پەرپەڕانەی دەکەوتنە ژێر پێکانییەوە.

هەروەها ناوی دۆست و خۆشەویستەکەی (لویسی پانزەیەم) و ناوی کۆشکی (ئەلیزێ) پێوەندییەکی مێژووییان پێکەوە هەیە، چونکە ئەو خانمە کڕی بۆ ئەوەی بە ئاسودەیی لەگەڵ (پادشا)ی دۆست و خۆشەویستیدا یەکتری تێدا ببینن، بەڵام دواتر گۆڕدرا بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی، لە لایەن فەرەنسییەکانیشەوە بە (ماڵی دۆست و خۆشەویستی پادشا و سەرۆکەکانی فەرەنسا) ناو دەبرێت.

کۆشکی ئەلیزێ، لە ماوەی پێنج ساڵی سەرۆکایەتی (نیکۆلا سارکۆزی)دا، مێژوویەکی پڕ لە جوڵە و گەرموگوڕی بە خۆیەوە بینی.

کۆشکی ئەلیزێ، لە ساڵی (1718) دروستکراوە، بەڵام ساڵی (1753) ناوی چووە ناو کتێب و سەرچاوە مێژووییەکانەوە، ئەویش دوای ئەوەی لە لایەن (مەدام بۆمبادۆر)ی دۆست و خۆشەویستی تایبەت و نایابی (لویسی پانزەیەم)ی پادشای فەرەنساوە کڕدراو وەک جێیەکی تایبەت بە دیدار و ژوانە تایبەتییەکانیان بە کاریان دەهێنا.

لە لایەن کەسانی نەیار و ئۆپۆزسیۆنی دەسەڵاتی فەرمانڕەواشەوە، دروشم و پۆستەری نەشیا و بە دەرگاکانی کۆشکەکەوە هەڵدەواسران، بۆ نموونە (ماڵی لەش فرۆشەکانی پادشا).

لەبەر ئەوەش کە شوێنەکەی کەوتبوە سەر شەقامی (فۆبۆر سان ئۆنۆری) و ڕاستەوخۆش بەرانبەر (شانزە لیزێ) بوو، لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسی و جەنگە بەردەوامەکانی ناپلیۆندا، (کۆشکی ئەلیزێ) وەک کۆگا و گەنجینەیەکی تایبەت بە هەڵگرتن و پاراستنی کەلوپەل و کارگەی چاپەمەنی و هۆڵی سەماکردن بە کار دەهێنرا.

لە ساڵی (1814)شدا، کاتێک هێزەکانی یەکێتی سۆڤیەت پاریسیان داگیرکرد، (کۆشکی ئەلیزێ) یان کردە بنکە و ناوەندێکی سەربازیی و جەنگیی.

(لویس ناپلیۆن پۆناپارت) یەکەم سەرۆک و فەرمانڕەوای فەرەنسابوو، کە لە ساڵی (1848)دا (کۆشکی ئەلیزێ)ی کردە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی، ئەوەش پێش ئەوەی خۆی وەک

(ئیمپراتۆر ناپلیۆن)ی سێیەم ئیمپراتۆری فەرەنسا بناسێنێت و ڕوو بکاتە کۆشکی (تویلەر)ی نزیک کۆشکی (ئەلیزێ).

(ناپلیۆن)ی ئیمپراتۆری فەرەنسا، (ئەلیزێ)ی وەک شوێنێکی نهێنی بە کار دەهێنا، بۆ بینینی دۆست و خۆشەویستەکانی، لە ڕێگەی توونێڵێکی نهێنی ژێر زەوییەوە کە لە نێوان هەر دوو کۆشکەکەدا بوو، هاتووچۆی دەکرد، دواتر ئەو توونێڵە ڕووخێندرا و هیچ ڕێڕەوێکی نهێنی لە نێوان ئەو دوو کۆشکەدا نەما.

تا گەڕانەوەی سیستمی کۆماری بۆ فەرەنسا لە ساڵی (1870)دا، ئەو کەسانەی لە (ئەلیزێ) نیشتەجێ بووبوون، دەیانویست پارێزگاری لە ناو و ناوبانگی کۆشکەکە بکەن، کە پڕبوو لە ڕووداوی سەرنج ڕاکێش، سەرۆک (فلێکس فۆر) لە ساڵی (1899)دا بە شێوەیەکی کتوپڕ لە ئامێزی (مارگرێت ستەنهەیل)ی دۆستیدا گیانی لە دەستدا.

مێژووی فەرەنسا چەند وشەیەکی تۆمار کردوە، کە هەڵگری چەند چیرۆکێکن، کاتێک بە پەلە خزمەتکارەکەی کۆشک (قەشە) بانگ دەکات بۆ ژووری نووستنی کۆشک بۆ ئەوەی دوایین نوێژ لە سەر جەستەی سەرۆک بکات، بەڵام (قەشە) پرسیاری ئەوەی کردوە ئایا (سەرۆک) تا ئێستا لەگەڵ دۆستەکەیدایە؟

لەو کاتەدا (قەشە) وشەی (بە ئاگا یان بەهۆش)ی بە کار هێناوە، بەڵام خزمەتکارەکە لە مەبەست و مانا فەرەنسییەکەی تری ئەو وشەیە تێگەیشتوە و گوتوویەتی، نەخێر لە دەرگای پشتەوە بردمانە دەرەوە.

لە کاتی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، گۆریلایەک لە باخچەی ئاژەڵانی نزیک (ئەلیزێ) هەڵاتوە و خۆی کردوە بە ناو کۆشکدا،

به نیاز بوه هاوسەرەکەی (ڕیمۆن بوانکاریە)ی سەرۆکی ئەو کاتەی فەرەنسا ڕابکێشێتە سەر دارەکە، بەڵام پاسەوانەکانی کۆشک ڕێیان لێ گرتوە و نەیانهێشتوە.

باس لەوەشدەکرێت کە (پۆل دیشانیل)ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسا کە لە ساڵی (1920)دا بە هۆی تێکچوونی باری دەرونییەوە دەستی لە کار کێشایەوە، زۆر سەرسام بوە بە چیرۆکی گۆرێلاکەی ناو کۆشکی ئەلیزێ، بە جۆرێک لە میانەی میواندارییە ڕەسمییەکاندا بە سەر دارەکاندا بازی دەدا، ئەوەش ببوە هۆی نیگەرانی و ترس و بێزاریی میوانەکان.

لە جەنگی دوەمی جیهانیدا (کۆشکی ئەلیزێ) داخرا، نازییەکان بە هیچ شێوەیەک ئەو بینایەیان بۆ هیچ کارێک بە کار نەهێنا و بە چۆڵی هێشتیانەوە، تا دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، ژەنەراڵ (چارڵ دیگۆل) لە نێوان ساڵانی (1959 بۆ 1969) تێیدا نیشتەجێبوو، بەڵام دواتر بێزار و نیگەران بوو لەوەی هیچ تایبەتمەندییەکی نەماو ناو و ناوبانگیشی لەکەدار دەبوو.

لەبەر ئەوە (دیگۆل) فەرمانیدا لە نزیک (ئەلیزێ) کۆشکێکی شاهانە و جوانتریی بۆ بکرن، بۆ ئەوەی لەوێ پێشوازی لە میوانە ڕەسمییەکان بکات و نەیدەویست لەو شوێنەدا کاربکات و بمێنێتەوە، کە پادشاکان بە جلی خەوتنەوە بە ڕێڕەوەکانیدا هاتووچۆیان کردوە.

(فرانسوا میتران)ی سەرۆکی فەرەنسا کە لە (1981 بۆ 1995) سەرۆکایەتی ئەو وڵاتەی کرد، بەشە تایبەتەکەی (کۆشکی ئەلیزێ)ی بە کار نەهێنا، چونکە (فرانسوا میتران) هەمیشە بە باشی دەزانی شەوان بگەڕێتەوە بۆ خانوە تایبەتەکەی خۆی لە گەڕەکی (بۆهیمی) یان بۆ شووقە تایبەتەکەی لە ناوچەیەکی تر، کە دایکی (مازارین)ی کچە ناشەرعییەکەی تێدا نیشتەجێبوو.

چاپکردن و بڵاو کردنەوەی کتێبێک لە فەرەنسا سەبارەت بە (جۆرج کلیمانسۆ)ی پڵنگی نێو سیاسەتی فەرەنسا لە (1841 بۆ 1929) شتێکی نامۆ نییە، ئەو پیاوە چەندین جەنگ و ململانێی سیاسی مەترسیداری بینیوە و لە هەمووشیاندا براوە و سەرکەوتوو بوە، ئەو کەسێک بوو دەیتوانی لە یەک کاتدا (20) بابەتی جیاواز بۆ (20) کەسی جیاواز باس بکات، هیچ کەسێکیش باوەڕی نەدەکرد ئەم پڵنگە سیاسییەی فەرەنسا خاوەنی (800) دۆست و خۆشەویست بێت و (40) منداڵی ناشەرعیشی هەبێت.

کاتێک (کلیمانسۆ) زانی کە هاوسەرە ئەمریکییەکەی خیانەتی هاوسەری لێ کردوە، لە درەنگانێکی شەودا دەرگای ماڵەکەی بۆ کردەوە و بە جلی خەوتنەکەیەوە خستییە سەر شەقام و کردییە دەرەوە، (کلیمانسۆ) وەک هەر گورگێکی تری نێو مرۆڤایەتی، ڕقێکی زۆری بەرانبەر بە ژنان هەبوو، هیچ کاتێک وشەیەکی باشی لە سەر ژن نەگوتوە و ڕوانینێکی باشی نەبوە بۆ ژن جگە لە ڕق و کینە، ئەو کاتانە نەبێت کە لە سەر جێگە سێکسی لەگەڵ ژنێکدا کردوە، یان لە سەر جێگە بە نەخۆشی کەوتوە و ژنێک خزمەتی کردوە.

(جان نۆیل) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (کلیمانسۆ، وێنەی پیاوێکی ئازاد) کە لە ساڵی (2005)دا لە پاریس چاپ و بڵاوی کردەوە، تەئکیدیکردۆتەوە لەوەی زۆرێک لە سەرۆک و سەرکردەکانی جیهان زیاتر لە ڕوویەکییان هەبوە و ژیانێکی تایبەت و نهێنیان هەیە، کە زۆر جیاوازە لەو درووشم و بەرنامانەی بانگەشەی بۆ دەکەن، هەندێک جاریش بە هۆی ئەو دەستکەوت و سەرکەوتنە سیاسییانەی بە دەستی دەهێنن، تا

ئەو کاتەی دەمرن، هیچ کەسێک دەرک بە دەستدرێژییەکانیان ناکات.

(جۆرج کلیمانسۆ) لە ساڵی (1841) دا لە یەکێک لە گوندە دوورە دەستەکانی پاریس و لە ناوچەی (بریتانی) لە دایک بوە، ژیانی منداڵی لە کێڵگەی خانەوەدەکەیان یان لە شاری (نانت) بە سەر بردوە، کە باوکی وەک پزیشک لەوێ کاری دەکرد.

باوکی کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، کاریگەریی زۆریشی لە سەر (کلیمانسۆ) دروستکردبوو، دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بە سەر دوو گروپدا دابەش ببوون، گروپێکییان خاوەن موڵکە پارێزگارەکان بوون ئەگەر نەڵێین دواکەوتوەکان، هەروەها گروپێکیشیان کۆمارییە پێشکەوتووخوازەکان بوون و دژ بە (لاکلیرۆسی مەسیحی) و (فەرەنسای کۆن) بوون، باوکی (کلیمانسۆ) سەر بە گروپی دوەم بوو، باوەڕی زۆری بە فەلسەفەی ڕۆشنگەری هەبوو، خۆشەویستییەکی بێ ئەندازەشی بۆ شۆڕشی فەرەنسا بە گشتی و (ڕۆبسپیر) بە تایبەتی لە دڵ دا بوو.

لە ساڵی (1851) دا باوکی (کلیمانسۆ) زیندانی کرا، بە هۆی دژایەتی کردنی گەڕاندنەوەی سیستمی پادشایەتی ئیمپراتۆری بۆ فەرەنسا و ڕووخاندنی سیستمی کۆماری، لە ساڵی (1858) یشدا جارێکی تر باوکی زیندانی کرایەوە بە هۆی بیروباوەڕە شۆڕگێڕی و کۆمارییخوازە سیکۆلارەکەیەوە، لەو کاتەدا (کلیمانسۆ) کە تەمەنی تەنها (17) ساڵ بوو، سووێندی خوارد لە سەر ئەوەی تۆڵەی باوکی بکاتەوە.

ساڵی (1861) (کلیمانسۆ) بوە نووسەر لە ڕۆژنامەیەکی بچووک دا کە ناوی ڕۆژنامەی (کار) بوو، لەو ڕۆژنامەیەدا بە

شێوەیەکی زۆر توندڕەوانە، بیروباوەڕەکانی دەردەبڕی، تا کار گەیشتە ئەوەی دەسەڵاتدارانی بێزار کرد و ئەوانیش دەستگیریان کرد، بە تۆمەتی بڵاو کردنەوەی ڕقوکینە بەرانبەر کەسانی تر، یاخود نەیارە سیاسییەکانی باوکی.

ساڵی (1865) گفتوگۆی بۆردی پزیشکییەکەی کرد و خوێندنی تەواو کرد، پێش ئەوەی کلینیکی تایبەت بە خۆی بکاتەوە و جێگیر بێت، بڕیاریدا ڕووبکاتە (USA)، باوکیشی توانایەکی دارایی مامناوەندی هەبوو، بۆیە پارەی پێویستی پێدا بۆ ئەوەی خواست و ئامانجەکانی بە دی بهێنێت.

لە ڕێگەی گەشتەکەیدا بەرەو نیویۆرک، (کلیمانسۆ) بە شاری (لەندەن) دا تێ پەڕی و چاویکەوت بە فەیلەسوفی بە ناوبانگ (جۆن ستیوارت میل) و لە سەر کۆمەڵێک بابەتی سیاسی و ئاینی و فەلسەفی گفتوگۆیان کرد.

لە ڕێگەی دەریاوە بەرەو نیویۆرک کەوتەڕێ، لەوێ بینی هێشتا برینی شەڕی ناوخۆی نێوان ویلایەتەکانی باکوور و ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا لە سەر سیستمی نەژادی و کۆیلایەتی، سارێژنەبوون، لەبەر ئەوە ڕوی کردە ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا، بۆ ئەوەی بە چاوی خۆی دۆخەکە و پاشماوەکانی ئەو جەنگە ناوخۆییە ببینێت، جگە لە تیرۆرکردنی (ئەبراهام لینکۆڵن)ی سەرۆکی (USA)، بە هۆی ناکۆکییە توندەکانییەوە لەگەڵ سپی پێستە ڕەگەزپەرستەکانی ئەمریکا.

دوای بینینی دۆخی ویلایەتەکانی باشوور، (کلیمانسۆ) گەڕایەوە بۆ نیویۆرک و وەک پەیامنێر کاری بۆ ڕۆژنامەی (زەمەن)ی فەرەنسی دەکرد، بابەتەکانی بە ناوی (نامەکان لە (USA)) بڵاو دەکردەوە، هاوکات وانەی زمانی فەرەنسیشی بە

خوێندکارە کچەکانی خوێندنگەیەکی ناوەندی ئەمریکا دەگوتەوە.

لەوکاتەدا کەوتە داوی عەشق و خۆشەویستی کچێکی ئەمریکییەوە بە ناوی (ماری بلۆمێر) و ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی هاوسەرگیری بکەن، بەڵام بەو مەرجەی بە شێوەیەکی شارستانی هاوسەرگیری بکەن و نەچنە کڵێسا و پیرۆزکردنی هاوسەرگیرییەکەی لە لایەن هەر پیاوێکی دینییەوە ڕەت کردەوە.

لە سەرەتادا ئەوەش نەکرا، بۆیە بە ناچاری گەڕایەوە بۆ فەرەنسا و خۆشەویستەکەی لە دوای خۆیەوە جێهێشت، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم خێزانی (ماری) بە هۆی خەفەت و نیگەرانی کچەکەیانەوە لە هەڵوێستەکەیان پەشیمان بوونەوە و داوایان لە (کلیمانسۆ) کرد بگەڕێتەوە بۆ نیویۆرک و هاوسەرگیری بکەن.

ئەویش دوای گەڕانەوەی، لە شارەوانی نیویۆرک و لە بەردەم عومدەی ئەو شارەدا هاوسەرگیری کرد، بە بێ ئەوەی بچێتە کڵێسا و لە بەردەم هیچ قەشەیەکدا بوەستێت، (کلیمانسۆ) بەوەش سەلماندی کە عەلمانی و سیکۆلارێکی زۆر توندە تا سەر ئێسک، دەیویست کێشە و ناکۆکییەکانی لەگەڵ قەشە و مەسیحییە ئسوڵییەکاندا کۆتایی پێ بهێنێت.

وەک ئاشکراشە، لەو سەردەمەدا فەرەنسا و فەرەنسییەکان دوو جۆر بیروباوەڕیان هەبوو، (کاسۆلیکی پارێزگار) و (سیکۆلاری پێشکەوتووخوازی کۆماری ڕۆشنگەر).

لە ساڵی (1870)دا سیستمی پادشایەتی ئیمپراتۆری فەرەنسا ڕووخاو سەر لە نوێ سیستمی کۆماریی گەڕایەوە بۆ ئەو وڵاتە، لەو کاتەشدا (کلیمانسۆ) کرایە عومدەی شارەوانی (مۆنمارتەر) لە پاریس، ئیتر لەوێوە چوە نێو گۆڕەپان و ژیانی سیاسییەوە.

دواتر بە ئەندامی پەرلەمانی ئەو وڵاتە هەڵبژێردرا و لە

سەر کورسی ئەوپەڕی چەپەکان دادەنیشت، ئەو کاتە زۆرینەی پەرلەمانتاران سەر بە (خاوەن موڵکە پارێزگارەکان) بوون و ئەمیش بە ڕقەوە سەیری دەکردن، ئەوانیش وەک تیرۆریستێک لێیان دەڕوانــی، لـە ڕاسـتـیـشـدا، پـرۆگـرامـە سیاسییەکەی (کلیمانسۆ) ببوە مایەی ترس و دڵەڕاوکێ بۆ هاوڕێ و هاوکارە سۆسیالیستەکانیشی.

(کلیمانسۆ) بەشداربوو لە لێسەندنەوەی متمانەی چەند کابینەیەکی وەزاری وڵاتەکەیدا، لەبەر ئەوەش لە لایەن زۆرینەوە پیلانی لە دژ دانراو لە هەڵبژاردنەکاندا شکستیان پێ هێنا و خستیان، لەوکاتەدا کە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو، یەکەم جاربوو خۆی لە دەرەوەی پەرلەمان ببینێتەوە، هیچ هاوڕێیەکی نەبوو وە لە ژێر قەرزێکی زۆریشدابوو، بەڵام (پڵنگ)ەکەی فەرەنسا، نەک شکستی نەهێنا و تەسلیمی دۆخەکە نەبوو، بەڵکوو خۆی بۆ تۆڵەکردنەوە و هەڵگەڕانەوەی هاوکێشەکە ئامادە دەکرد.

لە چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژەشدا، (کلیمانسۆ) ڕویکردە کاری دوەم کە ڕۆژنامەگەری بوو، لە ڕێگەی وتارە بەردەوامەکانییەوە بیروباوەڕەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە، چانسی وای هێنا جارێکی تر بگەڕێتەوە بۆ بازنەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی، ئەوەبوو کرایە وەزیری ناوخۆی فەرەنسا و لە ساڵی (1906)یشدا کە تەمەنی گەیشتبوە ( 65 ساڵ) کرایە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئەو وڵاتە.

پێش هەڵایسانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە ساڵی (1914) دا، سەرۆکایەتی و فەرمانڕەوایی فەرەنسای پێ سپێردرا، بەو مەرجەی فەرەنسا لە هەڕەشە و مەترسییەکانی ئەڵمانەکان دوور بخاتەوە کە بەرەو پاریس دەکشان.

بە شێوەیەکی دیکتاتۆریانە و بە دەستی ئاگر و ئاسن وڵاتەکەی بەڕێوەدەبرد، وەزیر و ژەنەراڵەکانی سوپای فەرەنسا وەک منداڵ گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون، دوای پێشڕەوییەکی زۆری سوپای ئەڵمانیا بەرەو پاریس و تێکشاندنی بەرگرییەکانی سوپای فەرەنسا، (کلیمانسۆ) توانی شەپۆل و هاوکێشەی جەنگەکە پێچەوانە بکاتەوە و سەرکەوتنێکی گەورە بۆ فەرەنسا تۆمار بکات، بەوەش ئاستی جەماوەریی بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کرد و لە دوای (دیگۆل)ەوە وەک پاڵەوانێکی نەتەوەیی سەیردەکرا، ئەوەش سەرەتای گەشە و ترۆپکی ژیانی سیاسی (کلیمانسۆ) بوو.

پلان و ستراتیژەکانی، بوە هۆی تێکشکاندنی هەموو هێرش و پەلامارەکانی سوپای ئەڵمانیا، (کلیمانسۆ) سوپای ئەڵمانیای ناچارکرد لەو وڵاتە بکشێتەوە و بەو پەڕی لاوازی و شکستەوە داوای ڕێککەوتن و ئاگربەست بکات.

(کلیمانسۆ) لە (کۆنگرەی ئاشتی ڤێرسای) بە تەواوی تۆڵەی لە ئەڵمانەکان کردەوە و کۆمەڵێک مەرجی بە سەردا سەپاندن، کە ناچاربوون قەبووڵی بکەن، بە هۆی ئەو شکستە سەربازیی و هەمە لایەنەی توشی بوو بوون، بە هۆی ئەو هەڵوێستەشییەوە کە ئەڵمانیای ناچارکرد ڕێککەوتنی ئاشتی ئیمزا بکات، لە لایەن سەرۆکی (USA) و هەندێک لە سەرکردە و سەرۆکەکانی وڵاتانی جیهانەوە لۆمەکراو پێیان گوت ئەو کارە زۆر ترسناکە و پەرچەکرداری خراپ و نەخوازراوی بە دوادا دێت، بەڵام گوێی بۆ نەگرتن و هۆشدارییەکەیانی بە هەند وەرنەگرت.

هەست و حەزی تۆڵەکردنەوە لای (کلیمانسۆ) لە هەموو شتێک زیاتر و گەورەتربوو، لە ڕاستیدا پێشبینی ئەو کەسانەی نائومێدبوون لە ئیمزاکردنی ڕێککەوتنەکە لە لایەن ئەڵمانیاوە

هێور هێور دەرکـەوت، بە تایبەت لە دوای ئـەوەی (ئەدۆڵف هیتلەر) بوە فەرمانڕەوای ئەڵمانیایەکی بریندار، گەلی ئەڵمانیا هەموو ماف و دەسەلات و پشتیوانییەکیان پێ بەخشی، بۆ بە دەستهێنانەوە و تۆڵەکردنەوەی شکۆ و پێگەی لە دەستچووی ئەڵمانیا لە کۆنگرەی ڤێرسای و هاوشێوەکانی تریدا.

لە دوای کۆتاییهاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی، گەلی فەرەنسا هەستیان بە خۆشی و سەرکەوتنێکی گەورە دەکرد، ڕژانە سەر شەقامەکان و هوتافیان بۆ سەرۆکەکەیان دەگوتەوە، بەوەی سەرەڕای هێرشە چڕ و بەردەوامەکانی سوپای ئەڵمانیا بۆ سەر پاریس، بەلام (جۆرج کلیمانسۆ) توانی کۆتایی بە گەورەترین کۆمەڵکوژی بهێنێت و داهاتوویان بپارێزێت.

کاتێک لە بـەردەم پەرلەمانی ولاتەکەیدا وتارێکی کورتی سەرکەوتنی پێشکەش کرد و بەوە کۆتایی پێ هێنا که فەرنسا پێشتر سەربازێک بوو بۆ بەرگریکردن لە مەسیحییەت، بەلام ئێستا سەربازێکی بە جەرگە بۆ بەرگریکردن لە یاسا و مافەکانی مـرۆڤ، لە هەموو حاڵەتێکدا فەرەنسا سەربازێک دەبێت بۆ بەرگریکردن لەو نمونە بالایانەی حوکمڕانی گەلانی جیهان دەکەن.

ئەم دەستەواژەیە کە ناکۆک بوو لەگەڵ ئایینی مەسیحیدا، بوە هۆی تورەکردن و وروژانـدنـی کەسێکی دەمارگیر و بە دەمانچەکەی تەقەی لە (کلیمانسۆ) کرد، بەلام برینەکەی سووک بوو، تەنها چەند ڕۆژێکی کەم لە جێگەدا مایەوە.

ئەوەی نامۆ و سەیر بوو، هەڵوێستی فەرەنسییەکان بوو، لە جیاتی ئەوەی لە سەر ئەو هەڵوێستانەی پاداشتی بکەن، لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیی دا پشتیان تێکرد و هەڵیان نەبژارد و دەنگیان پێ نەدا.

بوونی پێوەندی سێکسی و پێوەندی ڕۆمانسی سەرۆکی وڵاتانی لاتین، شتێکی گرینگ نییە بۆ هاوڵاتییەکانیان، ئەمەش هۆکاری سەرەکییە بۆ ئەوەی نەبنە کەسێکی دیار و ناسراو، یان وەک ئەوەی لە ئەورووپا دەبیندرێت متمانەی تەواویان بە خۆیان نەبێت.

(فیدڵ کاسترۆ)ی سەرکردەی مێژوویی کوبا، یەکەم جار هاوسەرگیری لەگەڵ (میرتا دیز بالارت) دا کرد و کوڕێکییان بوو بە ناوی (فیدیلیتۆ)، هەروەها لە (ناتی ڕیفیلیتا)ی دۆستیشی کچێکی هەبوو بە ناوی (ئەلینا فێرناندیز ڕیفیلیتا)، کە لە ساڵی (1993)دا بەرەو (USA) هەڵات، کاتێک وەک نوێنەرایەتی دەنگە نارەزاییەکانی سیاسەتەکانی باوکی دەرکەوت.

(فیدڵ کاسترۆ) دوای ئەوەی لە ساڵی (1955) لە (میرتا) جیا بۆوە، هاوسەرگیری لەگەڵ (دالیا سۆتۆ دیل فی) کرد و پێنج منداڵیان بوو.

باس لەوە دەکرێت (فیدڵ کاسترۆ)ی سەرۆکی کوبا، چەند پێوەندییەکی سێکسی و سۆزداریی هەبوە، کە لە ناوخۆی ئەو وڵاتەدا باس کردنی ئەو بابەتە قەدەغەبوە، لەوانەش (مارتیزا ڕۆزالیس) و (تیتی) هونەرمەندبوون.

(لاندرۆسان خۆرخی) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (ژنانی کاسترۆ) باس لەوە دەکات «مارتیزا ڕۆزالیس-ی کاراکتەر و هونەرمەندی تەلەفزیۆنی ناودار، ڕەتی کردەوە خواست و ئارەزووە تایبەتییەکانی (کاسترۆ) جێبەجێ بکات، بەڵام کاسترۆ پێی گوتوە، خەڵکی ئێرە ملکەچی یاسا دەبن، منیش یاسام بۆیە دەبێت تۆش ملکەچی ئەو یاسایە بیت».

(فیدڵ کاسترۆ) وا ڕاهاتبوو لە پشتی پەردەوە دەژیا و

کارەکانی بە ڕێ دەکرد، ئەو گەشتیارانەی ڕوویان لەو وڵاتە دەکرد نەیاندەزانی کێ سەرۆکی ئەو وڵاتەیە و کێ ئەو وڵاتە بەڕێوەدەبات، چونکە لە هیچ شوێنێکدا ناوی (کاسترۆ) نەنووسرابوو، هیچ گۆڕەپان و شەقام و دەروازەی شار و پرۆژە و کارگەیەک بە ناوی (کاسترۆ)وە نەبوو، وێنەی (کاسترۆ) لە سەر پول و (پیزۆ)ی دراوی ناوخۆیی ئەو وڵاتە نەبوو.

لە ئێستادا ئەو گەلە کەیفخۆشە، خۆی ئامادەکردوە بۆ دەستنیشانکردنی سەرکردەیەکی تر بۆ وڵاتەکەیان، وەک شوێنگرەوەیەک بۆ (کاسترۆ) کە ئێستا باری تەندروستییەکەی ناجێگیرە و لە جێگەدا کەوتوە. (مەبەستی نووسەر کاتی نووسینی کتێبەکەیە.و.ک)

ئەوەشی نامۆیە تا ئێستا زانیاریی تەواو لە بەردەستدا نییە لە سەر ئەوەی ئایا (کاسترۆ) ڕەبەنە یان لە هاوسەرەکەی جیا بۆتەوە، یان هاوسەری هەیە؟ یاخود ناوی هاوسەرەکەی چییە و چەند منداڵی هەیە و ناویان چییە و لە کوێ دەژین..

(فیدڵ کاسترۆ) ژمارەیەکی زۆری لە هاوڕێی کچ و دۆست و خۆشەویست هەبوو، بەڵام تەنها دوو جار بە شێوەیەکی ڕەسمی هاوسەرگیری کردوە، لە دەرەوەی ژیانی هاوسەرێتییەکەشی چەند منداڵێکی ناشەرعی هەیە، کە ژمارە و ناونیشانەکانیان بۆ کەسانێکی زۆر جێگەی سەرسوڕمان و گومانە، تەنانەت بۆ (خوانا فیرا)ی هاوسەریشی، کە بۆ ماوەی (28) ساڵ وەک وەرگێڕی تایبەتی کاری لەگەڵ کردوە و لە دوای (ڕائوڵ کاسترۆ)ی برایەوە، متمانە پێکراوترین کەس بوە لای.

ژمارەی منداڵەکانی لە نێوان (8 بۆ 12)دایە، ( فیدیلیتۆ) یەکەم منداڵێتی و لە ساڵی (1949) لە هاوسەری یەکەمی لە

دایک بوو، (فیدیلیتۆ) ساڵی (1973) له زانکۆی ڕووسیا وانه‌ی فیزیای ئه‌تۆمی خوێندوه، پێش ئه‌وه‌شی له ساڵی (1979 بۆ 1992) ببێته سه‌رۆکی ده‌سته‌ی وزه‌ی ئه‌تۆمیی له هاڤانا، وه‌ک ڕێزێک به ناوی (ڕائوڵ خۆسیه فێرناندیز)ه‌وه ده‌یخوێند.

(فیدیلیتۆ) ساڵی (1992) له هاوسه‌ره ڕووسییه‌که‌ی جیا بۆته‌وه و دوای هه‌شت مانگ، هاوسه‌رگیری له‌گه‌ڵ کچێکی کوبیدا کردوه. یه‌کێک له خاڵه‌کانی (فیدیلیتۆ) ناوی (لینکۆڵن دیاس) ه‌و له شاری (میامی) ده‌ژی، پێشتر ئه‌ندامی کۆمارییه‌کان بوو له ولایه‌تی فلۆریدا. (میرتا دیاس)ی دایکیشی له خانه‌واده‌یه‌کی ده‌وڵه‌مه‌ند بوه، باوکی وه‌زیر بوه له حکوومه‌تی کوبا، پێش ئه‌وه‌ی (فیدڵ کاسترۆ) ده‌سه‌ڵات بگرێته ده‌ست. ئێستا له‌گه‌ڵ هاوسه‌ره کوبییه‌که‌یدا له (میامی) ده‌ژی، دوای جیا بوونه‌وه‌شی له (کاسترۆ) له ساڵی (1950)ه‌وه تا ئێستا هیچ لێدوانێکی بۆ ڕۆژنامه‌کان نه‌داوه.

سێ خاڵی هاوبه‌ش له نێوان پێنج منداڵه‌که‌ی کاسترۆدا هه‌یه له (بێوه‌ژنه‌که‌ی) که ته‌مه‌نی (67) ساڵه، هه‌موویان کوڕن، هه‌روه‌ها هه‌ر هه‌مووشیان به ناشه‌رعی و له ده‌ره‌وه‌ی پرۆسه‌ی هاوسه‌رگیرییه‌کی شه‌رعی له دایک بوون، گرینگیش نه‌بوه به لایه‌وه له کێ منداڵی ده‌بێت و دوو ساڵ جارێکیش یه‌کێکیان له دایک بوون.

ساڵی (1980) و دوای پێوه‌ندییه‌کی سێکسی نهێنی که ماوه‌ی (10) ساڵی خایاند، هاوسه‌رگیرییه‌که‌شی له‌گه‌ڵیدا کۆتایی پێ هێنا.

ئه‌وه‌ش ساڵێک دوای مردنی (سیسیلیا سانشێژ)ی دۆست و هاوڕێی، که له دوای شۆڕشی کوباوه له دژی (ژه‌نه‌راڵ

فۆلخینسۆ پاتیستا)، بە هیچ شێوەیەک لە یەک جیا نەبوونەوە و هەمیشە پێکەوەبوون، بە جۆرێک لە یەکەم ساتی سەرکەوتنی شۆڕشەکەیدا و لە یەکی یەنایەری ساڵی (1959) کاتێک (کاسترۆ) چوە ناو شاری هاڤاناوە، (سیسلیا)ی لە تەنیشتەوەبوە، کوبییەکانیش زۆریان خۆشدەویست و بە (خۆشەویستەکەی گەل) ناودەبرا.

پێوەندییە نهێنییەکەی نێوان (کاسترۆ) و (سیسیلیا) کە (20) ساڵی خایاند، بە گۆشەگیربوونی (سیسیلیا) لە خانوویەکی ناو گوند دا کۆتایی پێ هات.

(دالیا سۆتۆ دل فاللی) هاوسەری ئێستاشی نەوەی یەکێک لە خێزانە گەورەکانی کوبایە، لە لایەن نووسینگەی فیدراڵی ئەمریکاوە پارەیەکی زۆر تەرخانکراوە بە مەبەستی کۆکردنەوەی زۆرترین زانیاری لە سەری.

هاوسەرەکەی کاسترۆ، مامۆستابوو لە یەکێک لە خوێندنگەکانی شاری (ترینیداد) لە ناوەڕاستی کوبا، کاتێک لەگەڵ (کاسترۆ)دا یەکییان ناسی، دوای ئەوەشی دەسەلاتی ولاتی گرتە دەست، هاوسەرەکەی بوە بەشێک لە پرۆژەی هەڵمەتی نیشتمانی نەهێشتنی نەخوێندەواریی لەو ولاتە.

لەم هاوسەرەشی، (کاسترۆ) چەند منداڵێکی هەیە، (4) منداڵی هەیە، (ئەنجل، ئەنتینیۆ، ئەلکسیس، ئەلیخاندرۆ)، (ئەنجیل و ئەلیخاندرۆ) هاوسەرگیرییان نەکردوە، (فیدیلیتۆ) منداڵی یەکەمی (کاسترۆ)یە لە هاوسەری یەکەمی، سێ منداڵی تری ناشەرعیشی هەیە کە ناسراوون. جگە لە هەندێک کەسی زۆر نزیکی تریشی، پێکەوە خانەوادەی سەرەکی (کاسترۆ) پێک دەهێنن، (ئالکومندانتی) یان سەرکردە و سەرۆکی شۆڕشی کۆمۆنیستی ولاتەکەی،

بەرهەمهێنەری دیارترین ڕەمز و هێمای سەرمایەدارییە لە جیهاندا» سالانە زیاتر لە (90) ملیۆن جگەرە لەو ولاتە بۆ ئالودەبوانی جگەرەی پێنج کیشوەری جیهان بەرهەم دەهرێنرێت، جگە لە ئەمریکییەکان کە بێ بەشن لە کێشانی ئەو جگەرەیە، مەگەر بە قاچاخ بیبەنە ولاتەکەیانەوە، چونکە لە سالّی (1961) ەوە (USA) گەمارۆی خستۆتە سەر هەموو کالاّ و شمەکێکی کوبی، ئەمەش وەک دروستکردنی فشار لە سەر دەسەلاّتدارانی کوبا و سەرۆکی ئەو ولاّتە، کە تەنها (140) کیلۆ مەتر لە دەروازە ئاوییەکانی ئەمریکا لە میامی و فلۆریداوە دوورە.

لە دوای (ڕائول)ی برای (کاسترۆ)، دوەم کەسی دیار و دەسترۆیشتووی نێو ئەو خانەوادەیە، (ئەلینا فێرناندس)ی کچی (فیدلّ کاسترۆیە)، کە بە مندالّی و هەرزەکانی لە پاریس ژیاوە بە بێ ئەوەی هیچ کەسێک بێ ناسێت، (ئەلینا) حەوت زڕخوشکی هەیە لە دایکی و (ناتالیا ڕیڤۆلیتا) کە هاوسەرگیری لەگەلّ پزیشکێکی کوبیدا کردوە.

(ئەلینا) نەزۆک بوە و توانای ئەوەی نەبوە مندالّی ببێت، هەر لەبەر ئەوەش هەمیشە کەسێکی یاخی و تورە و میزاجی بوە، وەک باس دەکرێت (4) جار هاوسەرگیری کردوە، (15) سالّ پێش ئێستا، باوکی دوایین هاوسەرگیری لە هاڤانا ڕەت کردۆتەوە و بە کەسێکدا وەلاّمی بۆ ناردوە هیچ هەوالّێکی پێ نەدات لە سەر جیا بوونەوەی هاوسەرگیرییەکەی ئەگەر ڕوویدا، (چونکە پێشبینی دەکرد ئەم هاوسەرگیرییەشی بە جیا بوونەوە کۆتایی پێ بێت).

لە کتێبی (ئەلینا، بیرەوەرییەکانی کچەکەی کاسترۆ)، کە لە سالّی (1993) و دوای جیا بوونەوە و هەلاّتنی بۆ میامی

به پاسپۆرتێکی ساختەی ئیسپانییەوە بڵاو کرایەوە، چەندین وردەکاری لە بارەی ژیانی کچەکەی (کاسترۆ)وە بڵاو کراوەتەوە.

(ئیلینا) لەگەڵ خۆیدا منداڵێکیشی برد بۆ میامی کە هەڵی گرتبۆوە و بەخێوی دەکرد، جگە لە (ئیلینا)ی کچی، (خوانیتا)ی خوشکی (کاسترۆ)ش وەک پەنابەر لە میامی دەژیا، کە دەرچووی کۆلێژی دەرمانسازی بوو لە زانکۆی هاڤانا، بەڵام دوای ئەوەی لە ساڵی (1964)ەوە وەک پەنابەر ڕووی کردە میامی، لە (ڕادیۆی کوبای ئازاد) و (وانەبێژ لە زانکۆی میامی) کاری دەکرد، (خوانیتا) لە دژی ڕێگرییەکانی (کاسترۆ)ی برای بۆ پیادەکردنی حەز و ئارەزووەکانی و قسەکردن لە سەر ئەو سیستمەی کە وەک چەقۆیەک دراوە لە پشتی وڵاتەکەی، کوبای بە جێ هێشت و بەرەو میامی هەڵات.

یەکێکی تر لەو پەنابەرانەی لە (میامی) دەژیا، (فرانسیسکا بوبو)ی کچە ناشەرعییەکەی (فیدڵ کاسترۆ) بوو، وەک دەگوترێت (3) ساڵ پێش ئێستا و لە تەمەنی (46) ساڵیدا بە نهێنی کوبای بە جێ هێشتوە و ڕووی کردۆتە میامی و ئێستا لە خانەیەکی تایبەت بە کەسانی پیروپەککەوتە کاردەکات.

هەروەها نەوەیەکی (کاسترۆ)ش کە هێشتا تەمەنی (12) ساڵە، لە دایکە نەناسراوەکەی، (7) ساڵ پێش ئێستا کوبایان جێ هێشت و لە میامی دەژیین.

دەیان کچ و کوڕ و نەوەی (کاسترۆ) لە میامی دەژیین، یەکێکییان کوڕی (ڕائۆل)ی برایەتی و وەک ئۆپۆزسیۆن و نەیاری سیستمی کۆریا ناسراوە، بەڵام هیچ کەناڵێکی میدیایی ئەو دوورگەیە بۆی نییە، بە هێچ هۆکار و بیانوویەک قسە لە سەر ئەو کچ و کوڕ و نەوانەی (کاسترۆ) بکات.

یەکێک لە شتە نامۆکانی خانەوادەی (کاسترۆ)، ئەو هاوسەرەیەتی کە بە هیچ شێوەیەک بۆ دەرەوەی وڵات هاوڕێیەتی (فیدڵ کاسترۆ)ی نەکردوە، هەروەها پێشوازیی لە هاوسەری هیچ سەرۆک و سەرکردەیەکی جیهانیش نەکردوە کە سەردانی کوبایان کردوە، لەوانەش (جیمی کارتەر)ی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا، کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ماوەی هەفتەیەک لە هاڤانا مانەوە و میوانی (فیدڵ کاسترۆ) بوون، بە بێ ئەوەی ئەو هاوسەرەی ببینن.

شتێکی ئەوتۆ لە بارەی (ئەنجل)ی تەمەن (27) ساڵی کوڕی (کاسترۆ)وە نازانرێت، جگە لەوەی لە زانکۆی هاڤانا کۆلێژی پزیشکی تەواو کردوە، بێ ئەوەی هیچ کەسێک لە خوێندکاران و مامۆستایان و کارمەندانی ئەو زانکۆیە بزانن کە کوڕی سەرۆکی کوبایە.

(ئەلێکسیس)یش بەشی کۆمپیوتەری تەواو کردوە، دوای ئەو (ئەنتۆنیۆ دێت کە تەمەنی (31ساڵ)ە، پاشان (ئەلیخاندرۆ)، کە تەنها کەسە ناوەکەی هەڵگری شکۆمەندی و یادەوەری (ئەسکەندەری مەکدۆنی) سەرکردەی یۆنانییەکانە، چونکە چوار براکەی تری هەڵگری ئەو نازناوە کۆنانەن، کە پێشتر (کاسترۆ) ی باوکیان لە میانەی شۆڕشی پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا بە کاری هێناون.

خەڵکی کوبا شتێکی زۆر کەم سەبارەت بە (ڕائول کاسترۆ) ی برای (فیدڵ کاسترۆ) دەزانن، (ڕائول) هاوسەرگیری لەگەڵ (فیلما ئاسبین)ی کوبیدا کردوە کە (30) ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو، (فیلما) سەرپەرشتیاری کۆمەڵە و یەکێتییەکانی ژنانی کوبای دەکرد، (3) کچ و کوڕێکیان هەیە و ئەوانیش بە هەمان

شێوە، میدیاکان ناتوانن قسەیان لە بارەوە بکەن، هەروەها ناشزانرێت ئاستی خوێندن و خوێندەوارییان چییە و چ کۆلێژ و زانکۆیەکییان تەواو کردوە، چونکە (کاسترۆ)ی مامیان، سوربوو لە سەر ئەوەی شووناس و ناسنامەی خۆیان بشارنەوە و بە هیچ شێوەیەک خۆیان دەرنەخەن و خانەوادە و خێزانەکەیان بشارنەوە.

تەنها ئەوەندە زانراوە (ئەلیخاندرۆ)ی کوڕە تاقانەکەی (ڕائوڵ) ئەفسەری سوپای کوبا بوە، سەبارەت بە کچەکانیشی، (میلیسیا) خوێندکارە لە زانکۆی هاڤانا، (دیبۆرا) کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی هاڤانای تەواو کردوە و لە یەکێک لە فەرمانگە حکومییەکانی ئەو شارە بۆتە فەرمانبەر، (مارییلا) کە کچی بچوکی بوو، خوێندنی لە بواری منداڵ و سەمای هاوچەرخدا تەواو کردوە.

بەپێی هەندێک لەو ڕاپۆرت و هەواڵانەی بڵاو دەکرێنەوە، (لویس ئەڵبێرتۆ فرناندس)ی تەمەن (47ساڵ) هاوسەری (دیبۆرا)ی کچی (ڕائوڵ)ە و خاوەنی بەهێزترین و کاریگەرترین پێگە و هەژموونی سیاسییە لە کوبا، دوای (ڕائوڵ کاسترۆ)، (لویس ئەلبێرتۆ فرناندس) ئەفسەری یەکەم بوە لە سوپای کوبا و باوکیشی پێشتر ژەنەراڵی سوپای کوبا بوە.

(هالینکار سۆتۆ) کە یەکێکە لە (شارەزایان و مێژوونوسانی کاسترۆ) و وەک پەنابەر لە میامی دەژی، باس لەوە دەکات (لویس) سەرپەرشتی کاری تۆڕێک لە کاری حکوومەتی کوبا دەکات کە بوودجەکەی سەدان ملیار دۆلارە، لەوانەش (چەندین هۆتێل لە کوبا، چەندین کۆمپانیای نێودەوڵەتی هاوبەش لەگەڵ دەوڵەتانی پەنەما و ئەنگۆلا و باشووری ئەفریقیا و قووبرس و سویسرا).

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ژیانی (کاسترۆ) و ئەو ژنەی لێی جیا بۆوە، (سۆتۆ) باسی لەوەکردوە هەر یەکەیان بە جیا لە کۆمەڵگەی (بۆنتۆ شیرۆ) دا دەژین، کە پێکهاتوە لە دوو خانووی تایبەت بە ئەوان، کەسیشییان منداڵەکانیان لەگەڵدا ناژین، جگە لە گەورەکەیان (ئەلیخاندرۆ)، بەشێکی زۆری خەڵکی کوبا دەیانزانی کە (ئەلیخاندرۆ) پێش ئەوەی بەرەو ئەمریکا هەڵبێت، سێ جار سەردانی (سوتۆ)ی کردوە.

لە بارەی شتومەک و کەلوپەلی خانوەکانیشییان، (سوتۆ) ئاشکرای کردوە، کەلوپەل و پێداویستییەکانی ناو خانوەکانیان زۆر سادەن و لە تەختە و چەرم و دروستکراویی ناوخۆیین، هەروەها زۆرینەی کورسییەکانیشییان لە قامیش دروستکراون.

(کاسترۆ) پوورێکی لە ژیاندا ماوە و تەمەنی (90) ساڵە و لە هاڤانا دەژی، هەروەها زڕخوشکێکیشی هەیە لە دایکییەوە کە تەمەنی (80) ساڵە و ناوی (بلیتا)یە، توشی نەخۆشی بیرچوونەوەی یادەوەرییەکانی بوە و هیچ شتێکیشی سەبارەت بە ژیانی منداڵی (کاسترۆ)ی برای لە بیر نییە.

(ماریتا شاتنەر)، یەکێکە لە دۆست و خۆشەویستەکانی (فیدڵ کاسترۆ)، کە لە سەرەتای ساڵانی شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا و لە (هاڤانا) بۆ ماوەی (8 مانگ) پێوەندییەکی سێکسییان هەبوە، بەڵام لە لایەن (هەواڵگری کوبا)وە ئاشکرا کرا کە (ماریتا) کاری سیخوڕیی بۆ ئەمریکا دەکات، لەبەر ئەوە (کاسترۆ) دەری کرد و هیچ شوێنەوارێکی نەما، تا پێنج ساڵ پێش ئێستا دەرکەوت و کتێبێکی چاپ و بڵاو کردەوە بە ناونیشانی (ئازیزەکەم فیدڵ، ژیانم، خۆشەویستی و خیانەتم لە بەرلین)، کە لێی دەژیا.

(ماریتا شانتەر) لە کتێبەکەیدا چیرۆکی یەکترناسینی لەگەڵ

(کاسترۆ) گێڕاوەتەوە و باسی لەوەکردوە، ساڵی (1959) تەمەنی (19) ساڵ بوە، سواری ئەو کەشتییە بوە کە ناوی (بەرلین) بوە و باوکی (کاپتن)ی بوو، (کاسترۆ)ش یەکێک بوو لە سەرنشینەکانی کەشتییەکە، کاتێک لە (میامی)ییەوە گەیشتنە هاڤانا، (کاسترۆ) داوای پێوەندی لێ کردم و منیش زۆر بەخێرایی وەڵامم دایەوە، دواتر بە گەرمی باوەشی پێداکردم و هاواری کرد» ئەڵمانییە قژ زەردەکەم، لە وڵاتەکەی خۆم دا تۆ دەبیتە شاژن».

هەروەها ماچی کردم و پێی گوتم «تۆ تاکە خۆشەویستی منیت، بۆیە لەگەڵم دا بمێنەرەوە و با ئەو کاپتنە پیرە بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتوە»، بەڵام بۆم دەرکەوت من هاوڕێیەتی ئاژەڵێکی برسی و فێڵبازم کردوە، لە ماوەی تەنها (2) مانگدا و لە کاتی گەرمەی شۆڕشە مارکسییەکەیدا، هەشت جار لەگەڵ (3) ژنی تردا خیانەتی لێ کردووم، لەگەڵ ئەوەشدا و دوای چوار دەیە، بیری ئەو ئاژەڵە جوانە دەکەم.

(USA)ی هەمیشە دراوسێیەکی بێزارکەر بوە بۆ (کاسترۆ) و هەمیشە لە هەوڵدا بوە بۆ ئەوەی تیرۆری بکەن و وەک خۆی دەڵێت لە ماوەی (20) ساڵدا و تەنها لە لایەن ئەمریکییەکانەوە (14) جار پیلانی تیرۆرکردنی دانراوە، جگە لە پیلان و هەوڵەکانی تیرۆرکردنی لە لایەن (کوبییە ئۆپۆزسیۆن و نەیارەکانی دەرەوەی وڵات، باندەکانی مافیا لە میامی).

یەکەم هەوڵی تیرۆرکردنی (کاسترۆ) لە ساڵی (1960) بوو، تەنها هەشت مانگ دوای چوونە سەرکاری سیستمی کۆمۆنیستەکان بۆ سەر دەسەڵات لە کوبا.

بەپێی ڕاپۆرتێکیش کە لە ساڵی (1975)دا ڕادەستی لیژنەی ئاسایشی نەتەوەیی کۆنگرێسی ئەمریکا کراوە و تایبەتە بە

پلانی تیرۆرکردنی سەرکردە بیانییەکان، دواتر کرایە کتێبێکی سەربەخۆ و چیرۆکی پیلاندانانی تیرۆرکردنی (50) سەرکردەی بیانی تێداخرابوە ڕوو، بەپێی ئەو ڕاپۆرتە و زانیارییەکانی نێو ئەو کتێبەش، بەشی خزمەتگوزارییە پزیشکییەکانی (CIA)، سیخوڕێکی ناردۆتە ژوورەکەی (کاسترۆ) لەو هۆتێلەی لە نیویۆرک لێی دابەزیی بوو، یەکێک لە جگەرە پێچراوەکانی بۆمبڕێژ کرد و لە پاکەتێکدا داینا، دوای تێ پەڕبوونی دوو سەعات، سیخوڕەکە بۆی دەرکەوت پیلان و هەوڵی تیرۆرکردنەکە پووچەڵبۆتەوە و شکستیهێناوە، چونکە (کاسترۆ) ئەو پاکەتەی بە دیاری بەخشیوەتە یەکێک لە میوانەکانی و خۆی لە جگەرەکانی نێو ئەو پاکەتەی کێشاوە کە پێشتر خۆی هەڵی گرتبوو.

دوای ئەوەی دیبلۆماتکارەکەی میوانی (کاسترۆ) لە ژوورەکە چوە دەرەوە و پاکەتە جگەرەکەشی بە دەستەوەبوو، (CIA)ی هەموو هەوڵێکی خۆی خستەگەڕ، بۆ ئەوەی ئەو دیبلۆماتکارە بیانییە جگەرە بە بۆمب چێندراوەکە دانەگیرسێنێت کە لە نزیک هاڤانا بەرهەمهێندرابوو.

لە لایەن دەزگای هەواڵگری کوباوە، تەنها یەک سەعات دواتر، ئەو پیلانەی ئەمریکا ئاشکراکرا و بەو هۆیەشەوە پێنج کرێکار دەستگیرکران، هەندێکیان ژیان و هەندێکیشیان تێداچوون.

پیلانەکەی بەشی پزیشکی و یەکەی تەکنیکی (CIA)، بریتی بوو لەوەی (پێچراوە)ی جگەرەیەک پڕکرا لە ماددەی (BZ) کە لەگەڵ یەکەم هەڵمژینیدا دەبێتە هۆکاری (هەلوەسە)، بەوەش ئەو سەرکردە شۆڕشگێڕەی کوبا لە بەردەم سەرکردەکانی کوبا و لە یەکەم کۆنگرەی ڕۆژنامەوانیدا کە لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی پەخش دەکرا، توشی (هەلوەسە) دەبوو.

بەلام ئەوەی ڕووی دا و بە خەیالی ڕێکخەری کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکەدا نەهات دزینی ئەو پاکەتە بوو، کە ئەو جگەرەیەی تێدابوو و لە سەر ئەو مێزە دانرابوو کە بۆ کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکە ئامادە کرابوو (کاسترۆ) لە بەردەمی دا دادەنیشت، ئەو کارەش لە دەرەوەی هۆلی کۆنفرانسە ڕۆژنامەوانییەکە ئاشکرا کراو دەنگی دایەوە.

بەپێی بەلگەیەکی تر، لە هەولێکی تردا پیلان داڕێژرا بۆ پێک هێنەرەکانی غازی سالیۆم بخرێتە نێو پێلاوەکانی (کاسترۆ)وە، ئەو مادەیە لە ڕێگەی قاچەوە بە شێوەیەکی خێرا بە تەواوی جەستەی بەرکەوتوەکەدا بلاو دەبێتەوە و دەبێتە هۆکاری خێرای هەلوەرینی قژ، ئەمەش وەک سووکایەتی پێ کردنێک بە (کاسترۆ) لە بەردەم لێپرسراوانی ولاتەکەیدا و وەک هەولێک بۆ پەکخستنی کار و سیاسەتەکانی، چونکە هەرزوو دەبوەهۆی وەرینی مووی لاجانگ و ڕیش و سمێل و قژی بە شێوەیەکی خێرا و کاتێکی زۆریشی دەویست تا دووبارە دروستببنەوە، بەلام ئەم هەول و پیلانەش شکستی هێنا، لە سالی (1964) یشەوە تا ئێستا، هۆکاری شکستهێنان و پووچەلکردنەوەی ئەو پیلانەی هەوالگری ئەمریکا نەزانراوە و ئاشکرا نەبوە.

دوای دوو سالیش، ئاشکرابوو (کاسترۆ) زۆر حەزی لە مەلەوانی و چوونە ژێر ئاوە، بۆیە هەوالگری ئەمریکا بە پەلە (هێلەگ)ێکی مەلەوانی تایبەتی دروستکرد و چەند بۆمبێکی تێداچاند، کە دوای دوومەتر لە ژێر ئاوەوە دەتەقییەوە، پیلانەکەش وا دانرابوو کونسوولێکی بیانی بە بۆنەی چلەمین سالیادی تەمەنییەوە، سەردانی نووسینگە تایبەتەکەی (کاسترۆ) بکات لە هاڤانا و ئەو هێلەگەی مەلەوانی و بە بۆمب چێندراوەی

وەک دیارییەک پێشکەش بکات، بەلاَم تەنها یەک سەعات پێش کاتی ئەو یەکتر بینینە، قاچی (کاسترۆ) هەڵخلیسکا و بەو هۆیەشەوە هەموو دیدارەکانی هەڵوەشێندرایەوە، کە یەکێکییان لەگەڵ ئەو دیبلۆماتکارە بیانییەدا بوو.

(فیلیکس ڕۆدریگیز) یەکێک بوو لە سیخوڕەکانی پێشووی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا، لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی (جەنگاوەرێک لە سایە) کە تایبەتە بە گێڕانەوە و تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانی لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە نیویۆرک، باسی لەوەکردوە چەند جارێک هەوڵیداوە (کاسترۆ) تیرۆربکات، بەلاَم هەموو هەوڵ و پیلانەکانی پووچەڵبوونەتەوە و شکستیان هێناوە.

(فیلیکس ڕۆدریگیز) باسی لەوەشکردوە، جارێکیان لە لایەن لیژنەی ئاسایشی نەتەوەیی کۆنگرێسی ئەمریکاوە، لەگەڵ چەند هاوکارێکی تریدا لە (CIA) بانگکراون بۆ لێپرسینەوە، لەو دانیشتنەدا یەکێک لە ئەندامانی لیژنەکە لە (ڕۆدریگێز)ی پرسیوە ڕاستە بۆمبتان لە جگەرەیەکدا بۆ (کاسترۆ) چاندوە، ئەویش لە وەلاَمدا پێی گوتوە «نەخێر بەڕێزم، من ئەو کارەم نەکردوە، بەلاَم لە ساڵی (1961)ەوە و بۆ ماوەی (10) ساڵ، بە چەکێکی قەنناسەوە، هەوڵم داوە ئەو کەسە لە ناو ببەم کە ناوی کاسترۆیە و من بە کوڕی (....) ناوی دەبەم، بەلاَم شەش جار بەخت یاوەرم نەبوو.

دواتر بۆمب و مادەی تەقینەوەم خستە نێو پێلاوەکانییەوە، لەوەشدا هەر سەرکەوتوو نەبووم، بۆیە کەوتمە پاڕانەوە لە خودا، تا ونی بکات و بیباتەوە بۆ شوێنە نادیارەکان، بەلاَم تا ئێستا هەر بەختم نەبوە و نزاو پاڕانەوەکانم قەبووڵ نەکراون، گەورەم ئەو کەسە حەوت ڕۆحی هەیە، بۆیە ئێستا تەنها یەک

نزاو پاڕانەوەم هەیە، ئەویش ئەوەیە لانی کەم پێش ئەوەی من بمرم (کاسترۆ) بە مردوویی ببینم، ئایا ئەو نزایەم قەبووڵ دەبێت و دێتە دی؟

لە ساڵی (2007)دا، فیدڵ کاسترۆ ئاماژەی بەوەکرد، کە دەستبەرداری دەسەڵات و سەرۆکایەتی دەبێت بۆ نەوەیەکی گەنجتر، لەو پەیامەیدا کە ئەوکاتە تەلەڤزیۆنی ڕەسمی لە هاڤانا بڵاوی کردەوە، (کاسترۆ) باسی لەوەشکردوە نایەوێت دەستبەسەر دەسەڵاتدا بگرێت، بە بێ هاتنە پێشەوەی نەوەیەکی بچووکتر و گەنجتر.

(کاسترۆ) لە تەمەنی (81) ساڵیدا و (19) مانگ دوای نەخۆشکەوتنەکەی، ناچاربوو دەستلەکاربکێشێتەوە و بە شێوەیەکی کاتیش دەسەڵاتی ئەو وڵاتە ڕادەستی (ڕائوڵ)ی برای بکات.

ساڵی (2006)، (فیدڵ کاسترۆ)ی سەرۆک و سەرکردەی کوبا، نەشتەرگەرییەکی بە پەلەی بۆ ئەنجام درا، لێپرسراوانی کوباش چەند جارێک تەئکیدیانکردەوە کە تەندروستی سەرۆکەکەیان باشەو بەرەو چارەسەربوون دەچێت.

لەو کاتەشدا، (جۆرج بوش)ی سەرۆکی پێشووتری (USA)، لە بارەی دەستلەکارکێشانەوەی (کاسترۆ)وە ڕای گەیاند» ئومێدم بەوە هەیە ئەو دەستلەکارکێشانەوەیە ببێتە هۆی گۆڕانکاریی دیموکراسی لە کوبا».

لە بەشێکی تری قسەکانیدا کە لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیدابوو لە (کیجالی) پایتەختی ڕواندا، (جۆرج بۆش) گوتیشی» بڕوام وایە گۆڕینی سەرکردایەتی کوبا لە کاسترۆوە بۆ سەرکردەیەکی نوێ، دەبێت ئاماژەبێت بۆ دەستپێکردنی

پرۆسەیەکی ڕاستەقینەی نوێ، بۆ گۆڕانکاریی دیموکراسی لە کوبا».

سەرۆکی پێشووتری (USA) گوتیشی هەنگاوی یەکەمی سەرکردایەتییە نوێیەکەی کوبا کە دەبێت ئەنجامی بدات، ئازادکردنی هەموو زیندانییە سیاسییەکانە، ڕاشی گەیاند پێویستە کۆمەڵی نێودەوڵەتی هاوکاری پێویستی خەڵکی کوبا بکات، بۆ بونیادنانی دامەزراوەی پێویست لە پێناوی ئەو گۆڕانکارییە دیموکراسییەدا.

(جۆرج بوش) باسی لەوەشکرد پێویستە لە کۆتایی ئەم پرۆسەیدا، هەڵبژاردنێکی ئازاد و پاک و بێگەرد ئەنجام بدرێت، نەک هەڵبژاردنێک کە پێشوەختە ئەنجامەکانی بزانرێت، وەک ئەو هەڵبژاردنەی براکانی (کاسترۆ) ئەنجامیان دەدا و بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد هەڵبژاردنێکی دیموکراسیتیە.

(جۆرج بوش) بەڵێنیشدا (USA)هاوکاری گەلی کوبا بکات، لەگەڵ سەر هەڵ دانی پیرۆزییەکانی ئازادیدا.

بەلام (جۆن نیگرۆ پۆنتی) کە یەکێک بوو لە بڕیاربەدەستەکانی وەزارەتـی دەرەوەی ئەمریکا لـە کابینەکەی (جـۆرج بـوش) ی کوڕ، بە دووری زانی لە ماوەیەکی نزیکدا سزا و گەمارۆ ئابوورییەکانی ئەمریکا لە سەر کوبا هەڵبگیرێن.

هـەر لـەو چوارچێوەیەشدا، یەکێتی ئـەورووپا گەشبینی و ئومێدی خۆی بە ئاسایی بوونەوەی پێوەندییەکانی لەگەڵ کوبـا دەربـڕی کـە لـەگـەڵ هـاتنـە سـەرکـاری (کـاسـترۆ)وە هەڵپەسێردرابوون، وەک پێشاندانی خواست و نییەتی وڵاتەکەی بۆ بەردەوام بوونی پێوەندییەکانی لەگەڵ (هاڤانا)، حکوومەتی چین (کاسترۆ)ی بە (هاوڕێیەکی دێرین) وەسفکرد.

دوای نیوسەدە لە فەرمانڕەوایەتیکردن و سەرۆکایەتیکردنی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی، (فیدل کاسترۆ) بڕیاریدا دەست لە کار بکێشێتەوە، بەوەش کوبا چوە نێو قۆناغێکی نوێی مێژووییەوە، بەلام وەک (ڕائول)ی شوێنگرەوە و برا بچووکی (کاسترۆ) بەڵێنی دابوو، پێدەچێت هەنگاوەکانی نێو ئەو قۆناغە نوێیەی مێژووی کوبا، هەنگاوی بچووک بێت بۆ گۆڕانکاریی.

خەڵکی کوبا، کە ڕێژەی لە (70%)یان جگە لە (فیدل کاسترۆ) هیچ سەرۆکێکی تریان نەناسیوە، تا ئێستا لە ژێر کاریگەری شۆکی ئەو قۆناغە نوێیەدان، دوودڵن لەوەی بڕوایان بە گۆڕانکارییە چاوەڕوانکراوەکان هەبێت، یاخود هیچ متمانەیەکییان بە هەواڵی دەستلەکارکێشانەوە و مردنی (فیدل کاسترۆ) نەبێت و پێیان وابێت هێشتا لە ژیاندایە.

(فیدل کاسترۆ) توانی خۆ ڕاگربێت و بەرانبەر بە مێژوو بمێنێتەوە، بەلام نەیتوانی بەرانبەر بە تێ پەڕینی ڕۆژگار و تەمەن خۆ ڕاگربێت.

(فیدل کاسترۆ) ساڵی (1926) لە خێزانێکی دەوڵەمەند لە دایک بوە، هەر لە سەرەتاوە یاخی و ناڕازیی دیاربوو، نیگەران و توڕە و یاخی بوو لە جیاوازیی زۆری ئەو ژیانە خۆشگوزەرانەی لە نێو خێزانەکەیدا هەبوو، لە بەرانبەر ئەو ژیانە قورس و دڵڕەقی و هەژارییەی لە ناو کۆمەڵگەکەیدا هەبوو.

ساڵی (1953) چەکی لە دژی (فالجنسیۆ باتێستا)ی سەرۆکی ئەو کاتەی کوبا هەڵگرت و سەرکردایەتی زیاتر لە (100) چەکداریی شوێنکەوتە و لایەنگری کرد، بەلام ئەو پلانی یاخیبوونەکەی شکستی هێنا و لەگەڵ (ڕائول)ی برایدا زیندانیکران، دوو ساڵ دواتر (کاسترۆ) بە لێبووردن ئازادکرا

و ڕووی کردە مەکسیک، لەوێشەوە بەردەوام بوو لە سەر هەوڵەکانی بۆ کۆتایی هێنان بە دەسەڵات و ڕژێمەکەی (پاتیستا) و بۆ ئەو مەبەستەش هێزێکی چەکداریی پێکهێنا کە بە بزووتنەوەی (26)ی یۆلیۆ ناسراوە.

بنەماو پرەنسیپە شۆڕشگێڕییەکانی (فیدل کاسترۆ) پشتیوانییەکی زۆری لە کوبا بە دەستهێنا، هێزە چەکدارییەکەی (کاسترۆ) توانی لە ساڵی (1959)دا دەسەڵات و ڕژێمەکەی (پاتیستا) بڕووخێنێت، کە ببوە سیمبولی گەندەڵی و نایەکسانی و زووڵم و زۆرداریی.

پاتیستا، پێش ئەوەی لە سەر کار لاببرێت و لە ساڵی (1958) دا وڵاتەکەی بەرەو جۆرێک لە سیستمی کۆمۆنیستی ئاڕاستە کرد، بەڵام لەگەڵ هاتنە سەرکاری (فیدل کاسترۆ) و گرتنە دەستی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی (کوبا)، سیستمی فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتە بە تەواوی بوە سیستمێکی کۆمۆنیستی، بەوەش کوبا بوە یەکەم وڵاتی ڕۆژئاوایی کە باوەشی بۆ کۆمۆنیزم کردەوە.

(USA) ددانی نەنا بە حکوومەتە نوێیەکەی کوبادا، کاتێکیش (کاسترۆ) بڕیاریدا بە خۆماڵیکردنی کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا لە کوبا، پێوەندییەکانی نێوان ئەو وڵاتە بە تەواوی تێکچوو.

لە مانگی ئەپریلی ساڵی (1961)، (USA)، لە ڕێگەی دروستکردنی هێزێکی چەکدارییەوە لەو کوبییانەی ڕوویان لە تاراوگە کردبوو، ویستی دوورگەی کوبا داگیربکات و دەسەڵاتەکەی (کاسترۆ) بڕوخێنێت، بەڵام هێزە چەکدارەکانی کوبا لە (دوورگەی بەرازەکان) پەلامارەکەیان تێکشکاند و ژمارەیەک لە چەکدارەکانیان کوشت و نزیکەی هەزار چەکداریشییان دەستگیرکرد.

ساڵێک دواتر، قەیرانی مووشەکی سۆڤیەت سەری هەڵدا، کە خەریک بوو هەموو جیهان بخاتە جەنگێکی ترەوە، (کاسترۆ)ش ئەو کاتە دوژمن و نەیاری ژمارەیەکی ئەمریکا بوو، لەو بارەیەوە (نیکیتا خرۆشۆف)ی سەرکردەی ئەو کاتەی یەکێتی سۆڤیەت لە بیرەوەرییەکانیدا دەڵێت (ارتاو) دەیویست مووشەکە بالیستییەکانی یەکێتی سۆڤیەت لە دوورگەی کوبا جێگیر بکرێت و بڵاو بکرێتەوە، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هەوڵێکی داگیر کاری ئەمریکا بۆ سەر دوورگەکە.

لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی (1962)دا، فڕۆکە هەواڵگرییەکانی ئەمریکا، چەند سەکۆیەکی مووشەکی سۆڤیەتییان لە کوبا ئاشکراکرد، ئەوەش وای لە ئەمریکا کرد هەست بە بوونی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بکات.

هەر چەندە قەیرانە مووشەکییەکەی (سۆڤیەت) زۆری نەخایاند و (USA) و (USSR) گەیشتنە ڕێککەوتن، لە سەر ئەوەی سۆڤیەت مووشەکەکانی لە کوبا بکشێنێتەوە، لە بەرانبەریشدا ئەمریکا گرەنتی تەواوەتی بدات بەوەی پەلاماری کوبا نەدات و داگیری نەکات، هەروەها هەموو مووشەکەکانی ئەمریکاش لە توورکیا بکشێنرێنەوە، بەڵام ڕێککەوتنەکەی نێوان (کاسترۆ)ی سەرکردەی کوبا و (خرۆشۆف)ی سەرکردەی (USA)،(USSR) توشی شڵەژان و نائارامییەکی زۆر کرد.

لە سەردەمی جەنگی سارد دا، (فیدل کاسترۆ) یەکێک بوو لە ئەستێرە گەش و کەسایەتییە دیارەکانی ئەو سەردەمە، لە ساڵی (1975)دا (15 هەزار) سەربازی نارده ئەنگۆلا، بۆ یارمەتیدانی هێزە چەکدارییەکانی ئەنگۆلا کە لە لایەن (USSR) ەوە پشتیوانی دەکران.

له ساڵی (1977)یشدا هێزێکی چەکداری تری نارده ئەسیوپیا، بۆ پشتیوانیکردنی (مانجستۆ)ی سەرۆکە مارکسییەکەی ئەسیوپیا.

لەگەڵ ئەوەشدا، لۆمەیەکی زۆری (کاسترۆ) دەکرێت، له بەرانبەر ئەو ژیانە ئابوورییە قورسەی وڵاتەکەی هەیەتی، بە هۆی سەپاندنی گەمارۆکانی ئەمریکاوە.

ڕووخان و شکستی بلۆکی سۆسیالیستی ڕۆژهەڵات له ساڵی (1991) دا کاریگەریی گەورەی له سەر بارودۆخی کوبا دروستکرد، بە تایبەتی لە ڕووی ئابوورییەوە، بەڵام ئێستا هەندێک لە چاودێران پێیان وایە کوبا توانیوویەتی ئەو دۆخە تێ بپەڕێنێت و کاریگەرییەکانی ئەو فشارانەی له سەریەتی کەم بکاتەوە.

(کاسترۆ) کە لە لایەن خەڵکی وڵاتەکەیەوە بە (فیدڵ) یان (سەرکردە) ناسراوە، لە ساڵی (1961)دا و دوای پرۆسە شکستخواردوەکەی دوورگەی بەرازەکان، پێوەندییە دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ (USA) دا پچڕاند، هەروەها چەندین کۆمپانیای گەورەی ئەمریکیشی خۆماڵی کرد کە لە کوبا کاریان دەکرد و کۆی سەرمایەکەیان دەگەیشتە نزیکەی (یەک ملیاردۆلار).

لە لایەکی تریشەوە، کوبا دەیناڵاند بە دەست بە فیرۆ چوونی ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتی و سەرمایەدارەکانییەوە بەرەو دەرەوەی وڵات، بە تایبەتی بۆ فلۆریدا، چونکە ڕەوەندێکی زۆری کوبا لە فلۆریدا دەژین و ڕێژەیەکیشییان دژی سیستم و دەسەڵاتەکەی (کاسترۆ) خەبات دەکەن.

بەڵام بە گشتی، ژیانی تایبەتی (فیدڵ کاسترۆ)، وەک شتێکی

تایبەت بە خۆی هێڵرایەوە، بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییدا هەندێک زانیاریی نهێنی لە سەر ژیانی تایبەتی ئاشکراکران و بڵاوکرانەوە.

------

(هۆگۆ چافێز)ی سەرۆکی فەنزوێلا و هاوڕێی نزیکی (کاسترۆ) لە میانەی هاوسەرگیری یەکەمیدا لەگەڵ (نانسی کۆلۆمینارس) کە (18) ساڵی خایاند، پێوەندییەکی سۆزداری و سێکسی هەبوو لەگەڵ کچە مێژوونووسی لاو (هێرما مارکس مان) کە بۆ ماوەی (9) ساڵ بەردەوام بوو، دوای جیا بوونەوەشی لە هاوسەری یەکەمی، (هۆگۆ چافێز) هاوسەرگیری لەگەڵ کچە ڕۆژنامەنووسێکدا کرد بە ناوی (ماریزا بیل ڕۆدریگیز)، کە دوای ماوەیەک لەویش جیا بۆوە.

(هۆگۆ چافێز) لە (28ی یۆلیۆی ساڵی 1954) لە دایک بوە، کەسێکی سیاسی و سەربازییە و (53 یەمین) سەرۆکی فەنزوێلایە و لە ساڵی (1999)ەوە تا ئێستا لە دەسەلاتدا ماوەتەوە.

حکوومەت و دەسەلاتەکەی (چافێز)، زیاتر ڕوخسارێکی دیموکراتییەکی سۆسیالستییە، (چافێز) بەوەش ناسراوە کە داوای یەکێتی و تەواوکارییەکی تەواوەتی سیاسی و ئابووری ئەمریکای لاتین دەکات، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئیمپرالیزم، ڕەخنەی زۆریشی لە لایەنگرانی جیهانگیری و لیبرالییە نوێیەکان و سیاسەتی دەرەوەی (USA) هەیە.

(چافێز) تۆمارێکی سەربازیی نایابی لەگەڵ سوپای فەنزوێلادا هەیە، ساڵی (1992) هەوڵیدا کودەتا بکات بە سەر حکوومەت و دەسەلاتی (کارلۆس ئەندرێس پێرێز) و سیاسەتە لیبراڵییەکەیدا، بەڵام شکستیهێناو زیندانی کرا.

دوای ئازادکردنی له ساڵی (1994)دا، (بزووتنەوەی کۆماری پێنجەم)ی دامەزراند، کە بزووتنەوەیەکی چەپ بوو، خۆی وەک نوێنەر و وتەبێژی سیاسی هەژارانی فەنزوێلا پیشان دەدا، بە هۆی ئەو بانگەشە و بەڵێنانەی بە هەژارانی دابوو کە زۆرینەی دانیشتوانی ولاتەکەیان پێک دەهێنا، لە هەڵبژاردنەکەی ساڵی (1998)دا بە سەرۆکی فەنزوێلا هەڵبژێردرا، هەروەها لە ساڵی (2000)یشدا بۆ جاری دوەم بە سەرۆک هەڵبژێردرایەوە.

(چافێز) چەند هەڵمەتێکی گەورەی لە پۆلیڤیا ئەنجامدا، بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی و نەخوێندەواری و خراپی سیستمی خۆراک و هەژاری و نەخۆشییە کۆمەلایەتییەکانی تر.

هەڵمەتەکانی (چافێز) لە سەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوەی فەنزوێلا کاردانەوە و دەنگدانەوە و مشتومڕی گەورەی دروستکرد، هەندێکییان پشتیوانیان لێ دەکرد و هەندێکیشیان ڕەخنەیان لێ دەگرت، بیروبۆچوونەکان لە نێوان (دەستبردن بۆ هاوکاریکردنی هەژاران) و (خراپ بەڕێوەبردنی ئابووری ولات) دا دەهاتن و دەچوون.

لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی (چافێز) بەوە ناسراوە کە چەند جارێک داوای کردوە ولاتە هەژارەکانی جیهان پێوەندییەکی گەرموگوڕ لە نێوانیاندا دروست بکەن، سەرەتا بە (تەواوکاری و هاوکاری ئەمریکای لاتین) دەستی پێ کرد، پاشان (پێک هێنانی هاوپەیمانێتی ئەفریقیا- کاریبی- ئەمریکای باشوور).

لە چەند بۆنەیەکی ڕەسمیشدا، پشتیوانی و هاوکاری خۆی بۆ تێکۆشان و خەباتی گەلی فەلەستین و لووبنان و کۆماری ئیسلامی ئێران دووپات کردۆتەوە و ئیدانەی ((USA) (USA) و ئیسرائیل)یشی کردوە.

له (11ی ئەپریلی 2002)دا، له لایەن هەندێک ناوەندی سەربازی و دارایی و سەندیکایی و بە پشتیوانی کڵێسا، هەوڵدرا کودەتایەک بە سەر (چافێز)دا بکرێت، بەڵام سەری نەگرت و شکستیهێنا، ئەگەرچی دواتر پەنجەی تۆمەت بۆ (USA) درێژکرا بەوەی دەستی لەو کودەتایەدا هەیە، بەڵام هەرزوو واشنتۆن ڕەتی کردەوە ئاگای لەو کودەتایە نییە و هیچ پێوەندییەکیشی پێوەنییە، ئەوەی زیاتر هاندەر و پشتیوانی بوو بۆ (چافێز) تا بچێتەوە سەر تەختی دەسەڵات و بەردەوام بێت لە کارەکەی، ڕاگەیەندراوەکەی (داواکاری گشتی فەنزوێلا) بوو، کە گوتبووی «گۆڕینی سەرۆک کارێکی نادەستوورییە تەنانەت ئەگەر دەستلەکارکێشانەوەش پێشکەش بکات، دەبێت دەستلەکارکێشانەوەکە لە لایەن پەرلەمانەوە پەسەند بکرێت، بۆ ئەوەی ڕێکاری یاسایی و دەستووری خۆی وەربگرێت و بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە.

له پایتەختی فەنزوێلا و زۆرینەی شارەکانی تری ئەو وڵاتە، جەماوەر و هاوڵاتییانی چینی ناوەڕاست، ڕژانە سەر شەقامەکان، بۆ گەڕاندنەوەی (چاڤێز) بۆ سەر دەسەڵات، هەروەها ڕاگەیەندراوی (19) سەرۆکی دەوڵەتانی ئەمریکای لاتین، کە بە (کۆمەڵەی ڕیۆ) ناسراوون، کودەتا سەربازییەکەی فەنزوێلایان ڕەت کردەوە، چونکە کارێکی نا دیموکراسییە و داوای گەڕانەوەی سەرۆکی هەڵبژێردراوەکەیان کرد.

ئەم هۆکارانە ڕۆڵیان هەبوو لەوەی تەنها دوای (48) سەعات، کودەتاکە شکستبهێنێت و (پیدرۆ کارمۆنا) کە بە شێوەیەکی کاتی کرابوە سەرۆکی وڵات، دەسەڵاتی بە جێ هێشت و (چافێز) گەڕایەوە بۆ کۆشکی سەرۆکایەتی فەنزوێلا لە کاراکاس، کە بە (میرافلۆریس) ناسراوە.

بە ڕێژەی (61.35%)ی دەنگی بەشداربوانی هەڵبژاردن، (چافێز) بۆ خولێکی تری سەرۆکایەتی هەڵبژێردرایەوە و چەند ساڵێکی تریش لە دەسەڵاتدا مایەوە، دوای بردنەوەی هەڵبژاردنەکە، متمانەی پەرلەمانیشی بە دەستهێنا بەوەی فەنزویلا بکرێتە دەوڵەتێکی سۆسیالیستی، لە کاتی سوێندخواردنە دەستوورییەکەشیدا ڕای گەیاند، فەنزوێلا دەبێتە دەوڵەتێکی سۆسیالیستی، لە سەر بنەماکانی (مارکسی لینینی)، هەروەها ناوی دەوڵەتەکەش لە (کۆماری فەنزوێلای پۆلیڤاری) دەگۆڕدرێت بۆ (کۆماری فەنزوێلای سۆسیالیستی).

جێی ئاماژە بۆکردنە (هۆگۆ چافێز) جگە لەوەی پێی دەگوترێت (کفرکردن)، هەموو شتێکی تری لە بیروباوەڕی مارکسییەوە وەرگرت و پێشی وایە (مەسیح) یەکەم کەسی سۆسیالیزم بوە و لە سەر ڕێگاکانی ئەو و بەپێی پرەنسیپەکانی مارکسییەت بەردەوام دەبێت، لە سەر ئەو ڕێرەوەش هەر دوو کۆمپانیای (کارەبا) و (تەلەفۆن)ی خۆماڵیی کرد.

سەرەڕای دژایەتی و ناڕەزاییە بەردەوامەکانی (USA)، لە دیسەمبەری (2006)دا، جارێکی تر (هۆگۆ چافێز) بە سەرۆکی فەنزوێلا هەڵبژێردرایەوە، هەمان ساڵیش لە لایەن گۆڤاری (تایم) ەوە، (هۆگۆ چافێز) وەک یەکێک لە (100 کەسایەتییە بەهێز و کاریگەرەکانی جیهان) دەستنیشانکرا و هەڵبژێردرا.

لە کاتی هێرشەکەی سوپای ئیسرائیلدا بۆ سەر شاری غەززە، حکوومەتەکەی (چافێز) ئاماژەی بەوەدا خۆشحاڵ نین بە بوونی باڵیۆزی ئیسرائیل لە سەر خاکی فەنزوێلا، هەروەها (هۆگۆ چافێز) باڵیۆزی وڵاتەکەی لە ئیسرائیل بانگهێشتکردەوە و بڕیاریدا بە دابەزاندنی ئاستی نوێنەرایەتکردن لەگەڵ ئیسرائیلدا

بۆ کەمترین ئاست و ڕاشی گەیاند» ئەگەر ئەم جیهانە خاوەنی ویژدانێکی زیندووبوایە، پێویستبوو سەرۆکی ئیسرائیل و سەرۆکی ئەمریکا پەلکێشی بەردەم دادگایەکی نێودەوڵەتی بکرێن، باس لەوە دەکرێت کە سەرۆکی ئیسرائیل کەسێکی خانەدانە و بەرگری لە گەلەکەی خۆی دەکات، ئەمە چ جیهانێکی پووچگەرایە کە ئێمە تێیدا دەژین؟»

-----

(کارلۆس مونعیم)ی سەرۆکی پێشووتری ئەرجەنتین، لە (2ی یۆلیۆی 1930) لە خێزانێکی موسوڵمان و پەنابەری سووری لە شاری (ئەنیاکۆ) لە دایک بوە، باوکی ناوی (شاوڵ مونعیم) بوە و دایکیشی ناوی (موهیبە عەقیل) بوە، هەردووکیان دوو پەنابەری سوریین و لە (ئەنیلاکۆ) دەژین کە گوندێکی بچووکە لە هەرێمی (لاریۆخا)ی ئەرجەنتین، پێوەندییە گەرموگوڕەکەی (کارلۆس مونعیم) لەگەڵ نیشتمانە ڕاستەقینەکەیدا نەپچڕاند، ساڵی (1964)، (کارلۆس) سەردانی سووریای کرد، دواتر و لە ساڵی (1966)دا هاوسەرگیری لەگەڵ (زیلما جومعە)دا کرد کە وەک خۆی (سووری ئەرجەنتینی)ییە، بەڵام لە ساڵی (1991) دا جیا بوونەوە.

بەهێزترین و کاریگەرترین دۆست و خۆشەویستی (کارلۆس)، (سیسیلیا بۆلۆکۆ)ی بە ڕەگەز چیللییە کە شاجوانی پێشووتری جیهان بوو، ئەگەرچی (35) ساڵ لە خۆی بچوکتر بوو، بەڵام لە ساڵی (2001)دا هاوسەرگیرییان کرد، (کارلۆس) تۆمەتبار کرا بە ئەنجام دانی گەندەڵی و خراپ بە کار هێنانی دەسەڵاتی نووسینگەکەی بۆ پشتیوانیکردنی سیاسییانەی خۆشەویستەکەی پێشووتری، بۆیە لە ترسی ڕێکارە یاسایی

و دادوەرییەکان، (کارلۆس) وڵاتەکەی جێهێشت و ڕووی کردە (چیللی).

لە زانکۆی (کوردۆبا) وەک (پارێزەر) ڕاهێنانی کردوە و یەکێک بوە لە لایەنگرانی (خوان پیرۆن)، بە شداری لە چەند خۆپیشاندانێکدا کردوە وەک پشتیوانییەک بۆ زیندانییە سیاسییەکان، ساڵی (1957) بە هۆی هاندانەکانییەوە بۆ ئەنجام دانی کاری توندوتیژی لە دژی دەسەڵاتی دیکتاتۆریەتی (پیدرۆیۆجینۆ ئارامبۆرۆ) دەستگیر کراوە، وازی لە ئایینی ئیسلام هێناوە و چۆتە سەر ئایینی (مەسیحی کاسۆلیکی) تا بگاتە کورسی دەسەڵات، چونکە لەو کاتەدا دەستوری ئەرجەنتینی تەنها ڕێگەی بەو کەسانە دەدا ببنە سەرۆک کە (مەسیحی کاسۆلیکی) بن، دوای گۆڕینی ئاینەکەی، لە (8ی یۆلیۆی 1989) بۆ (10ی دیسەمبەری 1999) سەرۆکی ئەرجەنتین بوە.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، بەڵام (کارلۆس) پێوەندییەکانی بە وڵاتە ڕەسەن و ڕاستەقینەکەیەوە نەپچڕا، وەک پێشتریش ئاماژەمان بۆ کرد، لە ساڵی (1964) سەردانی سووریای کرد و چاویکەوت بە (سەلیمە فاتمە جومعە) کە ئەویش (سووری ئەرجەنتینی) بوو، ساڵی (1966) هاوسەرگیریان کرد و ساڵی (1991) جیا بوونەوە، بەو هۆیەشەوە و تا کۆتایی هاتنی خولی سەرۆکایەتییەکەی باوکی، کچەکەیان (سەلیمە ماریا ئیڤا مونعیم) لە بۆنە ڕەسمییەکانی وڵاتەکەی دا ڕۆڵی خانمی یەکەمی ئەرجەنتینی دەبینی.

(کارلۆس) لە (مایۆی 2001)دا هاوسەرگیری لەگەڵ (سیسلیا پۆلۆکۆ)ی بە ڕەگەز چیللیدا کرد کە (35 ساڵ) لە خۆی بچووکتر بوو، ساڵی (2007) جیا بوونەوە، یەک منداڵییان هەیە بە ناوی (ماکسیمۆ مونعیم).

کەمترین شت لە بارەی (دیڤید بلانکیت)ەوە بگوترێت ئەوەیە هەست بە شەرمەزاری ناکات و لە شەرمەزاریدا برژانگەکانی ناجوڵێنێت، سەرەڕای ئابڕووچوونە بەردەوامەکانی کە لە ساڵی (2005) داو لە کاتی سەرۆکایەتی (تۆنی بلێر) ڕوویاندا، (دیڤید بلانکێت)ی نابینا و وەزیری ناوخۆی بەریتانیا کە بە (شوێنکەوتەی ژنـان) نـاسـرابـوو، بەمێشکێکی زۆر سـاردەوە ڕووبـەڕووی ئابڕووچوونێکی نوێ بۆوە و گوتی «هیچ تاوانێکم نەکردوە و لە حکوومەت دا مامەوە».دوایین ئابڕووچوونی ئەم وەزیرە، وەک بەشێک لە زنجیرەیەکی درێژی ڕاستەقینە نەک زنجیرەی سەر شاشەی تەلەڤزیۆنەکان، ئاشکرابوونی پێوەندییەکەی بوو لەگەڵ (سالی ئەندرسۆن)ی دوایین دۆست و خۆشەویستی بوو، (سالی) ئاشکرای کرد کاتێک پێوەندییەکەیان لەگەڵ (بلاکیت)ی وەزیردا کۆتایی هاتوە دوو گیان بوە، بـەڵام کۆرپەلەکەی ناوسکی لە باربردوە، چونکە بەرهەمی پێوەندییە خۆشەویستییەکەیان نەبوە لەگەڵ (نیل گۆبیر سال)ی دەستگیرانی پێشوویدا، کاتێک لە ساڵی (2004)دا (سالی و بلاکیت)، پێوەندییان دروست کردوە، هێشتا (سالی و نیل) پێکەوەبوون و دەستگیرانی یەکتربوون.

(سالی) ئەو کاتە تەمەنی تەنها (29ساڵ) بوو، باسی لەوەکردوە ئەو کاتە وەک (نوێنەر - مەندوب)ی یەکێک لە کۆمپانیاکانی کڕین و فرۆشتنی زەوی لە گەڕەکی (ئەسکۆت) لە ناوچەی (پیرکشیر) لە خۆرئاوای لەندەن کاری کردوە، دوای نائومێدبوونی لە پێوەندیکردن بە (بلانکیت)ی تەمەن (59سـاڵ)ەوە بـڕیاریداوە کۆرپەلەکەی ناو سکی لە ناو ببات، بەڵام (بلانکیت) ڕەتی کردۆتەوە وەڵامی پێوەندییە تەلەفۆنییەکەی بداتەوە.

(سالی)، بە هەفتەنامەی (news off tha worlld)ی تایبەت بـە (بـڵاو کـردنـەوەی هـەواڵـی ئـابڕووچـوونـی کەسە دیـار و بە ناوبانگەکان)ی ڕاگەیاندوە «بلانکیتی وەزیر ئامادە بوە بۆ کۆتایی

هێنانی بە پەلەی پێوەندییەکەی نێوانیان، گرێبەستێکی لەگەڵ بکات، بە پێدانی شوقەیەکی ڕاخراو لەو خانوە حکوومییەی بۆی تەرخانکراوە و بەهاکەی نزیکەی (3) ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی بوو، لەگەڵ بژاردنی هەموو باج و ڕسوماتێکدا».

(سالی) باسی لەوەشکردوە، لە بنەڕەتدا (بلانکیت) لە هاوسەرەکەی جیا بۆتەوە و باوکی (دوو کوڕ)ە، هەروەها بەڵێنیشی پێ داوە لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ئێوارەخوانێک لەگەڵ (تۆنی بلێر)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیا و (شیری) هاوسەریدا، جگە لەوەش پێی گوتوە پارێزەرە تایبەتییەکەی خۆی، ئەرکی جێبەجێکردن و یەکلاییکردنەوەی دۆسیەی دارایی نێوان (سالی) و (نیل)ی دەستگیرانی پێشوویدا بەڕێوەدەبات. بەڵام (وتەبێژ)ێک بە ناوی (بلانکیت)ی وەزیرەوە، هەموو قسەکانی (دۆستە قژ زەردەکەی) ڕەت کردەوە، لە لێدوانێکیشدا کە ڕۆژنامەکانی بەریتانیا بڵاویان کردەوە، ئەو وتەبێژە ڕایگەیاند» وەزیرەکەمان زیاد لە هەر شتێکی تر سەرقاڵە بە کار و وەزیفەکەیەوە، بابەتی خانەنشینی و دەستەبەری کۆمەڵایەتی، جێی بایەخپێدانن بە لای هاوڵاتییانی بەریتانیاوە، نەک گوێگرتن لە درۆ و بووختانی بێ بنەمای ئێرە و ئەوێ». لە بەرانبەر قسەکانی ئەو وتەبێژەدا، زۆر بە خێرایی (سالی) هاتە دەنگ و گوتی «هەموو ئەوانەی گوتومن سەد لە سەد ڕاستن، ئەگەر وەزیر ڕاست دەکات ئەی بۆچی وەڵامی پێوەندییە تەلەفۆنییەکانم ناداتەوە؟» بە پێی لێدوان و وەڵامەکانی وتەبێژەکەش «پێوەندییەکەی نێوان وەزیر و سالی زۆر پاک و بێگەرد بوە و هیچ شتێکی ناشەرعی تێدا نەبوە».

(سالی)، لە بارەی سەرەتای دروستبوونی پێوەندییەکەیەوە لەگەڵ وەزیری پێشووتری بەریتانیادا باسی لەوەکردوە شەوی (19)ی سێپتەمبەری سالی (2004)، لە شووقە تایبەتەکەی وەزیردا، پێوەندییەکی ناشەرعی و ڕێگەپێنەدراوی لەگەڵ (بلانکیت)

دا دروست کردوه و دەڵێت «ئەو شەوە پێکەوە وەجبەیەکی ماسی و پەتاتەی برژاومان خوارد، هەروەها شەرابی سووریشمان خواردەوە». ئاماژە بەوەشکراوە ئەوە یەکەم جار نەبوە (بلانکیت) توشی پێوەندیی سێکسی ناشەرعی دەبێت، پێشتر پێوەندییەکی سێکسی لەگەڵ (کیمبرلی گوین)دا هەبوە کە یەکێک بوو لە بڵاو کەرەوەکانی گۆڤاری (نیوستیتمان)، بە هۆی ئەو پێوەندییە سێکسییەی نێوانیشیانەوە منداڵێکیان بوە بە ناوی (ولیام) کە دواتر (بلانکیت) ددانی ناوە بەوەی باوکی ئەو منداڵەیە، لە کاتێکدا (کیمبرلی) هاوسەری خۆی هەبوە.

بە هۆی ئەو ئابڕووچوونەشەوە، (بلانکیت) کە ئەو کاتە وەزیری ناوخۆی بەریتانیا بوو دەستی لە کار کێشایەوە، چونکە دەرکەوت داوای کردوە پەلەبکرێت لە پێدانی ڤیزا بە هاتنە ناوەی (دایان)ی منداڵی خۆشەویستەکەی.

بەڵام چەند مانگێک دوای دەستلەکارکێشانەوەکەی، (تۆنی بلێر) بڕیاریدا بە گەڕاندنەوەی (بلانکیت) بۆنا و حکوومەتی بەریتانیا و پۆستی وەزارەتی خانەنشینی و دەستەبەری کۆمەڵایەتی پێ سپارد، کە یەکێکە لە گرینگترین وەزارەتەکانی بەریتانیا.

تا دەهات پشکی (دیڤید بلانکیت) لە جەنگەکەیدا لەگەڵ (کیمبرلی کوین) کەمتر دەبۆوە و میدیاکانی بەریتانیا وەک پێشوو بایەخییان پێ نەدەدا، لەو بارەیەشەوە وتەبێژی ڕەسمی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا ڕای گەیاند «ئەو تۆمەتانەی ئاڕاستەی بلانکیت کران، وەک شانۆگەریی وابوون، شایستەی ئەوە نییە هیچ قسەیەکی لە سەر بکرێت».

(لیۆنسیا کاسلام) کە بەخێوکارە فلیپینییەکەی منداڵی (کیمبرلی) بوو، بە ڕۆژنامەی (دەیلی مەیل)ی بەریتانی ڕاگەیاندوە کە (کیمبەر) گوتوویەتی هاوڕێیەکم هەیە و یارمەتیت دەدات تا مافی مانەوە وەربگریت.

(فالیری جیسیکار)ی سەرۆکی فەرەنسا، هیچ کات نەی دەتوانی دەستبەرداری تێکەڵاوی و ئارەزووەکانی بێت بۆ ژنان، تەنانەت بەشێکی گرینگی بیرەوەرییەکانی خۆی تەرخانکردوە بۆ ژنان، کە بە ناونیشانی (دەسەڵات و ژیان) بڵاوی کردۆتەوە.

پێشتر (ڤالیری جیسیکار)، لە زستانی ساڵی (1980) و لە دانیشتنێکدا لەگەڵ ژمارەیەک لە ڕۆژنامەنووسان، ئاماژەی بەوەکردوە پێوەندییەکی نهێنی هەیە لەگەڵ ژنان و کچاندا، بەڵام هەرزوو، لە ڕێگەی کتێبەکەیەوە دەمامک لە سەر ڕوخساری لابراو پێوەندییە سۆزدارییەکانی لەگەڵ (17) ملیۆن فەرەنسییدا ئاشکرا بوو، لە ماوەی ئەو (7) ساڵەدا کە سەرۆکی فەرەنسا بوە.

بێ گومان ڕەنگە ئەو ژمارەیە بە لای زۆرینەوە هەم سەیر بێت، هەم بە بێ مانا ئەژمار بکرێت، بەڵام خودی (جیسیکار) پێی وایە ئەوەی نامۆیە لەو بابەتەدا تەنها ژمارەکەیە و هەر کاتێکیش گوێی لێ دەبێت، پێکەنینی پێ دێت، چونکە بە بۆچوونی ئەم سەرۆکەی فەرەنسا «زۆری ژمارەی خۆشەویستی هەرگیز خۆشەویستی ناکوژێت».

(جیسیکار) بەوپەڕی نائومێدییەوە چاوەڕێی کاتی ژوان و یەکتربینینی دەکرد لەگەڵ کچ و ژنە فەرەنسییەکاندا، لە میانەی گەشتە ناوخۆیی یان دەرەکییەکانیدا، بە پەلەبوو بۆ ئەوەی جوانەکانیان لە باوەش بگرێت، چەندین جار دانی بەوەداناوە کە بزەی سەرلێوەکانیان، گوزارشتە لە مێیینەیەکی ڕاستەقینە، کە تەنها لە فەرەنسادا هەیە.

کتێبی بیرەوەرییەکانی (جیسیکا) بە ناوی (دەسەڵات و ژیان)، چەندین ڕووداو و تۆماری سەرنج ڕاکێشی تێدایە، یەکێک لەوانە

تایبەتە بە سەردانەکەی (هوا جیۆفۆنگ)ی سەرۆکی چین و شوێنگرەوەی (ماو تسی تۆنگ) بۆ فەرەنسا لە ساڵی (1976) دا، تێیدا وێنەیەکی یادگاری لە سەر ڕووکاری هۆتێلی (قۆدفرۆی) هەڵواسی، کاتێک (شۆ) لە کارگەی ڕۆنۆ کاری دەکرد، لەو هۆتێلە نیشتەجێبووبوو.

(جیسیکار)، هاوتا چینییەکەی و وەفدە هاوڕێکەی بە بەشەکانی هۆتێلەکەدا دەگێڕاو بردییە یەکێک لە ژوورەکانی نهۆمی دوەم، کە دەبوایە خاوەنی هۆتێلەکە تەرخانی بکردایە بۆ چینییەکان، بەڵام کاتێک (جیسیکار) دەرگای ژوورەکەی کردەوە توشی سەرسوڕمان بوو، چونکە بینی (ژن و پیاو)ێک بە دەم هاوارکردنەوە، لە جوانترین و خۆشترین ساتەکانی ژیانیاندان و سێکس دەکەن، خاوەنی هۆتێلەکە داواکارییەکەی سەرۆکایەتی فەرەنسای لە بیر کردبوو، ئەو ژوورەشی بە کەسێکی تری دەرەوەی وەفدە چینییەکە دابوو بە کرێ، بۆ هەمیشە، (جیسیکار) ی سەرۆکی فەرەنسا ئەو دیمەن و ڕووداوەی لە بیر نەکرد.

(جیسیکار) چەند ساڵێک دوای ئەو ڕووداوە و لە ڕۆژانی (12 و 13)ی یۆنیۆی ساڵی (1980)دا سەردانی (بوندوقیە)ی کرد، بە مەبەستی بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی ئەورووپادا، بەڵام کاتێک (سەرۆکی فەرەنسا) بە هاوڕێیەتی (مارگرێت تاتچەر)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیا و (هێلمۆت شمیدیت)ی ڕاوێژکاری ئەڵمانیا سەردانی (گۆڕەپانی قەشە مارک) یانکرد، سیحر و جوانییە ئەفسوناوییەکەی (بندوقیە) هەست و خەیاڵی سەرۆکی فەرەنسای بەرەو شوێنێکی دوور برد، تەنانەت کەوتە خەیاڵ و بیرکردنەوە لە کەسایەتییەکانی شانۆنووسی ئیتاڵی (کارلۆ قۆلدۆنی).

له کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی وەزیراندا، (جیسیکار)ی سەرۆک، هەستوسۆز و سەرنج ڕاکێشییەکی زۆری لە (ئەلیس سۆنیی سییتی) وەزیری پەروەردەی نیشتمانی فەرەنسادا دەبینی، بە ڕادەیەک باسی لە لایەنە مرۆڤدۆستییەکەی دەکرد، جیاواز لەوەی وەک وەزیرێکی ژن دەیبینی، بەڵام ئەمە کۆتاییەکەی نییە.

لە ئەپریلی ساڵی (1981)، واتا مانگێک پێش ئەنجام دانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی فەرەنسا، (جیسیکا) ئامادەی کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی بوو کە لە شاری (ئەجاکسیۆ) ڕێکخرابوو، لە سەر تەختەی شانۆکەش (ئەلیس)ی وەزیری پەروەردە لە تەنیشتییەوە بوو. (جیسیکار) باسی لەوەشکردوە هەستێکی تایبەتی هەیە کاتێک (ئەلیس) هاوڕێیەتی دەکات، ئەم هەستە پێوەندی بە سەرۆک یان کاندیدی سەرۆکایەتییەوە نییە، بەڵکوو پێوەندی بە هەستی پیاوێکی فەرەنسییەوە هەیە.

(جیسیکار) زۆر سەرسام بوو بە (ئەلیس)ی وەزیری پەروەردەی نیشتمانی فەرەنسا، لەو بارەیەوە دەڵێت «کاتێک پێش من قسە دەکات سەیری دەکەم، سەرنج لەو جەستەیەی دەدەم کە پاڵتۆیەکی درێژ دایپۆشیوە، جووڵە و قاچە درێژە برۆنزییەکانی دێنە ناو مێشک و خەیاڵمەوە و شتی نامۆ بە بیر و هۆشم دا دێت بەوەی ئایا لە کاتی سێکسدا بەو جۆرە توندووتیژ و گەرموگوڕە؟»

ڕۆژنامە نێودەوڵەتییەکان، بێ ئاگاو بێ دەنگ نەبوون بۆ باس کردنی ئارەزووە سێکسییەکانی (جیسیکار)ی سەرۆکی فەرەنسا و پێوەندییەکانی لەگەڵ ژنان و کچاندا، لە یۆلیۆی ساڵی (1975)دا، ڕۆژنامەی (پاریس ئیسی) بابەتێکی بڵاو کردەوە، کە لە ڕۆژنامەی (ئەنگلۆ ساکسۆنی)ییەوە وەریگرتبوو،

به ناونیشانی (جیسیکار، جگه لە ژنـان بیر لە هیچی تر ناکاتەوە)، هەروەها ئەم ناونیشانە لاوەکیەشی بۆ هەڵبژاردبوو (هەموو فەرەنسییەکان شانازی پێوە دەکەن)، لای خۆشییەوە گۆڤاری هەفتانەی (تایم)ی ئەمریکی لە بابەتێکدا نووسیویتی (ئـەوەی هەموو کۆمەڵگەی پاریسی سەرقاڵکردوە، زانین و ئاشکراکردنی ئەو شوێنەیە کە جیسیکار شەوی تێدا دەکاتەوە و لێی دەمێنێتەوە)، هـەر سـەبـارەت بە مـانـەوەی شەوانەی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسا، (مۆریس کۆف دۆمۆرفێل)ی وەزیری یەکەمی پێشووتری فەرەنسا بە تەوسەوە گوتبووی «جیسیکار تاکە سەرۆکە لە جیهاندا کە ناتوانین بزانین شەو لە کوێ دەمێنێتەوە».

لە کاتێکیشدا (میشێل بۆنیاتۆفسکی) وەزیـری پێشووتری فـەرەنـسـا، ئـەو بابەتەی لـەگـەڵ (میشێل باسـی) لێپرسراوی نووسینگەی میدیایی (سـەرۆکی فـەرەنـسـا)دا بـاس کردبوو، ئامۆژگاریی (جیسیکار)ی کردبوو، بـەوەی باسی پێوەندییە تایبەتییەکانی نەکات و هێندەش باس لەوە نەکات کە سوودی لە هۆتێل (مارینی) وەرگرتوە بۆ پێوەندییە سێکسییەکانی.

لەو کاتەدا، میدیا و ڕۆژنامە جیهانییەکان بایەخ و گرینگییەکی زۆریـان بە پێوەندی و ئـارەزووە سێکسییەکانی (جیسیکار) ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسا دەدا، لەو چوارچێوەیەشدا گۆڤاری (تایم) وێنەیەکی فۆتۆگرافی شـازادەی ئیتالیای بڵاو کردەوە و بە یەکێک لە دۆستەکانی سەرۆکی فەرەنسا ناوی بردبوو.

گۆڤاری (ناشناڵ ستار)یش هەواڵێکی بڵاو کردبۆوە لە سەر پێوەندیی نێوان (جیسیکار) و کچە وێنەگرێکی ڕۆژنامەکان کە

لە میانەی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردندا یەکیان ناسیبوو، هەروەها هەفتەنامەی (نیویۆرک)یش لیستێکی بڵاو کردەوە لە سەر ئەو کچ و ژنانەی دۆستایەتی و هاوڕێیەتی و پێوەندیی پتەو و نزیکیان لەگەڵ (جیسیکار)ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسادا هەبوە، لە نێویشیاندا کۆنتیسەی ئەسمەر و هونەرمەندە ناسراو و میوزیکییەکەی و ئەو ئەستێرەیەی خاوەنی جوانییەکی دڵڕفێن و بێ وێنە بوو.

ئەو سیفاتانەی باس کران، ئاماژەن بۆ (مارلین دوبیر)ی ژنە هونەرمەندی فەرەنسی و (کاتی ڕۆزی) ژنە شانۆکاری کۆمیدی فەرەنسا، کە هەر دووکیان ڕەتیان کردەوە هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ (جیسیکار)دا هەبێت، تەنانەت (مارلین) چەند جارێک تەئکیدی کردەوە لەوەی (تەنها یەک جار لە یەکێک لە هۆتێلەکانی شاری جەربای توونس بە ڕێکەوت چاوی کەوتوە بە جیسیکار).

(سیلڤیا)ی وەرگێڕی فیلمی (ئیمانوێل) کە لە هەشتاکاندا ناوبانگێکی زۆری هەبوو، تەئکید دەکاتەوە لە سەر ئەوەی هەندێک لە ڕۆژنامەکان پێشنیاری سەرکێشییەکیان بۆ کردوە لەگەڵ (جیسیکار)دا، کاتێک یەکێک بوە لە لایەنگرانی (میتران) و بیری سۆسیالیستی، بەڵام ئەم دەنگۆیانە ڕاست بن یان دروستکراوبن، بەڵام دوورونزیک ڕۆڵییان هەبوە لە دروستکردن و ڕازاندنەوەی وێنەی (لویسی چواردەیەمی هاوچەرخ).

بەڵام، گرینگیدانی (جیسیکار) بە ژنان و کەوتنە داویانەوە، بە شێوەیەکی زۆر خراپ کۆتایی هات، فەرەنسا چەند ڕووداوێکی بە ڕووی خۆیدا کردوە کە تێیدا پێوەندییە سۆزدارییەکان و بەرژەوەندییە ستراتیژییەکانی وڵات بەریەکتردەکەون و یەکتر دەبڕن، حکوومەتی فەرەنسا لە زستانی ساڵی

(1979) دا پرۆسەیەکی سەربازیی لە ئەفریقیای ناوەند بە ناوی ئۆپراسیۆنی (باراکۆدا) ئەنجام دا، کە تێیدا سەربازە پەرەشوتوانەکانی فەرەنسا، توانیان بە شێوەیەکی یەک جارەکی کۆتایی بە ڕژێمی ئیمپراتۆریەتی (جۆن بیدیل بۆکاسا) بهێنن، جیاواز لەمە بابەتەکە بەو شێوە سادە و ئاسان کۆتایی نەهات کە پێشبینی دەکرێت، ڕۆژنامە و میدیاکان باسیان لەو کۆمەڵکوژییە دەکرد کە ئۆپراسیۆنە سەربازییەکەی فەرەنسا بەرانبەر بە منداڵان و کەسانی بێ تاوان ئەنجامی دا بوو، کاتێکیش (بۆکاسا) لە دۆسییەی (ئەڵماس)ەکاندا بە بێ تاوان دانرا، سەر لە نوێ بابەتەکە لە ناو میدیاکاندا تەقییەوە و هەفتەنامەی (لۆکانار ئۆنشینی) زۆرترین لاپەڕەی بۆ ئەو دۆسیەیە تەرخانکرد.

بەپێی ئەو زانیاری و هەواڵانەی هەفتەنامەی (لۆکانار ئۆنشینی) بڵاوی کردۆتەوە، (جۆن بیدیل بۆکاسا)ی ئیمپتراتۆری لە سەر کار لابراوی ئەفریقیای ناوەند، (کۆمەڵێک بەردی نەفیس)ی بە دیاری بەخشیوەتە (جیسیکار)ی سەرۆکی فەرەنسا، هەروەها چەند (قیرات)ێکیشی بەخشیوەتە دوو کوڕی ئەنجوومەنە گشتییەکەی و ڕاوێژکاری سەرۆکی فەرەنسا بۆ کاروباری ئەفریقیا و دوو وەزیری حکوومەتی فەرەنسا.

لە مەش گرینگتر قسەکانی (سیلفستەر بۆنگی) باڵیۆزی پێشووی بۆکاسایە، لە دۆسیەی ئەڵماسەکاندا، بۆ (ڕۆجلی) پارێزگاری پرسگەی گشتیی، دوای دەستکەوتن و کۆ کردنەوەی زانیاریی ورد لە چەند سەرچاوەیەکی ئەفریقییەوە ڕاپۆرتێکی تایبەتی لە سەر ئەو دۆسیەیە ئامادە کرد.

لە ڕۆژی (25)ی یەنایەری ساڵی (1980)، یەکێک لە

کارمەندانی پۆلیس کە ئەرکەکەی تەواو بووبوو، بە یارمەتی هاوڕێیەکی خۆی لە سوپادا، بروسکەیەکی کرد بۆ پرسگەی گشتی، بەوەی پێدەچێت (سەرۆک جیسیکار دیستان) لە چەند مانگی داهاتوودا ببێتە ئامانجی هێرشێکی نوێ، بە هۆی سەردانەکانی بۆ ئەفریقیای ناوەڕاست، بەڵام ئەمجارە بابەتەکە پێوەندی بە دۆسییەی (ئەڵماس)ەکانەوە نییە، بەڵکوو پێوەندی بەو شەوە ئاهەنگانەوە هەیە کە لەو وڵاتە بە سەریان دەبات.

(بۆکاسا)، هیچ کەمتەرخەمی و ڕەزیلی و پاشەکەوتێکی نەبوو لە خزمەتکردنی میوانە فەرەنسییەکانی، لە پێشکەشکردنی خۆشترین و بە تامترین و بەچێژترینی ئەو شتانەی حەزیان پێ دەکرد.

(ڕۆجلی) تا ڕادەیەکی باش ڕاستی گوتوە و هەڵەی نەکردوە، (بۆکاسا) لە (ئەبیدجان) و تاراوگەوە دەستپێشخەر بوو لە هێرشەکانی، (15) ڕۆژ دواتر، (ئیمپراتۆر) نامەیەکی چوار لاپەڕەیی ئاڕاستەی (جەنەراڵ ئەیادیما)ی هاوڕێی و سەرۆکی (تۆگۆ) کرد و تێیدا نووسیبوی «مانگی مایۆی ساڵی (1979) جیسیکار دیستان لە کیگالی داوای لێ کردم (کاسرین)ی هاوسەرم بنێرم بۆ فەرەنسا، دوای گەیشتنی بۆ فەرەنسا، سەرۆکی فەرەنسا هاوسەرەکەمی لە هەموو ئەو شتانە ئاگادار کردەوە لە دژی من ئامادە و ڕێکی خستبوو، هۆشداریشیدابوویە بەوەی لە سەر ئەو بابەتە هیچم پێ نەڵێت، لە بەرانبەریشدا بەڵێنی پێدابوو لە ڕووی داراییەوە هاوکاری بکات و لە چەند ڕوویەکەوە سوودی پێ بگەیەنێت، ئێستا هاوسەرەکەم بۆتە دۆستی جیسیکار دیستان، هەر چەندە من لەم ڕووەوە هیچ زانیارییەکی وردم لانییە، بەڵام

لە نامەیەکی دەستوخەتدا، سەرۆکی فەرەنسا، هەستوسۆز و حەزەکانی بەرانبەر بە هاوسەرەکەم ئاشکرا کردوە».

(بوکاسا) هەستی بە سووکایەتی و بێ ڕێزیکردن دەکرد بەرانبەر بە کەسایەتی و شکۆی، ڕۆژگاریش خستییە دۆخێکەوە، ئەو نەیارەی سەرخست کە هاوسەرەکەی لە خشتە بردبوو.

(جۆن کلۆن شۆزفیل) لە شاری (ئەبیدجان) فیلمێکی دۆکیۆمێنتاریی لە سەر (بۆکاسا) ئامادەکرد، لەو پرۆگرامەشدا (بۆکاسا) وردەکاریی پێوەندییەکەی (جیسیکار) و خێزانەکەی خۆی ئاشکرا کرد، بەڵام کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکان بڵاو کردنەوەی ئەو فیلمە دۆکیۆمێنتارییەیان ڕەت کردەوە، چونکە بە هۆی قسەکانی ژەنەراڵە لە سەر کار لابراوەکەوە، حکوومەتی پاریس دەکەوتە دۆخێکی پڕ لە شەرمەزارییەوە.

(ڕۆجلی) باسی لەوەکردوە «(جۆرج) لە یەکێک لە ژوورەکانی هۆتێلی (ناپلیۆن) نیشتەجێ بوو، لەگەڵ یەکێک لە هاوڕێ سەربازەکانم دا چاومان پێکەوتوە و خۆمان وەک سیخوڕ و بریکاری دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل (موساد) ناساندوە، جانتایەکمان پێ بوو بە حساب پڕە لە پارە و چاوەڕێی وەرگرتنی دۆکیۆمێنتەکان بووین، سەرکەوتوو بووین لە گەڕاندنەوە و وەرگرتنەوەی ئەو نامە و نووسراوەی ناونیشانی ئەو پزیشکەی لە سەر بوو کە نزیک بوو لە کۆشکی ئەلیزێ و تێیدا ئامۆژگاریی (ژنی ئیمپراتۆر)ی کردوە بە هۆی دۆخی تەندروستییەوە، چیتر سێکس نەکات، ئەو نامە و تێبینی پزیشکە بەس بوو بۆ ئەوەی (ئیمپراتۆر) بە تەواوەتی هاوسەرەکەی لە بیر بکات».

تۆمەتەکانی ئیمپراتۆرە لە سەر کار لابراوەکە لێرەولەوێ قسەوقسەڵۆکی زۆری بە دوای خۆیدا هێنا، بەڵام ستاف

و داورودەستەکەی (جیسیکار)ی سەرۆککۆماری فەرەنسا چەند جارێک تەئکیدیان کردەوە لە سەر ئەوەی (بۆکاسا) نەخۆشە و ئیرەیی و غیرەکردنەکەی لە هاوسەرەکەی بەرەو شێتبوونی بردوە، بەوەی پڕوپاگەندەیەکی تریشی بڵاو کردەوە کە ئامۆزایەکی (جیسیکار) پێوەندی سێکسی لەگەڵ (کاترینا بۆکاسا)دا هەیە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە (دیستان) دەیویست بابەتەکە بە نهێنی و شاراوەیی بمێنێتەوە و بڵاو نەبێتەوە، بە تایبەتی کە ئاگای لە وردەکاریی ڕووداوەکان بوو.

(جیسیکار) لە کتێبەکەیدا (دەسەڵات و ژیان)، باسی لەوەکردوە کە چۆن لەساڵی (1975)دا (بۆکاسا) چۆتە سەر تەختی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەت و تاجی (ئیمپراتۆر)ی لە سەر ناوە، هەروەها تەئکیدیشیکردۆتەوە لە سەر ئەوەی (کاسرین) توانیبووی سەرنجی (بۆکاسا) ڕابکێشێت و ببێتە (ژنی نوێی ئیمپراتۆر)، بە تایبەت دوای دەرکەوتنی بە ڕاستەوخۆیی لە سەر شاشەی تەلەڤزیۆنەکان، کاتێک تاجی ئیمپراتۆری دەکاتە سەر، (جیسیکار) باسیشی لەو گەشتی ڕاوکردنانە کردوە کە لە کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست ئەنجامی داون، واتا لەو وڵاتەی پڕە لە شتی نامۆ و سەرنج ڕاکێش.

جارێکی تریش (جیسیکار دیستان)ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسا، کەوتە ناو داوێکی ترەوە و ئەم جارە (کاترین فیرجیتی) پاڵەوانی چیرۆکەکە بوو، کە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا بەڕێوەبەری ئاژانسی (بگاو) بوو، کاری ئەو ئاژانسە وەرگرتن و جێبەجێکردنی داواکاری کڕیارەکانی بوو، ئەویش بە ناردنی ئەو کچە گەنجانەی جەستە و قاچ و قولیان هاوشێوەی نمایشکارەکانی جلوبەرگ بوو، بۆ کەسایەتییە دیار و ناسراوەکان.

وەک باسی کردبوو، کڕیارەکانی زۆربوون و لە ئاست و پلەوپێگەی بەرز و بالآدابوون، وەک(ڕەزا شا)ی پێشووی ئێران، هەروەها سەرۆکی وڵاتانی ئەفریقیا و بازرگانانی چەک، کە لە نێویشیاندا چەند عەرەبێک هەبوون، بە دڵنیایش هەندێک وەزیر و پەرلەمانتاری فەرەنساشیان تێدا بوو.

(کاسرین فیرجیتی) نەیتوانی بیرەوەری و نهێنییەکان لە ناو ناخی خۆیدا بهێڵێتەوە و بڵاویان نەکاتەوە، بەڵکوو لە ڕێگەی بڵاو کردنەوەی دوو وێنەی گرینگی ڕەش و سپییەوە، بەڵگە و زانیاری زیاتری لە سەر پێوەندی و دۆستایەتی خۆی و (جیسیکار) بڵاو دەکردەوە، لە یەکێک لە وێنەکاندا (کاسرین) بە پێوە وەستاوە و (ڤالیری جیسیکار دیستان)ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنساش لە تەنیشتییەوە دانیشتوە، کە پێڵاوێکی سپی لە پێدایە و کڵاوێکیشی لە سەردایە، لە وێنەکەی تریشدا کە لە دارستانەکانی (ساڤانا) گرتوویانە، بە هەمان شێوە (کاسرین) و (جیسیکار) بە تەنیشت یەکەوەن و لە ناوەڕاستی هاوڕێکانیاندا وەستاوون.

دیارە هەر دوو وێنەکە لە ئەفریقیا گیراون، لەو کاتەدا (جیسیکار) وەزیری دارایی فەرەنسا بوو لە سەردەمی (جۆرج بۆمبیۆدۆ)دا، بەپێی قسەکانی (کاسرین) ئەو گەشتە لە کینیا بوە لەگەڵ هاوڕێ هاوبەشەکانی نێوانیاندا و دوو ساڵ پێش هەڵبژاردنی (جیسیکار) بوە بە سەرۆکی فەرەنسا، هەروەها ئاماژەی بەوەشکردوە هیچ کات پێوەندییەکانی لەگەڵ (جیسیکار) دا پێوەندییەکی بازرگانی نەبوە، واتا (جیسیکار) کڕیار نەبوە و هیچ بایەخێکی بە ژنە لەشفرۆشەکانیش نەدەدا و بە شوێنیاندا نەدەگەڕا.

(کاسرین) ڕەتیشی کردەوە ئەو وێنانەی بۆ بێزارکردن و بە کار هێنانی لە دژی (جیسیکار) بە کار هێنابێت، بە تایبەتی دوای ئەوەی بوە سەرۆک کۆماری فەرەنسا، تەئکیدشیکردۆتەوە ڕازی نەبوە ئەو وێنانە لە بەرانبەر پارەیەکی خەیاڵیدا بفرۆشێت بە لێپرسراوێکی بالای پارتی سۆسیالیستی فەرەنسا، هەروەها سووریشە لە سەر ئەوەی هیچ کاتێک ئەو وێنانەی لە سوود و بەرژەوەندی خۆیدا بە کار نەهێناوە، تەنانەت کاتێکیش دەستگیر کراوە و بۆ ماوەیەک ڕاگیراوە، بە هیچ شێوەیەک داوای هاوکاری لە هیچ سەرکردە و سیاسەتمەدارێکی فەرەنسا نەکردوە.

(کاسرین) باسی لەوەشکردوە هێزەکانی پۆلیس لە کاتی گەڕان و پشکنین و لێکۆڵینەوەکانیاندا لەگەڵی، نەیانتوانیوە ئەو تۆماری بیرەوەرییانەیان دەست بکەوێت، کە پڕە لە ناو و ژمارەی کەسانی خەیاڵی و باوەڕ پێ نەکراو، چونکە ئەو تۆمارە ناو و ژمارەی ڕاستەقینەی کڕیارەکانی تێدا نووسراوە، بەلام پۆلیس لە بیریان کرد ئەو تۆمارە بخوێننەوە و سەیری زانیارییەکانی ناوی بکەن، هێزەکانی پۆلیسی تایبەت بە تیمی ڕەوشتی، لە دیسەمبەری سالی (1977) و لە یەکەم دەستگیرکردنیدا، تەنها ئەو دوو وێنەیەیان دەستکەوت، ئەو جارە، ماوەی سزای زیندانیکردنەکەشی لە شەش مانگەوە کەمکرایەوە بۆ دوو مانگ.

لە یەنایەری سالی (1980) دا جارێکی تر (کاسرین) لە لایەن پۆلیسەوە دەستگیر کرایەوە، ئەمجارەش ماوەیەکی زۆر لە زینداندا نەمایەوە و ئازادکرا، لەو کاتەشدا هەفتەنامەی (لۆکانار ئۆنشینی) گەیشتە ئەو باوەڕەی گروپێک لە کارمەندانی دەوڵەت، سەرەتا دوودڵبوون، بەلام لە کۆتاییدا بوونەتە هاوسۆزی بیرەوەرییەکانی ئەو ژنە.

هەفتەنامەی (لۆکانار ئۆنشینی)، بە دواداچوونی وردی بۆ ئەو کێشەیە کرد، بە بێ ئەوەی ناوی (جیسیکار) بهێنێت و تەنها بە ئاماژەکردنێک بۆ ئەوەی کەسێکی گەورە و گرینگی دەوڵەت، توانای ئەوەی هەیە (جیاواز لە دۆسییەی ئەڵماسەکانی بۆکاسا) فشار لە سەر کۆشکی سەرۆکایەتی و دەسەڵاتدارێتی فەرەنسا دروست بکات، بە تایبەت دوای ئەوەی (کلۆد ئۆنجینی) ڕۆژنامەنووس، لە ڕاپۆرتێکدا باسی لە پەیوەندییەکەی نێوان ئامۆزای وەزیرێکی گرینگی کابینەکەی (جیسیکار) و یەکێک لە ژنەکانی تۆڕی (بەگاو) دا هەیە کە لە لایەن (کاسرین) ەوە بەڕێوەدەبرا، ئەو ڕۆژنامەنووسە ئاماژەی بەوەشکردوە (فرانسوا بۆلج)ی سکرتێری گشتی کۆشکی ئەلیزێ بە وردی چاودێری دۆسییەکە دەکات، کە ناوی چەند کەسێکی تریشی تێدابوو.

بەپێی ئەو ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییە، هەر یەک لە (جۆرن دۆکری) فەرماندەی پۆلیسی دادوەریی پاریس، (پۆل لیس سادون) بریکاری سەرۆکایەتی فەرەنسا، (کریستیان لو گینهیک) ی بریکار، خرانە خزمەتی لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونی ئەم دۆسیەیە، بەڵام بە بێ ئەوەی ئاماژە بە هۆکاری ڕاسپاردنی ئەو لێپرسراوە ئەمنییانەی پاریس بکرێت، بۆ لێکۆڵینەوەکردن لە دۆسیەیەکی لەو جۆرە.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە چۆن هەموو دامەزراوەکانی دەوڵەت سەرقاڵ دەکرێن بە لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونی ژیانی تایبەتی سیاسەتمەداران.

ئابڕووچونە سێکسی و سۆزدارییەکان لە بەریتانیا کۆتایی نایەت، پاڵەوانی ئەم چیرۆکی ئابڕووچوونەش (جۆن مێجەر) ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری بەریتانیایە، ئەویش بە تێوەگلانی لە پێوەندییەکی سۆزداری و سێکسی لەگەڵ هاوکار و هاوپیشەیەکیدا لە حکوومەت، ئەویش (ئۆدینا کۆری) وەزیرە، لە کابینەکەی (مارگرێت تاتچەر).

(ئۆدینا) لە ڕێگەی گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانییەوە، کە لەم دواییەدا ڕۆژنامەکانی بەریتانیا بڵاویان کردەوە، ئەو بابەتە ئابڕووچوونەی بڵاو کردەوە، هاوکات (جۆن مێجەر)یش، بە هەمان شێوە دانی بەو پێوەندییەدانا باسی لەوەکرد (نۆرما) ی هاوسەری لێی خۆشبوە، هەروەها گوتیشی هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرانبەر بە بڵاو کردنەوەی شتێکی لەو جۆرە لە ڕۆژنامەکاندا.

ئاشکرابوونی ئەو ئابڕووچوونە، یەکێک بوو لە هۆکارە گرینگەکانی کەمبوونەوەی ئاستی جەماوەری پارتی پارێزگارانی بەریتانیا و دوورخستنەوەیان لە دەسەڵات، بەوەش ڕێگا لە بەردەم پارتی کرێکارانی بەریتانیادا چۆڵبوو، بۆ ئەوەی دوای دوورکەوتنەوەیەکی زۆر، جارێکی تر بگەڕێنەوە سەر کورسی دەسەڵات، هاوکات یەکێک لە دیارترین سیمبولەکانی پارتی پارێزگارانیش کرایە ئامانج.

بەڵام هۆکاری ژنەکە بۆ بڵاو کردنەوەی ئەو بابەتە، تۆڵەکردنەوەی بوو لە خۆشەویستەکەی پێشووتری، جگە لەوەش پارەیەکی زۆریشی دەویست، ئەو ژنەش (ئەدوین کۆری) بوو، کە پێشتر ئەندام بوو لە ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا، هەروەها وەزیریش بوە لە کابینەی پێشووتری حکوومەتی بەریتانیا.

(ئەدوین کۆری) بە بێ هیچ پێشەکییەک و لە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەی (تایمز) گوتبووی «بەم نزیکانە دەست دەکەم بە بڵاو کردنەوەی بیرەوەرییەکانم، بە شێوەی زنجیرەیەکی ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا و دواتر دەیکەمە کتێب».

گوتبووشی «لە بیرەوەرییەکانم دا بۆمبێک هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە من سەرنجی (جۆن مێجەر)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووی بەریتانیام ڕاکێشاوە تا ببێتە دۆست و خۆشەویستم، نزیکەی (4) ساڵ، هاتۆتە ناو جێگەکەمەوە و پێوەندی سێکسیمان هەبوە».

(جۆن مێجەر)، سەرۆکی زۆرینەی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیابوو کە نوێنەرانی پارێزگاران بوون، (کۆری)ش کە وەزیری پێشووتری تەندروستی بەریتانیا بوو، لە لایەن (مارگرێت تاتچەر)ی سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی بەریتانیاوە دەرکرا، چونکە لە لێدوانێکیدا بۆ ڕۆژنامەکان گوتبووی ئەو هێلکەیەی کە بەریتانیا لە (سالامۆنیلا) بەرهەمی دەهێنێت ڤایرۆسی پێوەیە، جووتیارەکانیش کەوتنە نارەزایی دەربڕین و گوتیان بە بیانووی ئەوەی هێلکەکەیان ڤایرۆسی پێوەیە نافرۆشرێت، لەبەر ئەو لێدوانەی لە پۆستەکەی دوورخرایەوە.

دواتر (ئەدوین کۆری) چەند چیرۆکێکی تری ڕووداوی سێکسی بڵاو کردەوە، هیچ کەسێک گومانی بۆ ئەوە نەدەکرد، کە پاڵەوانی نێو چیرۆکەکان کێن و (جۆن مێجەر)یش یەکێکە لەوان، یان چ پێوەندییەک هەیە لە نێوان نووسەری ئەو چیرۆکانە و ژنە پاڵەوانی نێو چیرۆکە سێکسییەکان، بەڵام دوای ئاشکرابوون و بڵاو بوونەوەی ئابڕووچوونەکان دەرکەوت چ پێوەندییەک لە نێوان کارەکتەرەکان و کەسایەتییەکانی نێو کۆمەڵگە و

نووسەری ئەو چیرۆکانەدا هەیە، بەڵام گەلی بەریتانی بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەگەڕان بۆچی جارێکی تر ئەو چیرۆک و زانیارییە ڕۆمانسی و پێوەندییە سێکسییانە بڵاو دەکرێنەوە، لە کاتێکدا (14) ساڵ پێشتر بڵاو بۆتەوە و بکەرەکانیشی ناوبانگییان زڕا، وەڵامەکەشی ئەوەیە ژنە وەزیرەکەی پێشوو، داوای پارەی دەکرد، هەر واشبوو، کرێ و پاداشتی نووسینەوە و بڵاو کردنەوەی بیرەوەرییەکانی گەیشتە نزیکەی (یەک ملیۆن جونەیهی ئیستەرلینی).

کاتێک (جۆن میجەر) ئەندامی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانیا بوو، پێوەندییەکی سۆزداری و سێکسی لەگەڵ (ئەدوین)دا هەبوو، بەڵام کاتێک (مێجەر) زانی چانسی هەیە لە وەرگرتنی پۆستێکی وەزاریی لە حکوومەتی بەریتانیا، ئەوا کۆتایی بەو پێوەندییە هێناو لێی دوورکەوتەوە.

چاو و تیشکی میدیا و ڕۆژنامەکان لە سەر ئەو ژنە وەزیرەی پێشووی بەریتانیا کە خۆشەویست و دۆستی (جۆن مێجەر) بوو زۆر کزبوو، (ئەدوین) هەم هاوسەری هەبوو هەم دایکی دوو منداڵیش بوو، بە هەمان شێوەش (جۆن مێجەر) هاوسەری هەبوو و باوکی دوو منداڵیش بوو، لێرەدا ئەو ژنە وەزیرە سەر لە نوێ چیرۆکی پێوەندییەکی کۆنی سۆزداری و سێکسی خۆی و (جۆن مێجەر)ی لە ناو ڕۆژنامەکاندا وروژاند، بۆ ئەوەی ببێتەوە بە مانشێت و کەسێکی دیاری نێو ڕۆژنامەکان.

کاتێکیش لە هاوسەری پێشووی (ئەدوین)یان پرسی چ هەستێکی هەیە لە سەر ژیانی خیانەتی هاوسەرێتی و فێڵ و لە خشتەبردنی هاوسەرەکەی، هیچ وەڵامێکی نەبوو، بەڵام سەبارەت بە هۆکاری جیا بوونەوەکەیان گوتی لە سەر چەند

هۆکارێکی تر لێی جیا بۆتەوە و پێوەندی بە لایەنی سۆزداری و سێکسییەوە نییە.

لە وەڵامی هەمان پرسیاردا، هاوسەری دوەمی (ئەدوین) گوتی»ئەوە ڕابردووی بوە و ئەو کاتە من هاوسەری نەبووم«.

بە هۆی نووسین و بیرەوەرییەکانەوە (جۆرن مێجەر) ناچاربوو دەست لە کار بکێشێتەوە، ئەگەر بەپێچەوانەشەوە بوایە و (جۆن مێجەر) بینووسیایە و (ئەدوین) سەرۆک وەزیران بوایە، بە هەمان شێوە دەبوایە دەستی لە کار بکێشایەتەوە، بەڵام لێ گەڕا و دۆخێکی ئارامی سیاسی بەریتانیای بە هەلزانی بۆ ئەوەی ئەو بابەتە سەر لە نوێ بووروژێنێتەوە، ئێستا بۆتە چەقی ژیانی سیاسی.

ئەگەر بە هۆی ئەو ئابڕووچوونەوە (جۆن میجەر) دەستی لە کار بکێشایەتەوە و (هێزلتاین)ی ڕکابەری بۆ سەرۆکایەتی پارتی پارێزگاران، ببوایەتە سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا، بەریتانیا دەچوە پاڵ یەکێتی و لە ئەمریکا دوور دەکەوتەوە و هێرشی نەدەکردە سەر عێراق.

بە کورتی و بەپووختی، مێژووی ئەورووپا بە تەواوی دەگۆڕا، ئینگلیزەکان سەر لە نوێ پێداچوونەوەیان بە مێژووی (مێجەر)دا کرد، کە لە سەر دۆسییەی پێوەندی سێکسی و وەرگرتنی بەرتیل و گەندەڵیی، وەزیرەکانی دوور دەخستەوە و ببوە نموونەیەکی باڵای ئاکار لەو وڵاتە، هەر لەبەر ئەوەش کاتێک سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا بوو، سووربوو لە سەر خوێندنەوەی چاپی یەکەمی هەموو ڕۆژنامەکانی بەریتانیا، لە ترسی بڵاو بوونەوەی چیرۆکە سۆزداری و سێکسییەکانی خۆی.

هۆکاری سەرەکی دژایەتی و ڕکەبەرایەتی ئەو دوو خۆشەویستە، کاتێک دەستی پێکرد کە (جۆن مێجەر) بوە سەرۆک وەزیران و پێشنیاری کرد (ئەدوین) ببێتە وەزیری کاروباری زیندانییەکان لە بەریتانیا، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە چونکە خۆی بۆ پۆستێکی وەزاری گەورەتر و کاریگەرتر ئامادە کردبوو.

بڵاو کردنەوەی ئەو بیرەوەرییانە لە کاتێکدا بوو، ئەستێرەی توانا و چانسی (تۆنی بلێر)ی سەرۆکی پارتی کرێکارانی بەریتانیا ڕووی لە کزی بوو، لە بەرانبەریشدا ئەستێرەی پارتی پارێزگارانی بەریتانیا ڕووی لە گەشانەوە بوو، دوای چەند ئابڕووچوونێکی سەرکردەکانی پارتی پارێزگاران، کە بوونە ڕێگر لە بەردەم گەڕانەوەی پارتی پارێزگاران بۆ سەر دەسەڵات، بۆیە دەتوانین بڵێین بڵاو کردنەوەی ئەو بیرەوەرییانە لەو کاتەدا، بە تەنها لە چانس و بەرژەوەندی (تۆنی بلێر)دا بوو.

دوای بڵاوبوونەوەی ئەو بیروەرییانە و ئاشکرابوونی ئابڕووچوونە سێکسییەکانی، (جۆن مێجەر) بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی بەرگریی لە خۆی بکات، هێندە نەبێت لە بەردەم (نۆرما)ی هاوسەریدا، دانی بە دیوە ڕاستەقینەکانی ئەو پێوەندییەدا ناو ئەویش لێی خۆشبوو.

سەرلەبەیانی ڕۆژی (6)ی ئۆگەستی ساڵی (2008)، میدیاکانی جیهان بڵاویان کردەوە «تچوا سوی لک- وەزیری تەندروستی مالیزیا دەستی لە کار کێشایەوە، ئەوەش یەک ڕۆژ دوای ددان پێدانانی بەوەی ئەو کەسەی لە دیمەنە سێکسییەکەی سەر تۆڕەکانی ئینتەرنێت دەردەکەوێت، ڕاشی گەیاند ئەو ژنەشی لە هەمان دیمەنی سێکسیدا دەردەکەوێت هاوڕێیەتی».

لە بارەی سەرچاوەی تۆمارکردن و بڵاو کردنەوەی ئەو دیمەنە ڤیدیۆییەوە، (تچوا) گوتی «دوژمن و نەیارە سیاسییەکانم ئەو دیمەنەیان تۆمار کردوە و بڵاویان کردۆتەوە، بەڵام لە ئێستادا ئەو بابەتە هیچ گرینگی و بایەخێکی نەماوە».

هەمان وەزیری مالیزیا، ماوەیەک پێشتر ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی زۆر بۆوە، کاتێک داوای کرد بە بێ بەرانبەر (کۆندۆم) بە سەر گەنجاندا دابەش بکرێت، بۆ ئەوەی دووربن لە توشبوون بە هەر جۆرە نەخۆشییەکی سێکسیی.

کاتێک لە بەهاری ساڵی (2003)دا کۆشک و دەسەلاتی سەدام حسێن و ڕژێمە ئاسنینەکەی، لە لایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە بە سەرۆکایەتی (USA) ڕووخێندراو لە ناوبرا، هاوکات دوان لە کوڕەکانیشی کوژران، لە کاتێکدا ئەندامانی تری خێزانەکەی بە وڵاتانی عەرەبیدا پەرش و بڵاو بوونەوە.

سەدام حسێن، ماوەیەکی زۆر لە نێوان دەستگیرکردن و لە سێدارەدانیدا نەبوو، تەنانەت لەو ماوەیەشدا کە زیندانی کرابوو، هەمیشە تەئکیدی لە سەر گرینگی ژیانی خێزانیی دەکردەوە، لە هەمان کاتیشدا زۆر بە توندی سوور بوو لە سەر ئەوەی ژیانی تایبەتی خۆی دەبێت بە نهێنی و بە نادیاری بمێنێتەوە.

سەدام حسێن، ئەگەرچی سێ جار هاوسەرگیری کردوە، بەڵام هیچ کات لە (ساجیدە)ی هاوسەری یەکەمی جیا نەبۆتەوە، کە کچی (خەیروڵا تولفاح)ی خاڵی بوو، ئەو خاڵەی، سەدام و دایکە بێوەژنەکەی لە خۆ گرت و بە خێویکردن، دوای ئەوەی مێردەکەی گیانی لە دەست داو مرد.

سەدام و ساجیدە، خاوەنی پێنج منداڵبوون، دوو کوڕەکەی ناویان (عودەی و قوسەی) بوو کە لە یۆلیۆی (2003)دا لە لایەن هێزەکانی (USA)ەوە کوژران، سێ کچیشیان هەبوو بە ناوەکانی (ڕەغد، ڕەنا، حەلا)، ئەم پێنج منداڵە، بە ڕەسمی ناوی سەدام حسێن وەک باوک لە سەر ناسنامەکەیان نووسراوە.

سەدام حسێن، کەوتە داوی عیشق و خۆشەویستی (سەمیرە شا بەندەر)ەوە، بەو هۆیەشەوە (نورەدین سافی) هاوسەری بە جێ هێشت کە بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیای هێڵی ئاسمانی عیراقی بوو، (سەمیرە و نورەدین) کوڕێکییان هەبوو کە ئێستا لە ئوسترالیا دەژی.

سێیەم کوڕی (سەدام حسێن) بە ناوی (عەلی) لە (سەمیرە)یە و لە ساڵی (1982) لە دایک بوە، بەڵام بڵاو کردنەوەی ئەو زانیارییە قەدەغەبوو، تەنانەت ئەو ڕۆژنامەنووسەشی لە وتارێکیدا ئاماژەی بەو بابەتەکرد، لە لایەن هێزەکانی سەر بە ڕژێمی سەدامەوە، ڕووبەڕووی هەڕەشەی کوشتن بۆوە.

دوای داگیرکردنی عێراق لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاوە (عەلی) تەمەن (22) ساڵ و دایکی، بەرەو لووبنان هەڵاتن و پێشبینی دەکرێت ئێستا لە کەنەدا نیشتەجێ بن.

ساڵی (1990)، (سەدام حسێن) هاوسەرگیری لەگەڵ (نیزاڵ حەمدانی)دا کرد، کە یەکێک بوو لە لێپرسراو و کاربەدەستەکانی وەزارەتی پیشەسازیی عیراق.

هەروەها دواتر و لە ساڵی (2001)دا، (سەدام حسێن) هاوسەرگیری لەگەڵ (ئیمان هوەید)دا کرد، کە فەرمانبەرێکی ئاسایی بوو.کاتێک (سەدام حسێن) بە تەواوی دڵنیابۆوە لە وەی لە لایەن هاوپەیمانانەوە هێرش دەکرێتە سەر عیراق و ئەو کارە پەشیمانبوونەوەی تێدا نییە، فەرمانی بە ئەندامانی خێزانەکەی کرد بچنە دەرەوەی وڵات و پارەیەکی زۆریشی پێدان، بۆ دەستپێکردنی ژیانێکی نوێ.

لەو چوارچێوەیەشدا و دوای کوشتنی (عودەی و قوسەی)ی کوڕی، (ساجیدە)ی هاوسەری (سەدام) و هەر سێ کچەکەی و (11) نەوەی، بە پەلە عێراقییان بە جێ هێشت و ڕوویان لە ئوردوون کرد.

جێی باسە، حکوومەتی ئوردن، لە ئۆگەستی ساڵی (1995)دا، مافی مانەوەی بەخشییە (ڕەغد) و (ڕەنا)ی هەر دوو کچەکەی سەدام، لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا (حسێن کامیل) و (سەدام کامل)

که برابوون، لەگەڵ چەند کەسێکی تری خانەوادەکەیاندا، کە دوای دەرکردنی (حسێن کامل) لە پۆستی وەزیری پیشەسازی عیراق لە لایەن سەدامەوە، هەڵاتن و ڕوویان لە عێراق کرد.

ئەو هەڵاتنەی (ڕەغد و ڕەنا) و خێزانەکانیان، یەکەم جار بوو لە ناو خێزانەکەی سەدام دا ڕوو بدات، چونکە لەو ڕووەوە زۆر بەهێز بوو، یەکێک لە ئەندامانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی باسی لەوەکردوە، ڕاکردن زۆر  باشترە لەوەی هەوڵی ڕووخاندنی ڕژێمەکەی بدەیت، (سەدام حسێن) بەڵێنیدا لە (سەدام کامیل و حسێن کامیل) خۆشبێت، ئەگەر لەگەڵ خێزانەکانیاندا بگەڕێنەوە بۆ عیراق، بەڵام لە شووباتی (1996) و چەند ڕۆژێک دوای گەڕانەوەیان بۆ عیراق، هەردوو براکەی کوشت، (جەمال کامیل حەسەن)، کە تەنها ڕزگار بووی دەستی تورەییەکانی سەدام بوو یارمەتی، هەر دوو براژنە بێوەژنەکەی و منداڵەکانیانیدا تا بە تەواوی لە ئوردوون جێگیر و نیشتەجێ بن.

لەو بارەیەوە (جەمال کامیل حەسەن) بە ڕۆژنامەیەکی فەرەنسی ڕاگەیاندوە «ئوردوون گڵۆپی سەوزی لە لایەن ئەمریکاوە بۆ هەڵکرا، بەوەی ناڕازی نییە لە نیشتەجێبوون و مانەوەی کچەکانی سەدام حسێن لە شانشینی ئوردوون، بەو مەرجەی دەستیان نەبێت لە هیچ یەکێک لەو تاوانانەی باوکیان ئەنجامی دا بوو».سەرەڕای ئەوەی دەستوپێوەند و ڕژێمەکەی باوکی هاوسەرەکانیان کوشتن، بەڵام هیچ کات (ڕەغد و ڕەنا)، بە شێوەیەکی ئاشکرا ڕەخنەیان لە سەدام حسێن نەدەگرت، تەنانەت دوای دەستگیرکردنی (سەدام حسێن)یش لە دیسەمبەری ساڵی (2003) لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاوە، (ڕەنا) کە بە (سەدامی بچووک) ناسراوە، ڕیزی بەرگریکارانی باوکی ڕێکخستەوە.

هەر یەک لە (ساجیدە) و (حەلا)ی کچی سێیەمی، کە (جەمال مستەفا)ی هاوسەری لە لایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەستگیرکراوە، بڕیاریاندا لە (قەتەر) بمێننەوە و (ڕەغد) و (ڕەنا)ش بە بەردەوامی سەردانیان دەکەن.

(ڕەغد)ی (36) ساڵ و (ڕەنا)ی (34) ساڵ، لە شاری عەمانی پایتەختی ئوردوون، خانوویان کرێ و ژیانێکی ئاسایی دوور لە چاوی کامێراکان دەژین و منداڵەکانیشیان لە خوێندنگەکانی ئەو شارە دەخوێنن، بەڵام حکوومەتی ئوردوون، ڕێگەیان پێ نادات بەشداری هیچ کار و چالاکی سیاسی بکەن.

(ڕەغد) سێ کوڕ و دوو کچی هەیە، کوڕەکانی ناویان (عەلی، سەدام، وەهج)ە، کچەکانیشی (حەریر، بەنان)، بەڵام (ڕەنا) سێ کوڕ و کچێکی هەیە (ئەحمەد، سەعد، حسێن، نەبعە).

ئەوە تەنها لایەنی دیار و ئاشکرای ژیانی خێزانی سەدامە، بەڵام لایەنە شاراوەکەی، زنجیرەیەکی درێژە لە لادان و چێژ و حەزی سێکسی.سەدام حسێن، حەزی دەکرد ئەو کاتەی دەچوە (زانکۆ، سەنتەری توێژینەوە، کۆمپانیا، دەستەی کارگێڕییە ناوەندی و لاوەکیی)ییەکان، خۆی ئەو کچانە هەڵبژێرێت کە دەبوونە دۆستی و سێکسی لەگەڵ دەکردن، بانگهێشتی نووسینگەکەی دەکردن، هەروەها ستایشی جووڵە و چالاکییە جۆراوجۆرەکانی دەکردن و پێگە و دەسەڵات و پۆستی گرینگی لە وەزارەت و دامەزراوە ئیدارییەکانی حکوومەتی عێراقی دا پێ دەبەخشین. ئەگەرچی ژمارەی دۆست و پێوەندییە سێکسییەکانی (سەدام حسێن) کەم نەبوو، بەڵام وەک هەندێک لە پاسەوانە تایبەتییەکانی باسیان کردوە، مانگانە و لە ڕۆژ و کاتێکی دیاری کراودا بانگی دەکردن و ژوانی لەگەڵ دەبەستن، پێوەندی لەگەڵ زۆرینەیاندا باش و نەرم

و نیان بوو، هەندێک لە پێوەندییەکان ماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبوو، هەندێکیشیان کەمتر، گەرموگوڕ و جدی بوو لە سەر ئەوەی هاوکاریی زۆریان بکات و گرینگی و بایەخیان پێ بدات.

هەندێک لەو کچ و ژنانەی لەگەڵ (سەدام حسێن)دا پێوەندییان هەبوو، سەردانی کلینیکە پزیشکییە تایبەتەکانیان دەکرد بۆ بچووککردنەوەی لووت و ئەنجام دانی نەشتەرگەری تری جوانکاریی، هەر چەندە (سەدام) حەزی نەدەکرد لای پزیشکەکان کارئاسانییان بۆ بکات، بەڵام بە هۆی پێداگری و داواکاریی زۆری هەندێکییانەوە، لە کۆتاییدا ڕازی دەبوو هاوکارییان بکات.

دەبوایە هەمیشە ئەو کچ و ژنانە، ئاگایان لە هەڵس و کەوت و شێوازی مامەڵەکردن و چۆنیەتی قسەکردنیان بوایە، وەک دەگێڕنەوە شەوێکی درەنگ سەدام حسێن یەکێک لە دۆستەکانی کردە دەرەوە و پرشەق و لێدانی کرد و پێی گوت جارێکی تر نایەوێت ڕوخساری ببینێتەوە، چونکە پێی گوتبوو چونی سوپای عیراق بۆ ناو کوەیت، وەیشومە و خراپەی بۆ عیراق و عیراقییەکان هێنا، ڕۆژی دواتریش لە ڕێگەی نووسینگە تایبەتەکەیەوە پارەیەکی زۆری بۆ نارد بۆ ئەوەی ژیانی داهاتووی خۆی پێ مسۆگەر بکات.

زۆرینەی ئەو ژنانەی (سەدام حسێن) مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و بە شێوەیەکی ڕێکخراو پێوەندی هەبوو لەگەڵیاندا، دۆست و خۆشەویستی نەبوون، بەڵکوو وەک سەرچاوەی زانیاری و بڵاو کردنەوەی دوودڵی بە کاری دەهێنان، داوای لە هەندێکییان دەکرد خۆیان لە بەڕێوەبەرەکانیان نزیک بکەنەوە، چونکە دەیزانی هەندێک لە وەزیر و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و ئەفسەرە گەورە و لێپرسراوە باڵاکانی نێو حیزب، تینووی خۆشەویستی و سێکس

بوون، لەبەر ئەوە پۆست و پێگە و دەسەڵاتەکانیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بە کار دەهێنا، پارەیەکی زۆریان دەبەخشییە ژنان بۆ ئەوەی چەند سەعاتێکی کەم لەگەڵیاندا بن و هەستوسۆزێکی کاتی بگۆڕنەوە و سێکسییان لەگەڵ بکەن، بەڵام کاتێک لە ڕێگەی (تۆڕی ژنانی سەدام) ئەو زانیارییە نهێنییانە دەگەیشتە خودی (سەدام حسێن)، ئەوا ڕووبەڕووی بڕیارێکی سەیر و چاوەڕوان نەکراو دەبوونەوە، ئیتر یان لە کار دەبەخشران، یان دەستگیر دەکران، یاخود لە سێدارە دەدران.

دۆخەکە زۆر کارەساتاوی و ترسناک دەبوو ئەگەر یەکێک لەو لێپرسراوانەی عیراق، بە بێ مەبەست یەکێک لە دۆستەکانی (سەدام حسێن)یان بێزار بکردایە، بۆ نموونە (مازن ئالوسی)، کە ساڵانێکی دورودرێژ ئەندازیار و دیزاینەری ئاوەدانی و نایابی سەرۆکی عیراق بوو، خوێندنی ئەندازیاریی ئاوەدانی لە ئەمریکا تەواو کردبوو، سەرپەرشتیاری دروستکردنی زۆرێک لە کۆشک و خانوو و مزگەوت و گوندە سیاسییەکانی خاوەن سەرمایەکانی بەغداد و عیراق بوە و هەر خۆشی دیزاین و نەخشەی ئەو بینایانەشی دەکێشا.

پرۆژەکانی لە کاتی دیاریکراو و بە بوودجەیەکی کەم تەواو دەکرد، لە لایەن سەدامەوە زۆرترین ڕێزلێنان و باڵاترین میدالیای ڕێزلێنانی لە سەر ئاستی عیراق پێ بەخشرا، بەڵام لە کۆتاییدا هەم لێی توڕەبوو هەم لە سەر کارەکەشی دەریکرد و دووری خستەوە، لەبەر ئەوەی (سەدام) لە شوێنی یەکێک لە پرۆژەکانی کارکردندا، چاوی کەوت بە کچێکی گەنج و جوان کە ئەندازیاری ئاوەدانی بوو، (سەدام) ویستی بیکاتە بەشێک لە تۆڕی دۆست و خۆشەویستەکانی خۆی و داواشی لە (ئالوسی)

کرد لە نووسینگەکەی خۆی دایبمەزرێنێت، کاتێک دامـەزرا، بەیانیان درەنگ دەچوە سەر کارەکەی و پێش کۆتایی هاتنی دەوامەکەشی، شوێنەکەی بە جێ دەهێشت، لە کاتێکدا هاوڕێ و هاوکارەکانی بەوپەڕی توانایانەوە کاریان دەکرد بۆ ئەوەی پرۆژە و کارەکانیان لە کاتی دیاریکراودا و بەپێی گرێبەستەکان کۆتایی بێت، بۆیە (ئالوسی) هەڕەشەی لەو کچە ئەندازیارەکرد ئەگەر بەو شێوەیە کاربکات و دەوام بکات، ئەوا لە سەر کارەکەی دەری دەکات، بەمەش (ئالوسی) بە دەستی خۆی کۆتایی بە پیشە و ئەرک و وەزیفییەکەی هێنا، وەک سەرۆکی نووسینگەیەکی ئەندازیاریی کە کاری بۆ سەرۆک کۆماری عیراق دەکرد، سەرەتا (سەدام حسێن)، (ئالوسی) بانگ کرد و داوای لێ کرد ئەو فەرمانی ئاگادارکردنەوەیە بکشێنێتەوە کە بۆ ئەو کچەی دەرکردبوو، (سەدام) هەر بە مەوە نەوەستا، بەڵکوو پلەی وەزیفی (ئالوسی) دابەزاندوو دواتریش ڕاژەکەی گواستەوە بۆ نووسینگەی ئەمینداریێتی شاری بەغداد.

ئەو کچە ئەندازیارەی دڵی (سەدام)ی بۆ خۆی بردبوو، لە سییەکانی تەمەنیدابوو، هەر چەندە زۆر جوان نەبوو، بەڵام زۆرینەی پیاوەکان پێیان وابوو ژنێکی سەرنج ڕاکێشە.

بە ڕەسمی (سەدام حسێن) تەنها یەک ژنی هەبوو ئەویش (ساجیدە)ی خاڵۆزای بوو، کە لە ساڵی (1958) لە قاهیرە هاوسەرگیری لەگەڵ کرد، کاتێک بە هۆی شکستهێنانی هەوڵی کوشتنی (عەبدولکەریم قاسم)ەوە، ڕای کرد بۆ سووریا و دواتریش لە قاهیرە نیشتەجێ بووبوو.

سەرەڕای ئەو دەنگۆیانەی باسیان لەوەدەکرد کە (سەدام) هاوسەرگیری لەگەڵ (سەمیرە شابەندەر)دا کردوە، بەڵام بە هیچ

شێوەیەک ئەو بابەتەی لەگەڵ (ساجیدە)ی هاوسەری یەکەمیدا نەکردەوە، ئەگەرچی ئەو بابەتە ڕاست بوو، بەڵام هیچ کەسێک لە نێو خێزانەکەیدا بۆی نەبوو باس لە بابەتێکی لەو شێوەیە بکات.

لە مانگی یۆلیۆی ساڵی (2007)دا، (بارسۆلا لامبسۆس)ی بە ڕەگەز یۆنانی، لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ یەکێک لە کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکانی ئەمریکا، چەند بابەتێکی زۆر گرینگ و هەستیاری وروژاند، کە پێوەندییان بە لایەنە شارەوا و تایبەتەکانی ژیانی تایبەتی (سەدام حسێن)ەوە هەبوو، لەو چاوپێکەوتنەیدا لە بەرنامەی (برایم تم سێرسدەی) تەلەڤزیۆنی ئەمریکی، (لامبسۆس بێرسۆلا) بۆمبێکی تری تەقاندەوە و ئەوەی ئاشکراکرد بۆ ماوەی (30) ساڵ دۆست و خۆشەویستی (سەدام حسێن) بوە و پێوەندی سێکسی لەگەڵیدا هەبوە، (لامبسۆس بێرسۆلا)ی تەمەن (54) ساڵ، بە هاوکاری کۆنگرەی نیشتمانی عیراقی کە بەرهەڵستکار و ئۆپۆزسیۆنی ڕژێمەکەی سەدام بوو، توانی لە عێراق هەڵبێت و ئێستا لە شاری بەیروتی پایتەختی لووبنان نیشتەجێیە.

شەش مانگ دوای مردنی سەدام، (بارسیۆلا لامبسۆس)، باسی لەوەدەکرد یەکێک بوە لە دۆست و خۆشەویستەکانی (سەدام حسێن) و زۆریش لێی نزیک بوە و چەندین ساتی پڕلەچێژ و گەرموگوڕیان پێکەوە بە سەربردوە، لە یەکێک لە کۆشکە نهێنیی و نەناسراوەکانیدا ژیاوە و هاوبەشی خەم و ترس و خەونەکانی بوە.

وەک دەزانرا، سەدام چێژی زۆری لە بینینی دیمەنی کوشتن و ئازاردان دەبینی، بە جۆرێک ئەو دیمەنانەی لە سەر کاسێتی ڤیدیۆ تۆماردەکرد و چەند جارێک سەیری دەکردنەوە، بەم جۆرە (باراسۆلا)، بیرەوەری و بەشێک لە مێژووی عێراق بە گشتی و مێژووی پێوەندییەکانی خۆی و سەرۆکی عیراق دەگێڕێتەوە.

باسی لەوەشکردوە، سەدام هەندێک جار حەبی (ڤیاگرا)ی بە کار دەهێنا، لەگەڵ ژەمی بەیانیدا شیر و هەنگوینی دەخوارد، بەڵام خواردنە نایابەکەی گۆشتی تازەی ئاسک بوو، ویسکی و پارچەسەهۆڵیش، نایابترین خواردنەوەی کحولی بوو بە لایەوە، هەمیشە بە ئاگا و وریابوو، دۆخەکانیشی کۆنترۆڵ کردبوو.

(باراسۆلا) گوتیشی «بۆ یەکەم جار لەساڵی (1967)دا سەدامم بینی کە تەمەنم تەنها (19) ساڵ بوو، گەنج بووم و زۆر دڵخۆش بووم، لەگەڵ باوکمدا چووینە بەغداد و لەوێ نیشتەجێ بووین، ئەو کاتە تەمەنی سەدام حسێن (30) ساڵ بوو و هاوسەرگیریشی کردبوو، (سەدام) توانی هەستوسۆزم داگیر بکات و هەر لە یەکەم ساتەوە کەوتمە داوی خۆشەویستییەوە لەگەڵیدا، هەر چەندە من هاوسەرگیریشم کردبوو، بەڵام پێوەندییەکی سۆزداری و سێکسیم هەبوو لەگەڵیدا کە چەند ساڵێکی زۆر بەردەوام بوو».

هەروەها دەشڵێت «سەدام حسێن، کەسێکی لە سەرخۆ و وریابوو لە دەربڕینی هەستەکانیدا بەرانبەر بە من، ئەو کاتە کەسێکی تر بوو، لە ڕاستیدا بە درێژایی چەند ساڵێک، یەکێک بووم لەو (کۆمەڵە)ی سەدام پێوەندی لەگەڵیاندا هەبوو، کە پێکهاتبوون لە سێ هاوسەر و 5 دۆست و خۆشەویستی تر، بەڵام من دۆست و خۆشەویستە نایابەکەی بووم و پێوەندییەکەمان بە نهێنی نەبوو».

لە کۆتایی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، سەدام حسێن لە ڕێگەی کودەتایەکی خوێناوییەوە، دەسەڵاتی گرتە دەست، (بارسێولا) دەڵێت «ئەوە یەکەم جار بوو لایەنە دڕندەییەکەی سەدام ببینم».لەو ماوەیەشدا، هاوسەرەکەی (بارسێۆلا)ی ناچارکرد عیراق بە جێ بهێڵێت و ڕایگەیاند کە بێوەژنە، بەو

بیانوەی لە ئێستادا مێردەکەی چارەنووسی نادیارە. لەو بارەیەوە (بارسیۆلا) باسی لەوەکردوە «کاتێک مامەڵە و نووسراوەکانی جیا بوونەوەی دامێ، دەستم کرد بە گریان»، دوای ئەوە بە دەستەکانی ئاماژەیەکی بۆ کردم، کە پێکەوە بڕۆین، پرسیاری ئەو شوێنەم لێ کرد کە بڕیاربوو بۆی بڕۆین، پێی گوتم دەچین بۆ باخە تایبەتییەکەی خۆی و پێشی گوتم «ئەم جارە تۆ میواندارییم بکە».

لە بارەی ئەو (14) ساڵەی تری ژیانییەوە، (بارسێولا) گوتی «ژیانم وەک زیندانییەکی گرانبەها و شایستە وابوو»، باسی لەوەشکردوە سەدام خاوەنی (50) کۆشک بوو، هەر یەکێک لەو کۆشکانەش ژێر زەمین و شوێنی نهێنی بۆ خۆپاراستن و خۆحەشاردان تێدابوو لە ئەگەری هێرش و پەلامارێکدا.

(بارسێولا) باسی لەوەشکردوە لە یەکێک لە ڤێلا تایبەتییەکانی نێو یەکێک لە کۆشکەکانی سەدام لە بەغداد ژیاوە، هەر لایەک لە لاکانی یەکێک لە ژوورە تایبەتییەکانی سەدام، بە جۆرێک دیزاین کراوە و کەلوپەلی بۆ دانراوە، کە گوزارشت بێت لە کیشوەرە جیا جیاکانی جیهان، بۆ نموونە شێوازی ڕۆژهەڵاتی و شێوازی هیندی، (بارسێولا)، ژیانی خۆی لە نێو کۆشکەکانی سەدام دا، بە (ژیانێکی باڵا بەرز) وێنا دەکرد، ئاماژەی بەوەشکردوە کە پێوەندییەکی هاوڕێیەتی لەگەڵ ژنەکانی سەدام دا هەبوو، لە کاتێکدا دەیانزانی پێوەندییم لەگەڵ سەدام دا هەیە و لە سەر ئەو بابەتە ڕاهاتبوون.

هەروەک پێشووتر باسی کردبوو، سەدام حسێن چێژێکی زۆری دەبینی لەوەی سەیری دیمەنی ئازاردان و کوشتن بکات، بەو ڕادەیەی ئەو دیمەنانەی لە سەر کاسێتی ڤیدیۆ تۆمار دەکرد و

چەند جارێک سەیری دەکردنەوە، (بارسێولا) گوتیشی «زۆرینەی کات بە دەم کێشانی جگەرە و خواردنەوەی عارەقەوە، سەیری ئەو دیمەنانەی دەکرد و کڵاوێکی کاوبۆیشی لە سەر دەکرد».

کاتێکیش عیراق لە جەنگی کوەیت دا شکستی خـوارد و سوپاکەی لەو وڵاتە دەرکرا، سەدام توشی شۆکێکی گەورە بوو، لەو بارەیەوە (بارسێولا) دەڵێت «سـەدام بە هۆی دەرکردنی سوپاکەیەوە لە کوەیت هێندە گریا، چاوەکانی تـەواو سوور بووبوون، ئەو ڕۆژەی سوپاکەی دەرکرا پێی گوتم، لە دەستم دا، منیش لێم پرسی چیت لە دەست دا؟ لە وەڵام دا پێی گوتم، کوەیتم دۆڕاند، پاشان فرمێسک لە چاوەکانییەوە هاتنە خوارەوە، هەروەها پێشی گوتم، کوەیتیان لە من سەند، بەڵام جارێکی تر بە دەستی دەهێنمەوە، ئەمریکا کێیە؟ خۆیان بە چی دەزانن؟ من سەدام حسێنم!!».

(باراسێولا) لە بەشێکی تری قسەکانیدا دەڵێت «دوودڵـی و بێ متمانەییەکی زۆر توشی سەدام حسێن بووبوو، بە جۆرێک هەمیشە وای هەست دەکـرد نەخۆش و ناساغە، زۆریـش لە توشبوون بە ڤایرۆس و بەکتریا کوشندەکان دەترسا، بە جۆرێک هیچ ڕێگەی نەدەدا ئەو کەسانەی سەردانیان دەکرد، ڕوومەت و دەموچاوی ماچ بکەن، بەڵکوو وەک خوی پێوەگرتبوو دەبوایە شانیان ماچ بکردایە.

لە ڕاستیدا سەدام حسێن گیرۆدەی چەند نەخۆشییەک بوو، جارێکییان بە قورسی توشی نەخۆشی دڵ بـوو، لە کوباوە پزیشکی تایبەتی بۆ بانگکرا، تا چارەسەری بکەن و لە ڕووی پزیشکییەوە چاودێری بکەن و خۆم ئەو تیمە پزیکشییە کوبییەم بینی، سەدام حسێن هەموو بەیانییەک مەلەی دەکرد و لەگەڵ

ژەمی نانخواردنی بەیانیدا شیر و هەنگوینی دەخوارد، بەڵام وەک پێشووتریش باسمان کرد خواردنی نایابی سەدام حسێن گۆشتی تازەی ئاسک بوو، خۆی ئاسکی بەخێو دەکرد و وەک ئاژەڵێکی نازدار وەسفی دەکردن، هەر خۆشی ئاسکێکی دەستنیشان دەکرد بۆ ئەوەی سەرببڕدرێت و بیکەنە ژەمەخۆراکێکی نایاب بۆی».

(باراسێولا) باسی لەوەشکردوە «سەدام حسێن بایەخێکی زۆری بە ڕوخساری خۆی دەدا، تەنانەت ماسکی تایبەتی بە کار دەهێنا بۆ پشوودانی پێست و لابردنی ئەو پەڵانەی لە سەر ڕوخساریی هەبوون، هەروەک بە بەردەوامیش قژی بۆیاخ دەکرد، دەیویست ئەو پۆشاکانە بپۆشێت دیزاین و دووریتی ناوازە و نایابیان هەیە، وەک دیزاینەکانی دیزاینەری بە ناوبانگ (بیار کاردان)، هەر کاتێکیش بێزار و توڕەبوایە ئەوا بە پۆشینی پۆشاک و جلوبەرگەکەیدا دەردەکەوت، بەوەی لە کاتی توڕەیی و بێزاریدا، پۆشاکە سەربازییەکانی لەبەر دەکرد».

بەپێی قسە و گێڕانەوەکانی (باراسێولا)، سەدام حسێن خۆی بە نەوەی پێغەمبەری ئیسلام دەزانی و نوێژی دەکرد و هەفتەی دوو ڕۆژیش بە ڕۆژوو دەبوو، بەڵام ئامانە هەمووی تەنها نمایش بوون و هیچییان ڕاستی نەبوون، چونکە لە بنەڕەتدا سەدام باوەڕی نە بە خوا هەبوو نە بە ئیسلام، بەڵکوو تەنها باوەڕی بە خۆی هەبوو، شێتی گەورەیی و دەسەڵات بوو، بە هەمان ئەو ڕادە و شێوەیەی (هیتلەر) شێتی بووبوو.

(بارسێولا) دەڵێت، هیچ کەسێک، تەنانەت بە ئەندامانی خێزانەکەشییەوە، شوێنی مانەوەی سەدامیان نەدەزانی، جگە لە دوو پاسەوانە تایبەتەکەی کە زۆر لێیەوە نزیک بوون، هەروەک چۆن لەگەڵ نەیار و ڕکابەرەکانیدا توندوتیژ بوو، بە هەمان

شێوەش لەگەڵ (عودەی) کوڕە گەورەیدا توندوتیژ بوو، چەندین شێوازی خەیاڵی لە بەرانبەردا گرتەبەر، بەو بیانوەی دەیەوێت بگاتە ترۆپکی دەسەڵات و شوێنی باوکی بگرێتەوە.

(بارسێولا) باسی لەوەشکردوە هەمیشە (عودەی) کێشە و ئاژاوەی دروست دەکرد و بە ڕاستیش کێشەکانی گەورە بوون، (عودەی) لە باوکی دڕەندەتر و ترسناکتر بوو، دەستدرێژی کردە سەر دەیان ژن و کچ، لە کاتی تووڕەبوونیدا نزیکترین ڕاوێژکاری باوکی کوشت، (سەدام) چەند جارێک بەڵێنیدا سوێندی خوارد کە (عودەی) کوڕی بکوژێت، دوای ئەوەی هەستی کرد چەند ترسناک و توندوتیژە و ئەگەری ئەوەی هەیە لە ژێر کۆنترۆڵدا نەمێنێت و بە تەواوی یاخی ببێت، بەیانییەک سەدام گوتی «ڕۆژێک عودەی دەکوژم، ئەوەی دەیڵێم بە ڕاستیمە و مەبەستمە، ڕۆژێک هەر دەیکوژم».

ڕۆژێکیش (باراسێولا) بە سەدامی گوتوە «بۆچی دەستبەسەرم دەکەی؟ بۆچی ئازادم ناکەیت؟ هیچی ترم نەماوە پێشکەشتی بکەم، دەتوانیت ژنێکی تر بۆخۆت بە دەست بهێنیت، چیتر پێویستت بە من نییە؟»، سەدام سەیرێکی کردوە و لە وەڵامدا پێی گوتوە «تۆ موڵکی منیت، تا ئەو کاتەی دەمرم، دەبێت تۆ لە بەغداد بمێنیتەوە».

هەر وەک چۆن (سەدام حسێن) کەسێکی تووڕە و هەڵەشە و توندوتیژ بوو، هەر دوو کوڕەکەشی (عودەی) و (قوسەی)ش بە هەمان شێوەبوون، بە تایبەتی (عودەی) کە کوڕە گەورەی سەدام بوو.

(عودەی) لە بەردەم فرۆشگای (رواد) لە سەر شەقامی مەنسور لە شاری بەغداد دەوەستا و کچانی ڕاو دەکرد، (رواد) بەوە

ناسرابوو که ساردەمەنی بەتام و نایاب پێشکەش دەکات و کچی زۆر جوانیش ڕووی تێ دەکرد، ئەو دووکانە کەوتبوە ناوچەیەکی زۆر بەرچاوەوە لە نێوان هەر دوو شەقامی بە ناوبانگی (ئەبو جەعفەر مەنسور) و (مەنسور)ن ئێواران و شەوانێکی درەنگ، بەردەم ئەو ساردەمەنییە پڕدەبوو لە کوڕە گەنجەکانی خێزانە دیار و دەوڵەمەند و خێزانە گەورەکانی شاری بەغدا، هەروەها ئەو کچە جوانانەشی لە خێزانە مۆدێرنەکان بوون و دەچوونە ئەو ساردەمەنییە و کاتیان بە سەر دەبرد و کوڕەکانیش وەک هەنگی سەر هەنگوین دەوروکانە ئەو کچانە.

هەموو کات بە ئۆتۆمبیلە مارسیدسەکەی، یان ئۆتۆمبیلەکانی تری بەو شەقامەدا پیاسەی دەکرد و دەسوڕایەوە و میوانی ئاهەنگەکانی شەوانەی پەیدا دەکرد، ئەگەر کچێکی جوانی بەرچاو بکەوتبا و حەزی پێی بوایە، بە یەکێک لە پاسەوانەکانیدا کارتێکی بۆ دەنارد کە ژمارەی تەلەفۆنەکانی لە سەربوون، بۆ ئەوەی ئەگەر ویستی پێوەندی پێوە بکات و قسەی لەگەڵ بکات، لە ڕاستیشدا زۆرینەی کچەکانیش تەلەفۆنیان بۆ دەکرد و پێوەندییان لەگەڵ دەبەست، هەندێکیان بە هۆی پێویستییان بوو بەپارە، هەندێکیشیان بۆ ئەوەبوو کار و وەزیفەیەکییان دەست بکەوێت، بەشێکی تری ئەو کچانەشی شوێن حەز و ئارەزووەکانی (عودەی) دەکەوتن بۆ ئەوەبوو لە ڕێگەی (عودەی)یەوە سۆراخی براو باوک و کەسوکارە بێ شوێنەکانیان بکەن، کە لە لایەن دامەزراوە ئەمنییەکانی ڕژێمی سەدامەوە دەستگیرکرابوون، بەڵام هەندێکیشیان حەزیان بەوەبوو لە ژیانێکی شاهانە و دەوڵەمەندانەدا بژین، بۆ ئەوەش پێوەندییەکەیان لەگەڵ (عودەی) بە ڕێگەیەکی ئاسان دەبینی.

بەڵام زۆرینەیان نائومێدبوون لەوەی چاوەڕێیان دەکرد، (عودەی) هیچی بۆ کەس نەدەکرد، کێشە و پێداویستی کەمترینی ئەو کچانەی چارەسەر کردوە کە بەشداری ئاهەنگەکانی شەوانەیان دەکرد، یان لە سەر جێگەی سێکسەکەیان لەگەڵ (عودەی) دا، ڕووبەڕووی ئازاردان دەبوونەوە بە لێدانی چەقۆ یان کوژاندنەوەی جگەرە لە سەر ئەندامانی جەستەیان، یاخود بە کار هێنانی جۆرەکانی تری پێشێلکاری و توندوتیژی.

(عودەی) ڕێزی لە هیچ یەکێک لەو کەسانە نەدەگرت کە لەگە ڵیدابوون یان پێوەندی لەگەڵیدا هەبوو، ئەگەر پاداشتی کەسێکی بکردایە، ئەوا پاکەتێک تایت یان شتێکی لەو جۆرەی بە دیاری پێشکەش دەکرد، کە نرخەکەی لە پێنج بۆ دە دۆلار تێ نەدەپەڕی، لە کاتێکدا (عودەی) پاسەوانی لە ملیارەها دۆلاری خۆی دەکرد.

هەموو شەوێک (عودەی) پێویستی بە ژنێک هەبوو، شەش کەس لە فەرمانبەرەکانی بەردەست خۆی، تەنها کاریان دابینکردن و هێنان و بردنی ئەو ژن و کچانەبوو کە (عودەی) دەیویست یان داوای دەکردن، سیان لەو شەش کەسە ئەندامی لیژنەی ئۆلۆمپی عیراقی بوون کە خودی (عودەی) سەرۆکایەتی دەکرد، ئەو کەسانە زۆر بەجدییەوە ئەو کارەیان دەکرد و پسپۆڕییان وەرگتبوو لە ڕێکخستنی ئاهەنگی شەوانەدا، وەک ئاهەنگی نێو باخچەکانی زانکۆ و پەیمانگا باڵاکانی بەغدا.د

لەبەر ئەوەشی (عودەی) هەموو شەوێک ژن و کچێکی نوێی دەویست، ژمارەیەک ژنی تریش بۆ دابینکردنی خواست و حەزەکانی (عودەی) کاریان دەکرد، ئەو ژنانە لە ئاهەنگە تایبەتەکانی کە لە لایەن لیژنەی ئۆلۆمپییەوە لە ناوچە جیا جیاکانی بەغداد ڕێک دەخرا، دەگەڕان بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی ئەو کچ و

ژنانەی (عودەی) حەزی پێیان هەبوو، زۆریش گرینگی و بایەخی بەوانە نەدەدا کە سێکسی لەگەڵ دەکردن، لەو بارەیەوە (زافر محەمەد جابر)ی سکرتێری تایبەتی (عودەی) باسی لەوەکردوە «لە یەکێک لە ئاهەنگەکانی شەوانەدا، کچێک بە گریانەوە هات بۆلام و پێی گوتم، هەستمکرد عودەی بایەخم پێ دەدا، بەڵام لە کۆتاییدا دایکمی برد «.

زۆرینەی کات ئەو ئاهەنگی شەوانانە لە یانەی (یەخود) ڕێک دەخران، کە کەوتبوە ناوچەیەکی سروشتی و سیحریانەی سەر ڕووباری دیجلە، بە پاسی تایبەت دەچوە ئاهەنگەکان، کە پڕبوون لە سەماو کەشێکی سەرنج ڕاکێش و خواردنی شاهانە، زۆرینەی ئەو کچانەی ئامادەی ئەو ئاهەنگانەی شەوانە دەبوون، لەگەڵ خۆیاندا (خووشک، پوور، دایک)یان دەبرد، هەموو شتێک زۆر بە ڕێک و پێکی بەڕێوەچوو، تا ئەو کاتەی (عودەی) لە سەر شاشەی تەلەڤزیۆنی هۆڵەکە دەردەکەوت، بۆ دەستنیشانکردنی ئەو کەسەی لەگەڵیدا بەشداری بە سەربردنی ئەو کەشە خۆشە دەکات، کاتێکیش ئەو کەسەی دەستنیشان دەکرد، ئیتر لێ دەگەڕا بۆ ئەوەی هەندێک لە فەرمانبەرە ژنەکانی بەردەستی، لەگەڵ ژن و کچە هەڵبژێردراوەکەدا قسە بکەن و ڕازی بکەن لە سەر جۆری بەشداریکردن لە کەیف و سەفاو خۆشی و ڕابواردنەکەی (عودەی)دا، هەندێکیان دەیانزانی چی لە پشت ئەو هەڵبژاردن و هاوبەشیکردنەوە هەیە، بەڵام هەندێکی تریان بێ ئەوەی بزانن چی هەیە، ڕازی دەبوون بە داواکاری و هەڵبژاردەکەی (عودەی)، ئاهەنگەکان بە شێوەیەکی زۆر ڕێکوپێک و پڕ لە ڕێز بەڕێوەدەچوو، وەک ئاماژەیەک بۆ ئەوەی هیچ مەترسییەک لە ئارادا نییە، کە لە ئاهەنگەکانی پێشوودا باسیان دەکرا.

ئەم جۆرە لە بیانووهێنانەوە بۆ کچەکان، کاتێکی زۆری نەدەخایاند، دواتر لە بەغداد هەواڵێک بڵاودەبۆوە، کە عودەی ژمارەیەک لەو فەرمانبەرە ژنانەی دەرکردوە، کە کچانی بۆ ڕازی دەکەن و بۆی ئامادەدەکەن.

یەکێک لەو فەرمانبەرانە چوە نەخۆشخانە و باسی لەوەکرد بە هۆی گرگرتنی غازەوە لە ماڵەکەیدا، توشی سووتان بوە، بەڵام قووڵی برینی ئەو ئاگرە نزیکەی (10) سانتیمەتر دەبوو کە لە سەر جەستەی هەبوو، هەمان برین بە هەمان قووڵی لە سەر سمتیشی هەبوو کەلێی نوسرابوو (شوورەیی).

(عـودەی) لە بەرانبەر ئـەو خزمەتەی لە لیژنەی ئۆلۆمپی هەیبوو، بەو جۆرە پادشتی یەکێک لە فەرمانبەرە ژنەکانی دایەوە، کە هاوشێوەی مانگا، بەشیشێکی گەرم لە سەر سمتی هێمایەک دیاری بکرێت و بە برین هەڵبکۆڵرێت.

ڕۆژی پێنج شەممە (12)ی دیسەمبەری ساڵی (1996)، وەک هەر ڕۆژێکی تری پێشوو، (عـودەی) لە ناوچەی (رواد) بە دوای کچ و ژندا دەگـەڕا، ئەم کارە بەپێی تێ پەڕینی کات، تا دەهات مەترسیدارتر دەبوو، هەموو کەس دەیانزانی بۆچی دەچێتە شەقامی مەنسور، ئەو کارە هیچ نهێنییەکی تێدا نەمابوو، زۆرینەی کات کە لەو ناوچەیە بە دوای بە دەستهێنانی چێژ و تامی سێکسیدا لە کچاندا دەگەڕا، دوو پاسەوانە تایبەتییەکەی لەگەڵ خۆیدا نەدەبرد، هەر لەبەر ئەوەش هەوڵەکانی تیرۆرکردن و کوشتنی زیادییان کردبوو، دواجار لە مارسی ساڵی (1993) دا، پێش ئەوەی بچێتە نووسینگەکەی خۆی لە لیژنەی ئۆلۆمپی عیراقی، دوو بۆمب لە نێو ئەو سەللەی خۆڵەدا تەقینەوە، کە بە مەبەستی تیرۆرکردنی لە بەردەم ژوورەکەیدا بۆی دانرابوو.

یەکێکی تر لە ڕۆژەکانی مانگی دیسەمبەر، (عودەی) و (عەلی ساهر)ی هاوڕێی، بە ئۆتۆمبیلەکەی کە (پۆرشی کاریرا) بوو، چوونە دەرەوە بۆ پیاسەکردن، کاتێک لە بەردەم فرۆشگەی (رواد) لە شەقامی مەنسور وەستابوون، (عەلی) هاوڕێی لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزی تا ژمارەکەی (عودەی) بداتە یەکێک لەو کچانەی ببوە نێچیریان، بەڵام دوو پیاو لە یەکێک لە شەقامە لاوەکییەکانەوە هاتنە بەردەم ئۆتۆمبیلەکەی (عودەی) و دەستریژێکی زۆری گووللەیان لە عودەی و ئۆتۆمبیلەکەی کرد و فەوزایەکی زۆریان لەو ناوچەیە دروستکرد، دواتر چەند فیشەکێکیان تەقاند بە ئاسماندا، بۆ ئەوەی بەردەمیان چۆڵبێت و بە هەمان ئەو شەقامە لاوەکییەی لێی هاتبوون، گەڕانەوە و سواری ئەو ئۆتۆمبیلەبوون کە پێی هاتبوون تا دووریان بخاتەوە و بیانرفێنێت، نزیکەی سی بۆ چل مەتر ئۆتۆمبیلەکەی (عودەی) ڕۆیشت و دواتر وەستا، (عەلی) بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکە و (عودەی) ڕاکێشایە دەرەوە و بە ئۆتۆمبیلێکی کرێ گەیاندییە نەخۆشخانەی (ئیبن سینا)، لەو کاتەدا (عودەی) بێ هۆش بوو، توشی خوێنبەربوونێکی زۆر بووبوو، جگە لە پارچەیەک پێستی تەنک، هیچ شتێکی تر نەیدەتوانی پارچەکانی قاچی (عودەی) ببەستێتەوە بە یەکەوە.

پزیشکە تایبەتییەکەی سەدام بەم جۆرە ئەو ڕووداوەی گێڕایەوە «ئەو ڕۆژی پێنجشەممەیە کە تێیدا تەقە لە عودەی کرا، من نۆبەی ئێشکگرییم نەبوو لە نەخۆشخانەی ئیبن سینا، لە شوێنی وێنەکێشانەکەم بووم لەماڵەوە و خەریکی وێنەکێشان بووم، پێش سەعات (7)ی ئێوارە تەلەفۆنێکم بۆ هات و داوایان لێ کردم بە زووترین کات بگەمە نەخۆشخانە، دوای نزیکەی سێ چارەک گەیشتمە نەخۆشخانە، ناوچەکە پڕبوو لە پاسەوانی

تایبەت و ئەفسەری پاسەوانی تایبەتی کە لە لایەن (قوسەی) کوڕی سەدامەوە سەرۆکایەتی دەکرا. کاتێکیش چوومە ژووری نەشتەرگەری سێ پزیشک لە هەوڵدابوون ژیانی (عودەی) ڕزگاربکەن، توانیشیان لە ڕێگەی پێدانی ئاو و شلەمەنییەوە، فشاری خوێنەکەی جێگیربکەن، چونکە کاتێک گەیەندرابوە نەخۆشخانە، فشاری خوێنەکەی گەیشتبوە سفر.

ناوسکییان کردەوە، چونکە فیشەکێک نزیکەی (10) سانتیمەتر خوار باڵی، لە لای ڕاستەوە سنگی پێکابوو، شوێنی پێکانەکە نزیک بوو لە دڵییەوە و مەترسی ئەوەی هەبوو بەر سییەکانی بکەوێت، کاتێک لە گەدەیەوە چووبوە دەرەوەی جەستەی، (دکتۆر سینان عەزاوی) پزیشکی نەشتەرگەری ئێسک بوو، کە لە کاتی گەیاندنیدا بۆ نەخۆشخانە، ئێشککگربوو ڕێکاری فریاکەوتنی بۆ ئەنجام دا و چارەسەری پێویستی بۆکرد.

دوای ئەوەی قەفەزەی سنگیمان بۆ کردەوە، برین و چاڵییەکانمان دووربییەوە، سێ بەشی سەرەوەی قاچی ڕاستی بە هۆی فیشەکەوە بریندار بووبوو، بەشێک لە دەماری قاچیمان بڕی و خستمانە ئەو شوێنەی کە دەمارەکە بە هۆی فیشەکەوە قرتابوو، لە کۆتاییدا پێستمان لە قاچی چەپی هەڵگرت و خستمانە ئەو شوێنانەی قاچی چەپی کە بە هۆی برین و فیشەکەکانەوە زیانی قووڵیان بەرکەوتبوو.

هەروەها چەند فیشەکێکیش ڕان و قاچی ڕاستییان پێکابوو، بەڵام بە بێ ئەوەی زیانیان بۆ دەمار و ئێسکەکانی هەبێت، کارەکەمان لە ژووری نەشتەرگەری نزیکەی شەش سەعاتی خایاند، تا توانیمان بە تەواوەتی هەموو چاڵەکانی جەستەی بگرین و خوێنبەربوونەکەی ڕابگرین کە خوێنێکی زۆری لێ ڕۆیشتبوو،

لە ماوەی (24) سەعاتدا نزیکەی (10) لیتر خوێنمان کردۆتە جەستەی (عودەی)یەوە. زۆر کەم بینیوومە کەسێک بەو جۆرە لە مردن نزیک بێتەوە، وەک ئەو ڕووداوەی یەکێک لە ئێوارەکانی مانگی دیسەمبەر بینیم.

کاتێکیش لە نەشتەرگەرییەکە تەواو بووین و لە ژووری بەردەم هۆڵی نەشتەرگەرییەکەدا دەستمان دەشۆرد، (سەدام حسێن) لەگەڵ (عەبد حەمود)ی سکرتێرە تایبەتییەکەی و ژمارەیەک لە پاسەوانە تایبەتییەکانیدا بەرەوڕوومان دەهاتن، تێبینی ئەوەمان کرد کە (سەدام) هیچ شڵەژان و بێتاقەتی و توڕەییەکی پێوە دیار نییە، بەڵکوو زۆر هێمن و لە سەرخۆ بوو، دوای ئەوەی سڵاوی لێ کردین پێی گوتین «جارێکی تر بە هۆی کێشەکانمانەوە بێزارمان کردن»، دوای ماوەیەک لە بێ دەنگی، بە دەنگێکی نزم پێی گوتین «بەڵام ئەوەی گرینگە ئاسایشی عیراق و عیراقییەکانە».

دواتر پرسیاری ژیان و تەندروستی (عودەی) کردو لە وەڵامدا پێمان گوت، بەراورد بەوەی کە ڕوویداوە، باری تەندروستی جێگیرە و زۆر باشە، پاشان (سەدام) ڕوویکردە ژووری نەشتەرگەری، بەڵام ئاماژەیەکم بۆ (عەبد حەمود) کرد، کە ئەوە کارێکی باش نییە و دیمەنەکە قورسە و ڕەنگە بەرگەی نەگرێت، بەڵام (عەبد)یش، نەیتوانی ڕێگەی لێ بگرێت.

بەڵام هێشتا (عودەی) لە ژێر کاریگەری دەرزییە بێ هۆشکارییەکەدا بوو لە سەر مێزی ژووری نەشتەرگەرییەکەش خەوی لێ کەوتبوو، ڕووتوقوت بوو، هیچ شتێکی پێوەنەبوو جگە لە چەند لەفافێک کە بە شوێنی برین و فیشەک و نەشتەرگەرییەکانی سنگ و قاچ و سکییەوە بوو، لە سەر زەوییەکەش خوێنێکی زۆر ڕژابوو، (سەدام) لێی نزیک بوەوە و سەیری کرد و پێی گوت

«کوڕەکەم، دەبێت پیاو چاوەڕێی ئەوە بکات کە ڕووبەڕووی شتی لەم جۆرە دەبێتەوە».

دوای ئەوە دەستی عودەی خستە ناو دەستەکانی خۆیەوە و گوتی «بەلام ئێمە لە سەر هەقین و ئەوانەی تر ڕاست نین»، ناوچەوانی ماچ کرد هەروەها (قوسەی)یش (عودەی) ماچ کرد و دوای ئەوەش دەستەکانی باوکی ماچ کرد و توند باوەشی پێدا کرد.

سەدام لە (قوسەی) پرسی «براکەت بۆ وای لێهاتوە؟»، چونکە (قوسەی) سەرۆکی هێزی پاسەوانی تایبەت بوو، هەروەها لێپرسراوی ڕاستەوخۆی پاراستن و ئاسایشی خێزانەکەشیان بوو.

(قوسەی) لە وەلامدا بە باوکی گوت «عودەی بە ڕۆژوو بوو، دوای خۆرئاوابوون لەگەڵ (عەلی ساهیر)ی هاوڕێیدا چوون بۆ شەقامی مەنسور بۆ ئەوەی هەندێک سەندویچ بکڕن، بەلام کاتێک هاوڕێکەی لە ئۆتۆمبیلەکە دابەزیوە، تاوانباران هێرشیانکردۆتە سەر»، ڕۆژانی (دووشەمە و پێنج شەممە)ی هەموو هەفتەیەک (عودەی) بە ڕۆژوو دەبوو، ئەو پێنجشەممەیەشی تەقەی لێ کرا بە هەمان شێوە بە ڕۆژوو بوو.

بەلام، سەدام حسێن بە چاوی گومانەوە سەیری (قوسەی) کرد و داوای کرد قسە لەگەڵ (عەلی ساهیر)دا بکرێت، هەرواشیان کردو هێنایان و لە بەردەم دیوارێکدا ڕایانگرت و (سەدام) بە چاوێکی پڕ لە پرسیارەوە پێی گوت «دەزانم ئێوە بە دوای کچ دا دەگەڕان»، هەروەها سوپاسیشی نەکرد کە بە پەلە (عودەی) گەیاندۆتە نەخۆشخانە، (عەلی ساهیر) لە ترسدا خەریک بوو گیانی دەردەچوو، لە شوێنی خۆیدا وەستابوو هیچ قسەیەکی نەدەکرد و سەیرمان کرد میزی کردوە بە پانتۆڵەکەیدا.

## سەرجەم بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا بۆ فیکر و لێکۆڵینەوە (2025_2004)

| | | |
|---|---|---|
| 1. پرۆژەی کتێب (2024_2013) | | |
| ژمارە | ناوی کتێب | زنجیرە |
| سالی (2013) | | |
| 1 | مەکری ئیسلامییەکانی کوردستان | 1 |
| 2 | کتێبی سور (ماوتسی تونگ)- چاپی یەکەم، دوەم، سێیەم و چوارەم | 27 |
| سالی (2014) | | |
| 3 | سەیران بۆ سەرێکانی، بیرۆکە بۆ پشتیوانی کوردی ڕۆژئاڤا | 28 |
| 4 | گەندەڵی، مەترسییەک بەردەم هەرەشە لە جیهان دەکات | 29 |
| سالی (2015) | | |
| 5 | یوتۆپیا، پاش پێنج سەدە | 30 |
| 6 | لەقەندیلەوە بۆ کوبانێ- چاپی یەکەم و دوەم | 31 |
| 7 | پریسترۆیکای بەهاری عەرەبی | 32 |
| 8 | گەشتە بێ ئاکامەکانی سەرکردەیەک، نهێنییەکانی دەستگیرکردنی ئۆجەلان- چاپی یەکەم، دوەم، سێیەم و چوارەم | 33 |
| 9 | داعش و داعشناسی | 34 |
| 10 | گروپی قەیرانی چارەسەری پرۆسەی ئاشتی نێوان تورکیا و پەکەکە | 35 |
| 11 | گۆڕینی ڕژێم و شۆڕشەکان، ئەو ڕووداوانەی سیستمی سەدەیەکیان سڕییەوە | 36 |
| 12 | بۆچی مارکس لەسەر حەق بوو- چاپی یەکەم و دوەم | 57 |
| 13 | خەوتن لەگەڵ شەیتان | 58 |
| 14 | مارکس کێ بوو؟- چاپی یەکەم و دوەم | 79 |
| 15 | حركة الحداثة في الشعر الكردي | 80 |
| 16 | فیتنە، مشتومڕی ئایین و سیاسەت لە سەرەتای ئیسلام | 81 |
| سالی (2016) | | |
| 17 | داعش و میلیشیاکان | 82 |
| 18 | ئومێدی خۆرهەتاوی من، نامەکانی ئەحمەدی شاملو بۆ سامانی کوری | 113 |
| 19 | ئازادی و خیانەت لە ئازادی، شەش دوژمنی ئازادی مرۆڤ | 114 |
| 20 | فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی ڕەوتە ئیسلامییەکان | 115 |
| 21 | کورد و ئیسلام لە یەکتربڕدا، ئیسلامیزم، کۆمەڵگەی مزگەوت، داعشناسی | 116 |
| 22 | کارل مارکس و لیۆن ترۆتسکی، تیۆری و پراکتیک | 117 |
| 23 | مارکسیزم لە هەزارەی سێیەمدا | 118 |
| 24 | کورد و مێژووی جەژنی نەورۆز | 124 |
| 25 | ئەو شتانەی لینیان بێدەنگ بووم | 125 |
| 26 | بەرهەمهێنانی تیرۆر، چۆن ئیسلامی میانڕەو دەبێتە کارگەی بەرهەمهێنانی تیرۆر | 126 |
| 27 | ئومێد بە زیندووی بهێڵەرەوە، تەنها ژنێک ژیانی 90.000 کەسی کوری | 127 |
| 28 | باوەڕدارە تیرۆریستەکە | 128 |
| 29 | پێغەمبەرو پرۆلیتاریا، فەندەمێنتاڵیزمی ئیسلامی چین، شۆڕش | 129 |
| 30 | مارکسیزم چۆن کاردەکات؟- چاپی یەکەم و دوەم | 130 |
| 31 | ئامانجی فەلسەفە | 131 |
| 32 | پرسی ژن، لە چەند دەقێکی وەرگێردراودا | 132 |
| 33 | چەپی نوێ | 133 |

